


میران ئەبراهام

# خانەقای میرزا


- بابەت: ڕۆمان
- نۆبەی چاپ: ٢٠٢٣
- تابلۆی بەرگ: ئاری میرزا
- دیزاینی بەرگ و ناوەوە: ناوەندی کەپر
- پێداچوونەوە: داستان شەریف

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان/ هەرێمی کوردستان ژمارەی سپاردن، ( )ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە.

ISBN: 9 789189 708851
Sweden 2023

من لە وانەی دڵداریدا
لە دوا ڕیزی قوتابییەکانی پۆلا بووم
چونکە تەنیا لەگەڵ ژانی
ئاوارەیی خۆشەویستەکەی خۆما بووم

جەلالی میرزا کەریم

بەڵام... ئەو هەمووماني بۆ ژیاندۆستی پەروەردە کرد، لە ڕۆژانێکدا مەرگدۆستی باڵی ڕەشی بەسەر ڕۆحی هەموو خەڵکی ئەو شارەدا کێشابوو. بە جۆرێک ترس لە مردن توانای هەستی لاواز کردبووین. وەکوو گیاندارێکی زەلیل و دڵشکاو، بێ ڕۆح، ژێردەستە و کۆیلە ژیانمان بەڕێ دەکرد. فێری کردین کە خۆبەدەستەوەدان هەڵبژاردەی خۆمانە، بەڵام هیوا و ئامانج نییە.

بەو جۆرەش ئەوێ، بەردەوام غەریبەکان ڕوویان تێ دەکرد، لە فولکەی تۆبەچی ڕیزیان دەبەست، ژێر دارەکەی پیرمەسوور جێگەی حەوانەوەیان بوو. لە نیوەی شەودا لە دەرگەیان دەدا و دەیانگوت: ڕێگەی دوورمان بڕیوە و بۆ ئەم ماڵی خۆزگەیە هاتووین. وەکوو تەنیا ماڵ بێت لەو دەشتی زاموایەدا.

ئێستا لەوێ، نەخشەی دڵی هەموو کەسێک، هەزار و یەک شارە خۆزگەی تێدایە. دڵ هەیە؛ زوو لەشکری خۆزگەکان، دەرگە قەبە و ئەستوورەکانی هاتنەدی دەشکێنێت و دەیکاتە پایتەخت. دڵیش هەیە؛ هەتا ئەو کاتەی لە لێدان دەکەوێت، هەر گوێقوڵاخی ترپەی پێی مژدەیە.

جادووی لە هەموومان کرد، ئێمە تێیدا هاتینە بوون و گەورە بووین، لەگەڵ ئەوانەدا کە بۆ تەنیا ساتێک و بە غەریبی ڕێگەیان کەوتە ئەوێ، هەمووماین بەر تەلیسمی ئەو جادووە کەوتین.

خۆی پڕ لە نهێنی بوو، نهێنییەکانیشی بۆ هەمووماین دەپاراست. بە بیرم دێت میرزا کەریم گوتی: 'لە کاتی دروستکردنیدا بەیانیان زوو

پێش وەستا و کرێکار خۆم لەوێ بووم، هەموو جارێک و تاوەکوو تەواوبوونی، دەمبینی دوو بارتەقای باڵای من خشت و بەرد کەڵەکە کراون، نەمئەزانی کێ هێناونی و لە کوێوە هێنراون.'

حەلاوەخان باسی لە نهێنیی ژووری زەخیرەکە دەکرد: 'چەند لێی دەرئەهێنم، بەتاڵ نابێت!' ئەو بەخشندە بوو، هەر کەسێک بە ڕێبوارییش هاتبایە ئەو ماڵە، تاوەکوو نانی نەخواردبایە نەیدەهێشت بڕوات، بێجگە لەوە ڕۆژانە نانی بە سەر هەژارانی گەڕەکیشدا دەبەخشییەوە.

پێ دەچێت لەبەر ئەو هۆکارانە بووبێت، کە هەموو ڕێگەکانی شار دەچوونەوە سەر ئەو ماڵە.

لە نیوەشەویکی ڕۆژی هەینیی مانگی یەکەمی زستانی ساڵی ١٩٣٥دا، لە ئێوارەی ئەو ڕۆژەوە هەورێکی ڕەش بە ئاسمانی شارەوە نووسابوو. باران بە خوڕ دەباری و لە خوارووی شار و دامێنی شاخەکانەوە زووزوو دەنگی هەورەتریشقە دەهات. لە شەقام و کۆڵانەکاندا باراناو تاوەکوو قولەپێ دەهات، لە شەقامەکان خەڵکی بە عەرەبانەی دەستی دەپەڕینەوە. فەقێکانی مزگەوتی خانەقای مەولانا خالید دەیانگوت؛ گوایە منارەی مزگەوتی گەورە هەورەتریشقە لێی داوە و وێرانی کردووە.

شڵپوهوڕ بە کەناری شیوەکەدا ڕای دەکرد، زووزوو قاچی هەڵدەخزا و خۆی بە دیواری حەوشەیماڵەکان دەگرتەوە. بە سەر پردی شیوی گەڕەکی جوولەکاندا بۆ بەردەم ماڵی شەلەمۆی عەتار پەڕییەوە. لافاوی شیوەکە گەیشتبووە ژێر دارەڕای پردەکە، بەڵام هێشتا لە بۆگەنی ئاوەڕۆکەی کەم نەکردبووەوە. کاتێک بە ڕاکردن گەیشتە بەردەم دەرگەی ماڵەکە، هێشتا پێڵاوەکانی بە سەر پێوە بوون. لە تەمەنی لاوێتییەوە کەس بە شەو نەیدەتوانی هاوپێی ئەو ڕێ بکات، هەر بە ڕێوە پاڵتاوەکەی لە بەر کردبوو. کاتێک گەیشتە بەردەم ماڵی عەزیزی حەکیم، پاژنەی پێڵاوەکانی هەڵکێشان. سەعات لە دوازدە لای دابوو، دەستی توند نووقاند و بە مشتەکۆڵە کێشای بە دەرگە تەختەکەدا: 'عەزیز، عەزیز، کوڕە برای چاک بە، فریامان کەون!'

پێ دەچوو لـەبـەر ئەســـتووریی دەرگە تەختەکە، دەنگی لە دەرگەدانەکەی نەگەیشـــتبێتە دالآنەکەی ماڵی عەزیزی حەکیم، بەڵام بانگکردنەکەی؛ نەک ماڵی عەزیزی حەکیم، بەڵکوو گەیشـــتبووە گوێی هەموو دانیشتووانی گەڕەکی جوولەکان.

عەزیز دەرگەی لێ کردەوە، خۆی بە پێوە بۆ ڕانەدەگیرا و لەتری دەدا، چونکە تاوەکوو ئەو کاتەی میرزا کەریم لە دەرگەی دابوو، ئەو خەریکی ئارەقخواردنەوە و نێرگەلەکێشان بوو. دەستی بەرەو ڕووی بەرز کردەوە و گوتی: 'چییە میرزا، چییە، بۆ بەم نیوەشـــەوە سەرودڵت گرتووین؟'

'کوڕە فریامان کەون، ئەوە حەلاو ژان دەیگرێ و وا خەریکە ڕۆحی دەرئەچێت!'

'نا، نا، میرزا گیان؛ حەلاو ڕۆحی وا بە ئاســـانی دەرناچێت، ئێمەی پیاو هیچی لێ نازانین، ژنـان ئەوە ئیشـــی خۆیانە، ئێ ئەوە حەلاو بەرەژان گرتوویەتی، ئیتر، نازانم میرزا، بە ڕاســـت تۆ بۆچی خۆت تەنگەتاو کردووە؟'

عەزیزی حەکیم زۆر لەســـەرخۆ ئەمەی گوت، میرزا کەریم پاڵێکی پێوە نا و خســـتی بە پشـــتدا و بەســـەریدا بۆ ژوورەوە هەنگاوی نا. کاتێک ئەو لە قاتی ســـەرەوەی دەڕوانی، لە قاتی خوارەوە ســـەلمای ژنی عەزیزی حەکیم بـانگی کرد. خێرا چووە بەردەمی و گوتی:

'حەلاوی ژنم حاڵی زۆر خراپە، فریامان نەکەویت، ڕۆح دەرنابات.'

'پێشـــم کەوە، دەی پێشـــم کەوە، با مەحتەل نەبین، گوێم لێت بوو چیت بە عەزیز گوت!'

کاتێک گەیشـــتنە ناو دەرگەی حەوشـــەکە، هێشـــتا عەزیزی حەکیم ڕاست نەبووبووەوە، میرزا کەریم و سەلما هەنگاویان بە سەردا نا و

لە دەرگەکە چوونە دەرەوە. لە دوایانەوە بانگی کردن: 'ئەریّ ژنەکە، بەم نیوەشەوە لەگەڵ میرزا بۆ کویّ ئەچیت؟ نابیّت پرس بە میّردەکەت بکەیت؟'

کاتیّک عەزیزی حەکیم ئەمەی گوت، میرزا کەریم لە تاریکییەکەدا دەستی سەلمای مامانی گرتبوو، لە پردەکە پەڕیبوونەوە و بە بن دیوارەکاندا و لە کەناری شیوەکەوە بیّدەنگ بەرەو گەڕەکی سەرشەقام هەڵگەڕان.

ماڵی میرزا کەریم هەمووی سەد مەتریّک لە ماڵی عەزیزی حەکیمەوە دوور بوو. سەلما بە شەو زۆر خراپ دەیبینی، بەڵام میرزا کەریم کار و کاسپی و هەتا وڵاخداریشی بە شەو کردبوو. کاتیّک گەیشتنە ناو داڵانەکەیان، هیّشتا دەستی سەلمای بەر نەدابوو.

ئافتاو و فاتمەی خوشکی حەلاوەخانی ژنی هاتنە بەردەمی و لیّیان ڕوانین، میرزا کەریم و سەلمای مامان هەموو گیانیان تەڕ، لە شانی یەکەوە و دەست لەناو دەست ڕاوەستابوون. پاشان ئافتاو وەکوو منداڵ سەلمای لە دەست وەرگرت و بۆ ژوورەکەی حەلاوەخان دایە پیّش خۆی. فاتمە هاتە بەردەمی و قادری کوڕیی خستە باوەشی و پیّی گوت: 'لە ناڵەی ئەو هەورەگرمەیە خەبەری بووەوە!'

قادر تازە تەمەنی ساڵیّکی تیّپەڕاندبوو، کاتیّک ژنەکان لە داڵانەکە ڕۆیشتن؛ میرزا کەریم لە شویّنی خۆی وشک ڕاوەستابوو، گویّی لە دەنگی گریانی کوڕەکەی نەبوو. دیسان گرمەی هەورەتریشقەیەک ماڵەکەی لەراندەوە، وەکوو لە سەربانەکەی ئەوانی دابیّت، کوڕەکانی لە گرمەی هەورەتریشقەکە بەخەبەر هاتن، هەردووکیان بە دوای یەکدا هاتن و لە شانی باوکیانەوە ڕاوەستان، غەفووری کوڕە گەورەی، کە هەشت ساڵان بوو، پرسیی: 'ئەو گرمەیە چی بوو؟'

عەزیزی تەمەن شەش ساڵان، ئەو ساڵە نرابووە بەر خوێندن، گوتی: 'هەورەتریشقە بوو!'

میرزا کەریم هێشتا بێدەنگ لەو دەرگەیەی دەڕوانی کە سەلمای مامان و ژنخوشکەکانی لێیەوە چووبوونە ژوورەوە، پێیان دەگوت، ژوورەکەی حەلاوەخان.

غەفووری کوڕی ویستی زیاتر لەبارەی دەنگی هەورەتریشقەکەوە بدوێ، میرزا کەریم بۆ ئەوەی لێی بڕوانێت، پەنجەیەکی خستە سەر هەردوو لێوی و لە بەر خۆیەوە: 'شششششششششت.'

قادر بە باوەشییەوە نووزەی لە خۆی بڕیبوو، پاشان دەستی دانەنایەوە و سەعاتە بەرباخەڵییەکەی لەناو دەستی و بەرەو ڕووی ڕاگرت، چاوێکی لەسەر میلەکەی بوو. زووزوو لە دەرگەکەی حەلاوەخانی دەڕوانی. غەفوور و عەزیزی کوڕی وەکوو نەزانن چی ڕوو دەدات، بێدەنگ و بە ڕیز لە دوایەوە ڕاوەستابوون، ئەوانیش وەک باوکیان لە دەرگەکەیان دەڕوانی، بەردەوام بە لاچاوێک سەرنجیان لە باوکیان دەدا، لەناو بێدەنگی و تاریکوڕوونیی داڵانەکەدا دەتگوت ئەفسەر و سەربازن و چاوەڕوانن، تاوەکوو فەرمانێک جێبەجێ بکەن. چراکە لە پشتی ئەوانەوە دەگڕا، ڕووناکییەکەی لەسەر دەرگەکەی حەلاوەخان شەپۆلی دەدا، سێبەری هەرچواریان لەسەر دەرگەکە دەلەرزی. میرزا کەریم هێشتا مەچەکی بەرز لە پێش خۆی ڕاگرتبوو. هەموو شتێک لە ناو بێدەنگیی ماڵەکەدا لەگەڵ زەردیی ڕووناکیی چراکەدا لەسەر دیوارەکان سەمایان دەکرد.

چک، چک، چک. گوێیان لە میلی سەعاتەکە بوو. لە خەیاڵی خۆیاندا: 'چک، چک، چک!'یان دووبارە دەکردەوە.

عەزیز گوتی: 'باوکە، چی بوو؟'

وەکوو ئەو وشـــەیەی عەزیز پشـــووی پێ دابن، بە دوای یەکدا هەرسـێکیان هەناسـەی قووڵیان هەڵکێشـا و سـەر و شـان و قاچیان جووڵاند. دیسان میرزا کەریم: 'شششششششششت.'

دووبارە جووڵەیان لە خۆیان بڕییەوە و چاوەڕوان بوون. تەنانەت قادری یەکسـاڵانیش بێدەنگ بوو، وەکوو لە مەبەسـتی باوکی گەیشـتبێت و بزانێت چی ڕوو دەدات. دووبارە میرزا کەریم دەسـتی هەڵبڕییەوە و مەچەک و سەعاتەکەی دەستی بەرەو ڕووی ڕاگرت.

لە نزیکی ماڵەکە چەند جارێک گرمەی هەورەتریشـقە هات، بەڵام ئەفسـەر و سـەربازەکان، لە جێگەی خۆیان نەجووڵان و چاویان لە دەرگەکەی حەلاوەخان نەترووکاند.

کاتێک لەودیو دەرگە تەختەکەی ژووری حەلاوەخانەوە گوێیان لە دەنگی گریانی منداڵێک بوو. میرزا کەریم میلی سـەعاتەکەی ڕاکێشا و کاتی لە یەک و نیوی ئەو شەوەدا وەستاند.

عەزیز پرسیی: 'کوڕمان بوو یان کچ؟'

لەو کـاتەدا دەرگەی ژوورەکەی حەلاوەخـان کرایەوە، ئـافتـاوی ژنخوشـکی میرزا کەریم سـەری هێنایە ناو دەرگەکە و گوتی: 'میرزا کەریم، حەلاو کوڕی بوو!'

دوای ئەمە میرزا کەریم و کوڕەکـانی وەکوو لە کۆڵکێشـی بووبێتنەوە، دەسـتیان کرد بە جووڵە و شـان و ملتەقاندن. پاشـان پێکەوە چووبوونە دەرەوە و لە هەورەتریشقەکانیان دەڕوانی، کە لەو کاتەدا لە خوارووی شـار و لە پێدەشـتەکانی نزیک چەمی تانجەرۆوە دەبریسـکانەوە. ڕەشـەبایەک بە پچڕپچڕی دەنگی زیکر و دەفلێدانی حوجرە و خانەقاکان و زەنگی کەنیسـەی مریەم و لوورەی شـۆڤاری کنێسـەتەکەی گەڕەکی جوولەکانی لەگەڵ خۆی دەهێنا، کە لەگەڵ

وەڕینی سەگی پێدەشتەکانی خوار شاردا، تێکەڵی یەکتر دەبوون و پێکەوە یەک ئاوازیان دەچڕی.

دوای ئەوەی مام مستەفای ناڵبەند و عەبدوڵڵای جگەرەچیی برای میرزا کەریم گەیشتنە لایان، هەواڵی ئەوەیان پێ دان، کە حەلاوەخان کوڕی بووە.

عەلی ئاغا لە دەرگەی حەوشەکەوە بە کۆکەکۆک پەیدا بوو، قۆڵی مەلا تۆفیقە بێچاوی گرتبوو، لە تاریکییەکەوە بە دەم قسەکردنەوە هاتنە ژوورەوە. مەلا تۆفیق لە دوورەوە هاواری کرد: 'میرزا کەریم، بەشی خودا ئەم جارە شەنگە یان هەڵەکۆک؟'

## ٢

'مرۆڤ کە بیری لە داهێنانی ناوی خودا کردەوە، مەبەستی لە خودی خۆی بوو، کاتێک ئەڵێت لە ترســـی خودا واتە لە ترســـی خۆی، بەدەستهێنانی بەشـی خۆی، دەسـتەبەرکردنی ژیانێکی ئەبەدی دوای مردن بۆ خۆی، ئەو هەریسـەیەی لەو ژیانە ئەبەدییەی دوای مردندا بۆ خۆی دایهێناون، لە ترســی مردن ئەوەندە خۆی بە بچووک و بێدەسەڵات ئەزانێت، خودا یان خودێکی پێویستە چاودێریی بکات.'

چەندان جار ئەو قسەیەم لێ بیستبوو، ئیتر نازانم لەگەڵ کێی بوو، بەردەوام لە بەر خۆیەوە دەیبۆڵاند و کوورەکوورِ دەڕۆیشت، پاژنەی پێکانی لە زەوی نەدەنان و بەردەوام لەسەر نووکی پێکانی دەڕۆیشت، دەتگوت ئێسـتا بە دەمدا دەکەوێت، زۆر پیر دیار بوو، بەڵام کەس بە پێ و هەنگاوەکانی ئەو ڕانەدەگەیشت، هەرگیز نەدەکۆکی و هەناسەی توند نەدەبوو، مەگەر زۆر تووڕە و بێزار بووایە. لە ڕۆیشـتندا تەنیا یەک تاوەکوو پێنج هەنگاوێک لە پێش چاوت دەبوو، پاشــان تێی دەتەقاند و لە چاوت ون دەبوو، لە بەر پێکانی نەدەڕوانی و جارێک نەمبینی سەری دابنەوێنێت، چاوەکانی ڕەساسییەکی تۆخی گەورە و گەش؛ خۆی دەیگوت: 'لە گورگم دزیون!'

ئەوەندەی من ئاگام لێی بووبێت سـڵاویشـی لە کەس نەدەکرد، مشـکییەکی ڕەشـی خەتخەت کە بە دەزوولەی سـپی ڕیشـاڵەکانی چنرابوون، بێ کڵاو توند پێچـابووی بە ناوچەوانییەوە، ڕانکوچۆخەیەکی بۆر و پشتێنێکی ڕەشی گوڵگوڵیی سوور، جووتێک

کڵاشـــی کۆنی چەماوەی کردبوو بە ســـەر پێیەوە، گۆرەویی لە پێ نەدەکرد، دیار بوو کڵاشــەکانی بە پێی بچووکبن. لە کاتی ڕۆیشــتندا وەک دوو ســەوڵ باڵەکانی بەم لاو ئەو لایدا ڕادەوەشــاندن، زووزوو دەستە سرێکی لە بەر باخەڵی دەردەهێنا و بە ناوچەوانیدا دەیهێنا، بێ ئەوەی ئاســەواری ئارەق بە ڕوخســارییەوە دیار بێت، وەک شــتێک خووی پێوە گرتبێ. دەتوانم بڵێم کورتەبـاڵایەکی گرگن بوو. کـاتێک ئێمەی منداڵانی تەمەن هەشــت بۆ دە ســاڵان دەورەمان لێ دەدا، ئەو لە نێوانمـانـدا ون دەبوو، هەمووومـان ئەوەمـان دەزانی و دەمـانگوت: 'دەنگی ژنانەیە!'

بەڵام لە نێوان خۆمـانـدا نهێنی بوو، بە تـایبەتی کـاتێک ئەم دوو وشەیەی زۆر نەرمونیان پێ دەگوتین: 'ئۆمنیس ئۆتیمیس.'

بێ ئەوەی بزانین واتـای چییە، بەردەوام لەســـەر زمـانمـان بوو، ڕووی تێ دەکردین و یەکـیەک لە چـاومــانی دەڕوانی و بێـدەنگی دەکردین، چونکە هەموومان ئەوەندە گوێمان لەو قســـەیەی بووبوو لەگەڵیدا دەمـانگوتەوە، پێی دەگوتین: 'گوێم لێ بگرن، دوایی خۆتـان جێگەیەکی لە هزن خۆتان پێ بدەن.'

هەموومـانی بە یەک نـاو بـانگ دەکرد، یـان دەتوانم بڵێم نـاوی لە کەس نەدەنا، تەنیا ئەوەندە نەبێت: 'ڕۆحی زامن، گیانی زامن.'

ئیتر هەرچەندە ناوی خۆمان پێ دەگوت، خێرا لە بیری دەچووەوە. ناوەکانمان... ئەوە تەنیا شت بوو کە مام زامن لە بیری دەچووەوە، هەموو شـــتێکی ڕابردووی ئەو شـــارەی لە بیر بوو، دەیگوت: 'من مێژووی هەزار پشـــتی خۆم و ئێوەش پێ ئەزانم، ئێوە و هەموو ئەو خەڵکە لە بیرتان چووەتەوە، یان گەمژەن و ناتانەوێت هیچی لەبارەوە بزانن.'

ڕۆژێک لە دووکانەکەی بووم، وا بزانم ئەو ئاگای لە من نەبوو، لە بەر خۆیەوە دەدوا، تاو تاو نوقڵێکی دەخستە دەمی و بە ڕقەوە دەیکرۆشت و لە قسەکردن بەردەوام دەبوو، دەیگوت: 'هەزار ساڵە هەست بەو دڵشکانە ئەکەم، نامەوێت یاری بە ڕۆحیان بکەم و دەست لە ڕێڕەوی ژیانیان بدەم، بە تایبەتی ئەوانەی لە سروشتی خۆیان لایان داوە.'

دوای تاوێک بێدەنگی، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بە دەنگێکی ناسک و پڕ لە سۆز و توزێک ژنانە، کە ئەوسا من وا هەستم پێ دەکرد، دەردی خۆی دەیگوت بالۆرە، گەلێک جار لێم بیستبوو، ئاوای دەگوت:

'ئاوا بێت ڕۆژ، کپ ببێت لە مەغریب بۆ کاتی شەو
ئاوەدان بێت بەر ئاگردان، تەوارە کۆواری شەو
دایم وان ئەوان گوێقولاخ، ڕەفتاری مە شاهیدە
کۆ گەلە، نێر و مێ شەوچەرەی میناری شەو'

دوای ئەمە جارێکی تر هەمان کۆپلەی بە نووزەنووز و پچڕپچڕ لە بەر خۆیەوە دەگوتەوە، پاشان بەردەوام دەبوو: 'ئێتر ئەوە یاسا و ڕێسای سروشتە، لە ژێر کاریگەریی هەستەکانیاندا پشتی تێ ئەکەن، ئەخەڵەفێن، گێل و مێشکپووچ ئەبن و تەنیا خەیاڵیان لای هەوەسیانە، بچووک، زۆر بچووک ئەبنەوە، تێ ناگەن، یان هەندێکیان نایانەوێت تێ بگەن، چۆن وەریدەگرن ئاواش وەکوو خۆی ئەیڵێنەوە، ئەهلی نەقڵن و تەنیا ئەوەندەیان لە باردایە، پەشیمانن لە یاساکانی سروشت و لە مردن ئەترسن، لە بەرامبەر ئەو ترسەیاندا بیریان لەو حیلەیە کردووەتەوە؛ کە دوای مردن ژیانێکی نەبڕاوەیە. نازانن، ئەگەر ئاوا

ژیایت دوای مردنت کۆتاییت پێ دێت، بەختت نابێت و ئەکەویتە دەرەوەی سروشت. ئەوانە بە جۆرێک خەڵەفاون، تەنانەت سیحری نوقڵەکانی منیش بەئاگایان ناهێنێتەوە، ئیتر ئەبێت بە تەمای گەڕانەوەی ڕۆحیانەتیان نەبین، چونکە ڕۆحیان ژەهراوی بووە و بە کەڵکی هیچ نایەت، ناکرێت ئەوان جارێکی تر لە سروشتدا جێگەیەک بگرنەوە.'

ئەو ڕۆژە لەگەڵ مالیکی ئامۆزام بۆ ئەوە لای مام زامن بووین، کە من باسی جەمالی دەڵەسەگی بۆ بکەم. کە چۆن لە کانیی ماسی، چەند سەرخۆشێک بە بەرچاومانەوە سواری بووبوون. هەرچەندە نەمدەزانی چۆن ئەوەی بۆ بگێڕمەوە. کە ئەو پیاوە زلانە یەکیەک دەرپێکانیان دەهێنانە خوارەوە و سواری ئەو دەڵەسەگە دەبوون. کە ئێمە هەرچواریانمان دەناسی و ژن و منداڵیشیان هەبوو. دواتر دەستەسرێکی نەوتاوییان بەست بە کلکیەوە و ئاگریان پێوە نا. چاومان لێی بوو بە دەم ڕاکردنەوە ئاگری تێ بەربوو. من و مالیک لە نزیک چەمی تانجەرۆ بە مردوویی دۆزیمانەوە. ویستم ئەوە بۆ مام زامن بگێڕمەوە، بەڵام، وەکوو هەموو جارێک، خۆی هەموو شتێکی دەزانی، دیار بوو ئەوەش هۆکاری بێزارییەکەی بوو.

هەروەها نازانم لە کێوە بیستبووی، کە من و قادر و مالیک لەگەڵ کاکە غەفوورم بۆ کەرکووک چووبووین، ئەوەی لێ پرسیم: 'لە کەرکووک چیت بینی؟'

دوو ڕۆژ پێش ئەوە، کاکە غەفوورم ئێمەی لەگەڵ خۆی بۆ کەرکووک بردبوو، هەفتەیەک لە کەرکووک لە ماڵی شێخ مارف بەرزنجی ماینەوە، بە ڕۆژدا لە بەیانیی زووەوە تا ئێوارە لە گۆڕەپانی

گاورباخی دەبووین، کاکە غەفوورم و هاوڕێکانی بۆ پشـــتگیری لە مـــانگرتنی کرێکـــارانی نەوت لە کەرکووک چووبوون. لە زۆربەی شـــارەکانی عێراقەوە بۆ ئەو مەبەســـتە خەڵک بۆ کەرکووک هاتبوون. ســـــەکۆیەک لە گۆڕەپانی گاورباخی دروســـــت کرابوو، بەردەوام بە زمانەکانی: عەرەبی، کوردی، سریانی، ئاشـــووری و تورکمانی، گوتار و شـــیعر دەخوێنرانەوە. شـــێخ مارف و کاکە غەفوورم گوتاریان بە کوردی خوێندەوە. دوو ڕۆژ پێش گەڕانەوەمان نووســـینێکیان دایە دەستم و پێیان گوتم: 'چەند جارێک بیخوێنەرەوە و دوای ســـەعاتێک سەرەی تۆیە.'

داوام لە قادری برام کرد، کە ئەو بیخوێنێتەوە، هەر زوو خۆیی لێ ون کردم. مـــالیـــک لێی وەرگرتم و خوێنـــدییەوە، دواتر بە زۆر لێم سەندەوە، ئاماژەی بەوە کرد؛ کە بۆ دەترسم، خوێندنەوەی ئاسانە.

پێش ئەوەی ســـەرەی من بێت و بچمە ســـەر ســـەکۆکە، کە هەزاران کەس لێیان دەڕوانیت، پۆلیس و ســـەرباز هێرشـــیان کردە ســـەرمان و بڵاوەیان بە خەڵکەکە کرد.

ڕۆژی دواتر، بە هەمان شێوەی ڕۆژانی پێشوو خەڵک لە گۆڕەپانەکە کۆبوونەوە، لە یەکی مانگی تەمووزی ســـاڵی ١٩٤٦ەوە دەســـتی پێ کردبوو. غەفووری برام بەرەو ڕووی حەنا ئەلیاســـی کردمەوە، کە یەکێک بوو لە بەڕێوەبەرانی مانگرتنەکە. حەنا پێی گوتم: 'تا دەتوانیت هاوار بکە، با هەموو خەڵکەکە گوێی لە دەنگت بێت.'

لەســـــەر ســـــەکۆکە بووم و پڕ بە قوڕگم هاوارم دەکرد، بە لاچاو مالیکم لە شانمەوە بینی. دەستێکی بەرەو ڕووی خەڵکەکە هەڵبڕیبوو، نووزەنووزی بوو. نووســـــینەکەی دابوویان بە من بیخوێنمەوە، ئاوا

دەستی پێ دەکرد: 'هەی ئیستیعمار، ئێوە لە ساڵی ١٩٢٧ەوە نەوت لەم شاری کەرکووکە بە ڕەنجی کرێکار دەردەهێنن، لەو ڕۆژەوە کرێکار دەمرێت...' بەو جۆرە و ناوی ئەو سێ کرێکارەیش هاتبوو کە ساڵی ١٩٢٧ لە دەرهێنانی نەوتدا مردبوون.

ئەو ڕۆژەی ئێمە گەڕاینەوە، ڕێکەوتی دوازدەی مانگ بوو، پۆلیس و سەرباز هێرشیان کردبووە سەر گۆڕەپانی گاورباخی و شازدە کەس کوژرابوون و زیاتر لە هەشتا کەس بریندار بووبوون.

فەهد، دامەزرێنەری حیزبی شیوعی، ئەو ڕۆژانە لە ماڵی مارف بەرزنجی بوو، کە بۆ منێکی تەمەن یازدە ساڵ گرنگییەکی ئەوتۆی نەبوو. چەند جارێک ویستی قسە لەگەڵ من و قادردا بکات، بەڵام ئێمە زمانی عەرەبیمان نەدەزانی و لە هیچی نەدەگەیشتین.

یونس ڕەئووف و زەینەبی خوشکی لەوێ بوون، یونس ڕەئووف، باشترە بڵێم دڵداری شاعیر، کە لە ڕابردوودا چەند جارێک هاتبووە ماڵمان. من و قادر و مالیک لە ژووری ژنەکان نووستین، زەینەب تاوەکوو درەنگانی شەو بەدیارمەوە دانیشت، ئەو نووسینەی حەنا ئەلیاس پێی دابووم، زیاتر لە دە جار پێی خوێندمەوە.

بە وردی ڕووداوەکانی گۆڕەپانی گاورباخیم بۆ مام زامن دەگێڕایەوە، ئەو لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئیتر ئەوە سەرەتای نەهامەتییەکانە!'

من بێدەنگ بووبووم، بەڵام ئەو هێشتا قسەکانم و تەنانەت ئەو نووسینەی لە گۆڕەپانی گاورباخی بۆ خەڵکەکەم خوێندەوە، لەگەڵ ناوی ئەوانەی من ناوم هێنابوون، لە بەر خۆیەوە دەگوتنەوە.

ئێمەی منداڵ ئەوسا وامان دەزانی وڕێنە دەکات. زۆر لە قسەکانی حاڵی نەدەبووین، وەکوو لێدوان و شـــەڕی ئەو لەگەڵ فەقێ ئەحمەد، کەس نەیدەزانی ئەو دووانە باســـی چی دەکەن، من فەقێ ئەحمەدم زۆر خۆش دەویســـــت، گەلێک جار دەهات و لە ماڵی ئێمە نانی دەخوارد، پەیوەندیی لەگەڵ مام مســـتەفام و ماڵیکدا زۆر خۆش بوو، گەلێک جار تاوەکوو نیوەشـــەو لەگەڵ مام مســـتەفام شـــیعریان بۆ یەکتری دەخوێندەوە، منیش بێدەنگ بەدیاریانەوە دادەنیشـــتم. کە خۆیان تەنیا دەبوون، عارەق یان شـــەرابیان دەخواردەوە، ئەوە تەنیا من دەمزانی.

مـام زامن فەقێ ئەحمەدی بەوە تووڕە دەکرد، کـە پێی دەگوت: 'ئەحە هەرچەنـدە تۆ پیـاوێکی زیرەکیت، بەڵام تۆ و بزنێکی گەڕ لە وجووددا بوونتان وەکوو یەکە، چونکە دینەکەت ڕێگەی خۆناســـی و خوداناسیشی لێ گرتوویت!'

فەقێ ئەحمەدیش لە وەڵامـدا دەیگوت: 'مەحوی، هـاوبیرەکەی تۆ، یەک دێڕ شـیعری بە کەڵکی هەیە ئەویش ئەڵێت، بە ناوی داربەڕووی ناوم و من خورما ئەگرم.'

مام زامن و فەقێ ئەحمەد کاتێک ئەم قسانەیان بە یەکتری دەگوت، کە چواردەوریـان قەرەبـاڵغ بـایە، بەڵام کە خۆیـان تەنیـا دەبوون، سەریان لێک نزیک دەکردەوە و چەندان سەعات دەدوان، بە جۆرێک ئاگایان لە چواردەوریان نەدەما، وەکوو لە خەڵوەتدا بن. ئەو ساتانەی فەقێ ئەحمەد لە قســـەکانی مام زامن تووڕە دەبوو، لە دڵگەورەییی خۆیەوە، دوای چەند هەناســـەیەک بە ســـۆزەوە لە بەردەم مام زامندا وەکوو مامۆســـتا و قوتابی دەنووشـــتایەوە، لە پاشـــەملە مام زامن دەیگوت: 'ئەوەی فەقێ ئەحمەد ئەیکات لە دڵگەورەییی نییە، بەڵکوو لە

بێدەماخییەتی، چونکە توانای خەیاڵی هەر ئەوەندە بڕ ئەکات، تەنیا ئەو ڕۆژە و بەس، ئیتر کە شەو بە سەریدا ئەنوێت، خەون و خەیاڵی لای هەریســـــەکەی ئەو دونیایەتی و لە بیری ئەچێتەوە دوێنێ چی خواردووە.'

پەیوەندی ئەم دووانە بەو جۆرە بوو، کە مام زامن لە کۆتایی هەموو لێدوانەکانیاندا، دیســـــان ئەوەی دووبارە دەکردەوە و فەقێ ئەحمەدی تووڕە دەکرد و پاشـــــان لە چاوترووکانێکدا خۆی لێ ون دەکرد، ئەوە لە نێوانیاندا وەکوو خوداحافیزیی لێ هاتبوو... بەو جۆرە یەکتربیان جێ دەهێشت.

بەیانیان زۆربەی شــێتەکانی شـــارم دەبینی، یەک‌یەک لە دەرگەی دووکانەکەی ئەوەوە دەهاتنە دەر، ئیتر نازانم لەوێ دەنووســـتن یان ئەوانیش بۆ نوقڵخواردن دەچوون، لێم دەبیســـــت و دەیگوت: 'ئەم مرۆڤانە، لە گرنگترین و جوانترین بەشـــی خوداوەند بێبەش کراون، ئەویش عەقڵە، کە واتە بە هەموو تەمەنیان وەکوو منداڵێک ئەژین و ئەبێت هەموو شتێکیان لێ قبووڵ بکەین! هیچیان لەسەر نییە و نابێت خەتایان لێ بگرین.'

دوانیوەڕۆیەکی ڕۆژی هەینی لە نێو دووکانەکەیدا دەورمان لێ دابوو، مام زامن گوتی؛ 'منداڵینە، ئەگەر من لەم شـــارە بڕۆم، تەنیا ئێوە بێ نوقڵی ترش و شیرین نابن، ئەم شارە وەکوو پەڵەکەنم سن و کوللە بە سەریدا دائەبارێت، ئیتر لە ماوەی ژیانی نەوەیەکدا ئێسقانەکانیشی ئەبن بە تەپوتۆز، کەسێکی تێدا نییە کلیلی ئەم دووکانەی پێ بسپێرم، ئەوە زیاتر لە دووسەد ساڵە چاوەڕوانم کەسێک لەم شارە لەدایک ببێت، ئەوە بێت، کە من ئەمەوێت، ئەو کەســـە بتوانێت پێی بنێتە نێو

پێڵاوەکانی منەوە، یان کڵاوەکەی من پڕ بە سـەری بێت. ئاگای لەم شـارە بێت، ئەم شـارە بێکەسـە و ڕۆحیانەتی مردووەکانی بۆ جێگەیەکی نادیار ڕۆیشتوون.'

ڕەحیمە شـێت، کە بە خۆیی دەگوت ڕەحیم موکریانی لێی ڕوانی و پێی گوت: 'کڵاوی ئەتۆ؟ ئەمن قەتم نەدیوە کڵاوت لە سەر بێ!'

'دەی تۆش قەرزدارم بیت، ئەگەر جێی باوەڕت نەبم!'

'ئێ باشە، گۆیا ئەتۆ کڵاوت هەیە؟ لە کوێیە؟'

'ئەوەی پێتی ئەڵێم و لێم ئەبیسـتیت، ئەوها ڕەش و سـپیی لێمی وەرمەگرە!'

'دەسا خۆت وات گوت.'

'بەڵێ من ئاوام گوت، ئینجا خۆ من زۆر شـتم وەک خۆی گوتووە، نازانم چۆن گەیشتووە!'

'ئاوا، کە ئەتۆ دەیلێی و لە زمان خۆتەوە دەیانبیستین!'

'دەی ماڵوێران خۆم.'

'کامە ماڵ؟ ماڵت کوا، نەکا بەم کولانە گورگە بڵێی ماڵ؟ ئەمن ئەوەی دەزانم مام زامن، کە ئەتۆش وەک بەندە بێ ژن و ماڵ و حاڵیی!'

'وەک خۆت ئەفەرموویت ڕەحیم موکریانی، بە قەولی کوڕوکاڵی شار، ڕەحیمە شێتیت، تۆ سـەهووت فەرموو، کە لەوەیاندا من لە تۆ ناچم!'

'باشە... ئەمن شێت و ئەتۆ عاقڵ، ڕووی ئەو کوڕوکاڵەی ڕەش بێ، ئای غەریبی، ڕووی زەمانەش ڕەش.'

'مەجبوورم بڵێم، قەدری غەریب گرانە، من و تۆ باش یەک ئەناسین. کاتێک من و تۆ نامانەوێت بیر بکەینەوە، هاوشێوەین.'

'ئەدی، دەزانی مام زامن، ئەمن شارەزای کونی قوونی ئەتۆشم.'

'کوڕە ئەوەندە قووچڕەو مەبە، ئەو خەڵکە ناحەقیان نییە پێت ئەڵێن شێت.'

'کوڕە دایکی ئەو خەڵکەی دەگێم.'

'مەگەر لە خەودا دەستت بە دایکیان بگات!'

'بەو جۆرەش ڕازیم.'

'ڕەحیم، تۆ لای من لە زۆرینەی خەڵکی ئەو شارەی عاقڵتریت!'

'دە بڵێ لە حەموویان، خودا بتگرێ!'

'ئاخر بۆ ڕازیکردنی دڵی تۆ، درۆ ناکەم!'

'دە خودا بمگرێ، گەر بڵێم درۆم لێ بیستووی.'

'خوایشتەکەم!'

بەو شـــێوەیە لێدوانی ئەو دووانەش بەردەوام دەبوو، دەتوانم بڵێم شــەڕی ئەم دووانە درێژەی دەکێشـــا، تاوەکوو ئەو کاتەی مام زامن نوقڵێکی بۆری پانکەڵەی دەنایە نێو مشـــــتی ڕەحیم، دوای ئەوەی بە دەم قســـــەکردنەوە لە نێو دەمی دەنـا، هێواش دەبووەوە و دەنگی دەگۆڕا و بێدەنگ دەبوو، پاشان ڕاست بەرامبەر مام زامن ڕادەوەستا و تەنیا گوێی لێ دەگرت. ئەوەندە نەبێت لە ژێر لێوەوە، بێ ئەوەی لە مام زامن بڕوانێت، دەیگوت: 'سپاست دەکەم مام زامن، دەردی دڵەی شکاوی ئەم بەندەیەی خۆت چارەسەر کە!'

دوای ئەمە، ڕەحیم دەســـــتی دەکرد بە گریـان و مـام زامنیش لە باوەشی دەگرت، تا لەسەر باڵەکانی وەکوو منداڵ خەوی لێ دەکەوت.

## ٣

میرزا کەریم کاتێک لە کەرکووکەوە گەیشـــتەوە بەر خانەقا و لە ئۆتۆمبێلەکەی ســـەرحەدە کەچەڵ دابەزی؛ دوو کوڕی گەنجی تەمەن بیست سالانی پۆشتەی بالابەرزی چاکەت و پانتۆلپۆشی لەگەڵدا بوو، پێلاوە ڕەشـــەکانیان لە بەر تیشـــکی خۆرەکەدا بریقەیان دەهات، بۆینباخی سـووریان بەستبوو، کە لە دوورەوە سـەرنجی ڕادەکێشـا. ئەو دوو کوڕە گەنجە ناویان یونس ڕەئووف و موکەڕەم تاڵەبانی بوو، بۆ شـــەوێک میرزا کەریم لە لای موکەڕەم دەمێنێتەوە، کە پێنج قوتابی بوون و خانوویەکیان لە شـــۆڕیجەی کەرکووک بە کرێ گرتبوو، هەموویان قوتابیی سـێی ناوەندی بوون. دوای ئەوەی میرزا کەریم بۆ سـلێمانی و ماڵی خۆی دەعوەتیان دەکات، ڕۆژی دواتر بێ دوودڵی لەگەڵ میرزا کەریم هاتبوون.

لە ئۆتۆمبێلەکەی ســـەرحەد دابەزین و توورەکەیەکیان لە دواوەی ئۆتۆمبێلەکە دەرهێنا. پاشـان دوو میوانەکە توورەکەکەیان لە دەسـتی میرزا کەریم وەرگرت و یەکی لایەکیان گرت، پێکەوە بە کەناری شیوی قازیدا داگەڕان و چوون بۆ ماڵی میرزا کەریم.

گەیشـتنە ناو حەوشـەی ماڵەوە، مام مسـتەفای ناڵبەند لەگەڵ دوو پیاوی غەریبەدا لەبەر دەرگەی خانەکەدا ڕاوەســـتابوون، دیار بوو تازە لە ناڵکردنی هێســـترێک بووبوونەوە، چونکە کەرەســـتەی ناڵبەندییەکە و بەربەرۆکە چەرمەکەی هێشـتا بە دەستەوە بوو. دوای سڵاوکردن، میرزا کەریم میوانەکانی بە مام مستەفا ناساند.

یونس ڕەئووف گوتی خەڵکی شـاری کۆیەم. مام مسـتەفا لەبارەی مـەلای گـەورەوە لێی پرسـی، پێش ئـەوەی یونس ڕەئووف وەڵام بداتەوە، مام مسـتەفا گوتی: 'نموونەی عالم و ئیمانداری کوردە، بە ڕاسـتی هەموو شـخسـێکی خوێندەواری وەک ئێوە ئەبێت ئەو زاتە بناسێت.'

مام مسـتەفا درێژەی بە قسـەکانی دا، یونس ڕەئووف گوتی: 'ئێ قوربان تۆ لە منی زیاتر دەربارەی مەلای گەورە پێ دەزانیت، دیارە جەنابت لە من زیاتر بە مەلای گەورە سەرسامیت!'

ئەمان لەو قسـانەدا بوون و هێشـتا مام مسـتەفا لە باس‌وخواسـتی مەلای گەورە تەواو نەبووبوو. حەلاوەخان بانگی میرزا کەریمی کرد، کە لەبەر دەرگەی دالانەکەدا چاوەڕوانی دەکردن. منداڵێکی قژکاڵی بە باوەشـەوە بوو، میرزا کەریم و میوانەکانی چوون بۆ لای. دەسـتێکی خسـتە سـەرشـانی مێردەکەی و لە یونس ڕەئووف و موکەڕەم تاڵەبانیی ڕوانی: 'ئـەرێ میرزا، ئـەم کوڕە جوانخـاسـانـە میوانی خۆمانن؟'

'بەڵێ، حەلاو بەوەدا هەڵمەخەڵەتێ، ئەفەندین و پۆشـتەوپەرداخ دیارن، هەردووکیان لێقەوماو و برسـین و هێناومن تەنیا بۆ جارێک دەستاوی تۆ بخۆن!'

میوانـەکان لەگەڵ حەلاوەخان بە دەم میرزا کەریمـەوە پێکەنین. موکـەڕەم تـاڵـەبانی گوتی: 'ئـەگـەر میوانداریمـان قبووڵ بفـەرموون، بچووکتانین.'

'هەموو ڕۆژ و سـاتێک دەرگەی ماڵی میرزا کەریم لەسـەر پشـتە، کوڕی خۆم ئێمە خاوەن ماڵ نین، یا خوا بەخێر بێن.'

منداڵێکی دووسـاڵان لە دەرگەی داڵانەکەوە دەرپەڕی و باوەشـی کرد بە ڕانی میرزا کەریمدا: 'باوکە، باوکە.'

موکەڕەم پرسیی: 'ئەم پیاوە ژیکەڵەیە دەبێ کێ بێت.'

هەموو لێیان دەڕوانی، منداڵەکە چاوی پێدا گێڕان و شـەرمنانە سـەری داخست، میرزا کەریم گوتی: 'کاکە جەلال، ئەویشیان جەمال، کوڕە بچووکمە.' لەو کاتەدا دەسـتی بەرەو لای منداڵەکەی باوەشـی حەلاوەخان درێژ کرد.

حـەلاوەخـان ویسـتی پێشـوازییـان لێ بکـات و بۆ ژووری دانیشـتنەکەی میرزا کەریم بڕۆن. میرزا کەریم دەسـتی خستە سـەر شانی حەلاوەخان و گوتی: 'ژنەکە، ئێمە لە ژێرزەمینەکەین، چاییەکی خەستمان بۆ لێبنێ.'

گەیشتنە ژێرزەمینەکە، توورەکە بەنە بۆرەکەیان پێکەوە هەڵبڕی و خسـتیانە سـەر مێزێک، کە چوار بەسـتە کتێبی لەسـەر بوو. لە لای ڕاسـت و چەپی مێزەکەوە سـندووقی کتێب دانرابوون. کە سـندووقی چاییان پێ دەگوت، میرزا کەریم کتێبەکانی یەک یەک لە توورەکەکە دەردەهێنـا. یونس ڕەئووف کتێبێکی بچووکی ڕەنـگزەردی تـەنکی لەسەر مێزەکە هەڵگرت و گوتی: 'تووتنەکەمان!'

'بەڵێ تووتنەکەمان، کاک ئەحمەد ڕەفیق نووسـیویەتی. ئەوە ئەو کتێبەیە کە ئێوە بە دوایدا ئەگەڕێن.'

'بەڵێ، ئەوەی ڕاستی بێت میرزا گیان، ئەگەر بڵێم ئەو کتێبە حوجە بوو بۆ ئەوەی بێین بۆ سـلێمانی، بەڵام باسـوخواسـت زۆرن و مەبەستی هاتنمان ڕوونە.'

'جەمال بابان پێی گوتم، پرسیاری ئەو کتێبەت کردووە.'

'بەڵێ، کاک جەمال بابان تاریفی کرد و گوتی؛ یەکەم کتێبی فەلسەفی و کۆمۆنیستییە تا ئەمڕۆ بە کوردی نووسرابێت و هەوڵێکی زۆر بێوێنەیە، بەڵام وا بزانم لە سلێمانی کەمترین خوێنەری هەبووە!'

'بەڵێ، جەمال ڕاستەکات! ئێوە ئەتوانن، ئەو نووسخەیە لەگەڵ خۆتاندا بەرن.'

میرزا کەریم، دەفتەرێکی لە چاوی مێزەکەدا دەرهێنا و یەک یەک ناونیشانی کتێبە تازەکان و ناوی نووسەرەکەی نووسی، پاشان بەگوێرەی بابەتەکان بەسەر سندووقەکاندا دابەشی کردن. دوای ئەوەی کتێبەکان لە نێوان میوانەکاندا دەستاودەستیان دەکرد و ناونیشان و ناوی نووسەرەکەیان دەهێنا، باسیان لەوە کرد داخۆ خوێندوویاننەتەوە یان نا. میرزا کەریم لەبەرخۆیەوە گوتی: 'ئەوە زۆربەی کتێب و ڕۆژنامەی نێو ئەو سندووقانە لەلای خەڵکن. هاوڕێیان ناویان لێ ناوە کتێبخانەی بیری نوێ.'

یونس ڕەئووف ویستی یەکێک لە کتێبەکان بخاتە ناو سندووقێک، کە میرزا بۆی دەستنیشان کردبوو، لەبەر خۆیەوە گوتی: 'بیری نوێ! ئێ، ئێ، ئەی ئەم کتێبە؛ بنیادنانی سۆشیالیزم.'

'بەڵێ، ئەوە دەستنووسە...'

یونس ڕەئووف قسەکەی بە میرزا بڕی، کتێبەکەی کردبووەوە و گوتی: 'چۆن دەستنووسە؟!'

'ئەوە تۆ بە بەرگەکەیدا تێ کەوتوویت، ناواخنی عەرەبییە و لە بەر چەند کتێبێکی تر نووسراوەتەوە.'

'دەی دیارە تەنیا ناونیشانەکەیان بە پێویست زانیوە بیکەن بە کوردی؟'

‘کاک قادر ئاغای عەتار بە نیاز بوو وەریانگێڕێت، هەر خۆیشی هەمووی بە دەستوخەتی خۆی نووسیوەتەوە.’

موکەڕەم تاڵەبانی پرسیی: ‘ئەی ئەم دەستنووسەیان؟’

‘ئەوە هەمووی شیعری هەڵبژاردەن و لە کوێ شیعرێکمان دیبێ، لەگەڵ مستەفا و عەبدوڵلای برامدا لەوێدا نووسیومانەتەوە. یان هەر کام لە شاعیرەکان ڕێگەیان کەوتبێتە ئەم ماڵە، داوامان لێ کردوون شیعرێکی خۆیانمان لەو دەفتەرەدا بۆ بنووسن. بۆ زانینتان پێشتر ڕەحمەتیی ئەحمەدی ناڵبەندی باوکم دەستی پێ کردبوو!’

میرزا دەستی خستە سەر شانی یونس ڕەئووف و لێی پرسیی: ‘تۆ باسی دارکەرت بۆ نەکردم!’

‘بەڵێ، حەتمەن بۆت باس دەکەم.’

‘کاتێک ئەنوەری حەمە ئاغا، ناوەکەی پێ گوتین، دارکەر، وامان زانی حیزبی حەیتە و بارچاوەشەکانە، کە لە دارکارییەوە هاتبێت، ئیتر قەیرێک بەوە پێکەنیین.’

‘دارکەر، خەڵووزکەر، ئەو کارگەرانەی خەڵووز دروست دەکەن، مەبەست لێی کرێکار و چینی هەژارە، خۆی بە ئەسڵ ئیتالییە. خەبات بۆ سەربەخۆیی کوردستانی ئێراق. دەکەین، پاشان سەربەخۆیی بۆ تەواوی کوردستان، مەبەست گرێدانەوەی هێڵی جوغرافیاییە. ئێمە دژی فاشیزم و هیتلەرین و لایەنگری دیموکراتیین، بەڵام بەرهەڵستکاری ئەمپریالیستین. بە تایبەتی دژی دەسەڵاتی داگیرکاریی ئینگلیزەکان دەوەستینەوە.’

‘واتە حیزبێکی کۆمۆنستی ئەبێت.’

'دەتوانین بڵێین، ئامانجی لە سۆشیالیزمە، بەڵام لەگەڵ کولتووری هەموو جێگەیەکدا گۆڕانکاریی بە سەردا دێت!' موکەڕەم تاڵەبانی وای گوت.

'ئینجا ئەوە چیی بە چییە؟!'

یونس ڕەئووف لە میرزا کەریمی ڕوانی: 'تاوەکوو هیچ نەتەوەیەک نەبێتە پاشکۆی ئەوانی تر و بیروباوەڕی دارکەر لە زمان و فەرهەنگ و کولتووری کوردییەوە، هەروەها لە مێژووەکەیەوە سەرچاوەی گرتبێت.'

'تۆ ئەوەت پێ ڕاستە؟'

'دەی بێقەزا بیت، ئەی میللەتی کورد لە کولتوور و زمان و ڕەوشتیدا لە هەموو میللەتانی دونیا جیاواز نییە؟!'

'بەڵێ وایە، ئەی ئێستا قوڕی کوێ بکەین بە سەرماندا؟'

موکەڕەم گوتی: 'میرزا گیان، سەردەمی خۆ بە زەلیل زانین و قورپێوان بە سەر چووە. دارکەر جیاوازیی لەگەڵ پارتی کۆمۆنیستیی عێراقیدا زۆرە. بە ڕای من، ئەگەر پێڕەو و بەرنامەی حیزبێک دەقاودەق لە چینییەک یان ڕوسێکەوە وەرگیرابێت، چۆن بۆ ئەم میللەتەی ئێمە دەبێت، ئەگەر هەر هیچ نەبێت وەکوو پێویست دەستکاری نەکرێت و خۆماڵی نەکرێت؟'

میرزا کەریم گوتی: 'دەی خوای ئەکرد سیاسەتی قەرەجەکان ئەبوو، گرنگ کورد باوەڕی پێ بێنێت و یەک بگرن.'

'جەنابی میرزا کەریم، پێویستە ئێمە بزانین باوەڕ بە چی دێنین! ئێ کەواتە ئەویش وەک قورعانەکەی لێ دێت، کە میللەتی کورد تا هەزار ساڵی تر تێی ناگات؛ بەڵام وەکی عەوام سەری بۆ دەلەقێنێ و کوێرانە دوای دەکەوێت. بەڵام...'

موکەڕەم قســـەکەی بە یونس بڕی: 'هەرچەند بیری کۆمۆنیســـتی لەگەڵ دیندا بەراورد ناکرێت، بەڵام ئەوەتانێ لە ســەرانســەری جیهاندا دەیان میللەتی جیاواز ئازادن و پێڕەوی هەمان بیروباوەڕی ئیســـلام یان مارکسییەت دەکەن. تەنیا کوردە قوڕبەسەرەکە نەبێت.'

'من وا هەست دەکەم کارێکی زۆر ئەستەم دەبێت، ئەگەر ئێمە ئەو بیروباوەڕە مارکسییەتە یان یەکێک لەو دینانەی تر... ئیتر ئیسلام بێت یان مەســـــیحییەت باش تێی نەگەین و خۆماڵی نەکەین.' یونس وای گوت.

'خۆ هەندێک جار بیر لەوە دەکەمەوە کە هیچ میللەتێک بەقەدەر میللەتی کورد پێویســـتیی بە بیروباوەڕی ســۆشــیالیزم نییە، چونکە میللەتی کورد بە ســـــروشـــــتی چەپگەرا و بەخشــــندەیە. تا بتوانین زۆرداری و چەوساندنەوە بنەبڕ بکەین.'

میرزا کەریم بە ســــەرنجەوە گوێی لێ گرتبوون، لە بەر خۆیەوە گوتی: 'موکەڕەم، بۆ ئەوەیان من و تۆ هاوڕاین!'

'ئێ خۆی ئەوە لوبی مەوزووعەکەمانە! کەواتە هەموو ڕێگەکان دەچنەوە سەر بانە!'

'ئەگەر هەموومان وەک جەنابت بیری لێ بکەینەوە، ئەوا هەموو ڕێگەکان دەچنەوە سەر کەرکووک.'

'نەخێر برا، هەموو ڕێگەکان دەچنەوە سەر سلێمانی.'

موکەڕەم بە پێکەنینەوە وای گوت، یونس دەســـتی خســـتە ســـەر شـانی و گوتی: 'لە سـلێمانییش هەموو شـەقام و کۆڵانەکان دەچنەوە سەر خانەقا و ماڵی شێخ و بەگەکان.' هەرسێکیان پێکەنین.

میرزا کەریم ئەو دەفتەرەی لە بەردەم یونس ڕەئووفدا دانا کە لەســـەر بەرگەکەی نووســـرابوو، دیوانی شــیعری کوردی. شــیعری

کۆکراوەی گەلێک شاعیر بوو، هەندێکیان بە دەست و خەتی خۆیان نووسیبوویان، دوا لاپەڕەی بۆ کردەوە و قەڵەمەکەی دەستی بۆ ڕاگرت و پێی گوت: 'ئەو شیعرەی خۆتم بۆ بنووسە، شیعری ئەی ڕەقیبم مەقسەدە، ئەوەی کە دوێنێ شەو لە کەرکووک بۆت خوێندمەوە، ئا لەم دەفتەرەدا وەک یادگاری بۆمی بنووسە. وا بزانم دوای ئەوە ئیتر لاپەڕەکانی تەواو ئەبن و ئەی ڕەقیب دوا شیعر ئەبێت.'

'ئەی ڕەقیب؟'

'بەڵێ.'

'ئەوە بە تۆوە بوون بە سێ کەس کە ئەو شیعرەتان بەدڵە، لێت نەشارمەوە، لە کەرکووک بۆ چەند برادەرێکمم خوێندەوە، دوای ئەوەی کە توورە بوون، ئەو ڕۆیشتنەی ڕۆیشتن، ئیتر نەمبینینەوە، کە هاوڕێی منداڵی و خزمی خۆیشم بوون.'

کاتێک گوێیان لە دەنگی پێی حەلاوەخان بوو، بێدەنگ بوون. حەلاوەخان سێ پیاڵە چایی و شەکردانێک شەکری کلۆی لەسەر سینییەکی زیو بە دەستەوە بوو، دوای ئەوەی سینییەکەی لەسەر مێزەکە دانا، گوتی: 'یا خوا بە خێر بێن.'

موکەڕەم گوتی: 'زۆر قەدری لوتفت دەگرم و ڕێزداریت، جێگەی شانازیمە وەک میوان لەم ماڵەدا قبووڵ دەکرێم.'

'ماڵی خۆتە، خۆتان ماتڵ مەکەن و وەرنە سەرەوە قەیرێکی تر نان ئەخۆین.'

هەرسێکیان، وەکوو بڵێیت خەیاڵیان هێشتا لە لای قسە و باسەکانیان و شیعری ئەی ڕەقیب بووبێت، تەنیا سەریان بۆ لەقاند. دوای ئەوەی حەلاوەخان بەجێی هێشتن، جەلال لەگەڵی هاتبووە

ژوورەوە و لە بەردەم یونس ڕەئووفدا ڕاوەستابوو، سەری بە لای ڕاست و چەپدا دەخست، وەک بیەوێت بە یونس بڵێت لێم بڕوانە، پاشان دەستی بۆ بۆینباخە سوورەکەی ملی درێژ کرد. یونس بێ ئەوەی هیچ بڵێت، لە ملی خۆی کردەوە و کردییە ملی جەلال. بۆی بەست و پێی گوت: 'ئەوە تۆش بوویتە ئەفەندی.' جەلال زەردەخەنەیەکی بۆ کرد و هەردوو دەستی پێوە گرت و بە ڕاکردن چوو بۆ قاتی سەرەوە.

میرزا کەریم دەستی بۆ دەفتەری شیعرەکە ڕاکێشا و گوتی: 'لێی بنووسە، دیاری و یادگاریی یونس ڕەئووف، بۆ میرزا کەریمی ئەحمەدی ناڵبەند.'

'بە سەرچاو، دوو مانگێک پێش ئەمڕۆ لە سجنی کەرکووک نووسیومە، باشە تۆ بۆ دڵت چۆتە سەر ئەو شیعرەی من!'

'ئەی مەگەر منیش کورد نەبم، لە شیعری تەسەوف و دڵداریم پێ باشترە.'

ئەو ڕۆژە یونس ڕەئووف، شیعری ئەی ڕەقیبی ئاوا لە دەفتەری شیعرە کۆکراوەکانی ماڵی میرزا کەریمدا نووسیی:

''ئەی ڕەقیب هەر ماوە قەومی کورد زوبان
نایڕمێنێ دانەیی تۆپی زەمان
ئێمە ڕۆڵەی ڕەنگی سوور و شۆڕشین
سەیری کە خوێناوییە ڕابوردوومان
ئێمە ڕۆڵەی میدیا و کەیخوسرەوین
دینمان ئاینمانە نیشتمان
کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە
زیندووە، قەت نانەوێ ئاڵاکەمان

چەند هەزار لاوانی کوردی نەڕەشێر
بوون بە قوربانی و هەموویان نێژران
لاوی ئێستاش حازر و ئامادەنە
جانفیدانە، جانفیدانە، جانفیدان
لاوی کورد هەڵسانە سەرپێ وەک دلێر
سا بە خوێن نەقشی دەکەن تاجی ژیان
کەس نەڵێ کورد مردووە، کورد زیندووە
زیندووە، هیچ نانەوێ ئاڵاکەمان

یونس ڕەئووف، دڵدار، کەرکووک.
دیاری و یادگاری بۆ میرزا کەریمی ئەحمەدی ناڵبەند."

میرزا کەریم دوای ئەوەی شیعرەکەی خوێندەوە، لەبەر خۆیەوە گوتی: 'دڵدار! خۆ بەم نازناوەدا بووایە تۆ ئەبووایە تەنیا شیعری دڵدارییت بنووسیایە؟'

'دەی قوربان خۆشەویستی و بە ئەمەگی بۆ نیشتمان و قەومەکەی خۆت، جۆرێکە لە عەشق و دڵداری.'

'بە مەرجێک، خوێنت پاک بێت!' میرزا کەریم وای گوت.

٤

'ئەگەر ئەوان وەک جەلال شعووریان بە دڵشکانی مالیک ئەکرد، ئەوا ماڵەکانی خۆیانیان بۆ ئەکردە مەدرەسە!'

مامۆستا سەعید سدقی کابان ئاوای بە غەفوور گوتبوو، کاتێک دەچێت بە دوایدا و چیرۆکی چوون و نەچوونی جەلال و مالیکی بۆ قوتابخانە پێ دەڵێت.

مالیکی مام مستەفا هەموو ڕۆژێک و بە درێژاییی شەش ساڵ لەگەڵ جەلال تاوەکوو بەردەم قوتابخانەی ئەیووبییە دەچوو، ڕۆژانە لە بەردەم قوتابخانەکە دەمایەوە، تا جەلال دەرسەکانی تەواو دەبوو، پاشان پێکەوە دەگەڕانەوە بۆ ماڵەوە.

چەند ڕۆژێک پێش کردنەوەی قوتابخانە، حەلاوەخان توورەکەیەکی لە بەنی ڕەنگاوڕەنگ بۆ جەلال دروست کردبوو، کاتێک تەواوی کرد، بانگی جەلالی کرد و پێی گوت: 'جەلال گیان، چەند ڕۆژێکی تر ئەچیت بۆ مەکتەب، کتێب و دەفتەرەکانت بکەرە ئەمەوە.'

'ئەی بۆ مالیک؟'

'ئینجا بۆ مالیکیش دروست ئەکەم. بەڵام وا بزانم مالیکیان لە مەکتەب وەرنەگرتووە!'

'بۆچی؟'

'جەلال گیان، مالیک ناتوانێت وەک تۆ بچێت بۆ مەکتەب.'

'بۆچی ناتوانێت؟ خۆ قاچی نەشکاوە؟!'

'نا نا، نه شـــوکور، ئەی خۆ تۆ ئەوە ئەزانیت، کە مالیک ناتوانێت ببیسێت و قسه بکات؟'

'دایکە، منیش بێ مالیک بۆ مەکتەب ناچم!'

'چۆن؟ نابێت کوڕی خۆم، باوکت و مامە مســـتەفات گوتیان زۆر هەوڵمان لەگەڵ داون و مالیکیان لە مەکتەب وەرنەگرتووە.'

'دایکە گیان، ئەگەر تۆ توورەکەیەکی ئاوا جوان بۆ مالیک و جەمال دروست بکەیت، منیش بە دزییەوە لەگەڵ خۆم ئەیانبەم بۆ مەکتەب.'

'وەی ڕۆڵە گیان، مەگەر من بزانم پەیوەندی تۆ و مالیک چۆنە. باشـــە بەســـەرچاو، ئەی جەمالی جوانەمەرگ بۆ؟' دوای ئەمە حەلاوەخان دەستی بە گریان کرد.

یەک بە یەک ئەندامانی خێزانەکە لەم جۆرە گفتوگۆیەیان لەگەڵ جەلال کرد. لە ســـەرەتاوە وایان دەزانی ئەو ناڕەزایەتییەی جەلال کاتییە و دوای چەند ڕۆژێک ڕازیی دەکەن. بەلام مانگێک بوو قوتابخانە کرابووەوە، جەلال هێشـــتا ئەو گفتەی بە مالیکی ئامۆزای دابوو نەیشـــکاندبوو، کە بێ ئەو بۆ قوتابخانە ناچێت. هەروەها کاریگەریی مردنی لە ناکاوی جەمالی سێ‌ساڵان، کە دوو ساڵ لەوان منداڵتر بوو، بە سەریانەوە بوو، هەردووکیان تەواو هۆگری بووبوون و وەک هاوڕێیەک لێیان دەڕوانی. ئەو بەیانییە جەلال و مالیک لە خەودا دەبن، نیوەشـــەو جەمال بۆ نەخۆشـــخانە دەبەن و ئیتر ئەوان نایبیننەوە. بەردەوام خەونی پێوە دەبینن و بە درێژاییی تەمەنیان لە پێش چاویان ون نابێت.

ئەو ڕۆژانە و پێش کردنەوەی قوتابخانە، مالیک هەموو بەیانییەک پێش خۆرکەوتن دوو دەفتەری لە بن دەســـت و قەڵەم و

خەت کوژێنەرەوە و قەڵەمدادەری لە گیرفانی دەنان، لە پێش ماڵ ڕادەوەستا و چاوەڕوانی جەلال دەبوو. باوک و دایک و هەموو ئەندامانی ئەو خێزانە دەیانویست ئەوە لە مالیک بگەیەنن، کە ئەو ناتوانێت وەکوو جەلال و قادر و مەحموودی برای و منداڵانی تر بچێت بۆ قوتابخانە، بەڵام دیار بوو مالیک هیچ جیاوازییەک یان کەموکوورییەکی لە نێوان خۆی و ئەوانی تردا نەدەبینی. ئەو گفتەی جەلالیش پێی دابوو، ئەوەندەی دیکە هیوای چوونی بۆ قوتابخانەی بە مالیک بەخشیبوو.

میرزا کەریم و مام مستەفا ناچار بوون، لەگەڵ جەلال و مالیکدا بۆ قوتابخانەی ئەیووبییە بچن و لەگەڵ بەڕێوەبەر عەلی ئاگا قسە بکەن. مامۆستا سەعید سدقی کابانیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو، مامۆستایەکی خانەنشین و بە ئەزموون بوو. مام مستەفا دەیگوت؛ مامۆستا سەعید کابان مامۆستای مامۆستاکانە. مامۆستا سەعید بەڕێوەبەری قوتابخانەی بەوە ڕازی کرد کە مالیک هەرچی کاتێک بیەوێت، بۆ قوتابخانەی ئەیووبییە بێت و تەنانەت دەتوانێت لە پۆلەکەشدا لەگەڵیدا دابنیشێت، بە تایبەتی لە دەرسەکانی وێنە و وەرزشدا.

کات تێپەڕی و مالیک ڕۆژێک نەبوو لە چوونی بۆ قوتابخانە دوابکەوێت، لە دەرسی وێنەدا لە تەنیشتی ئیسرا ئەولیێ جووەوە دادەنیشت، کە ئەویش وەک مالیک لە شەرماندا بە درێژایی ئەو ساڵە قسەی لە دەم نەهاتە دەر، هەردووکیان زۆر لەیەک دەچوون و گوێقوت و بچکۆلانە و لاواز بوون، لە کاتی پشووەکانیشدا بێدەنگ بەردەوام بە دوای یەکەوە بوون. ساڵی دوایی بەڕێوەبەری قوتابخانە گۆڕا و مالیک و ئیسرا لە قوتابخانە دەرکران. یاقووبی برا گەورەی

ئیســـرا هاوڕێی غەفوور بوو، هەروەها لە ڕێکخســـتنەکانی تەحەڕوڕ ئەندام بوو، یاقووب بە جەلالی گوتبوو: ئیســـــرای برام وەک مالیک کەڕولاڵ نییە، بەڵام زۆر شەرمنە، ئەو و قوتابخانەیان نەگوتووە.

ڕۆژێک میرزا کەریم ســـــەردانیی بەڕێوەبەری خوێندنی ســـــلێمانی، مســـتەفا مەزهەری کردبوو، کە هاوڕێی دەبێت. مســـتەفا مەزهەر ئەوە بە میرزا کەریم دەڵێت: کە قوتابخانە هیچ ســــــوودێکی بۆ ئەو منداڵە کەڕولاڵە نابێت و تەنیا دڵشـــکانی بۆ دەمێنێتەوە. باشـــترە خۆتان لە ماڵەوە هەوڵی لەگەڵدا بدەن و دڵی ڕازی بکەن.

لە دوای ئەو ڕۆژەوە جەلال هەرچییەکی لە قوتابخانە دەخوێند، هەوڵی دەدا مالیکیش فێر بکات.

جەلال دواتر ئەوەی لە لا ئاشـــــکرا بوو، کە تاوەکوو مالیک فێری خوێندنەوە و نووسین نەبوو، هەستی بەو نوقسانییەی نێوان خۆی و ئەوانی تر نەکرد.

دوای دوو مانگ چوونیان بۆ قوتابخانە و لە ڕۆژێکی سـێشـــەممەدا، ســــــەعاتێک پێش تەواوبوونی قوتابخانە، جەلال و مالیک پێکەوە گەڕابوونەوە. کەس دەرفەتی نەبوو ئەوەیان لێ بپرسـێت، کە هێشـتا کاتی قوتابخانە ماویەتی و ئێوە بۆچی هاتوونەتەو؟

میرزا کەریم پرســـیی: 'ئەرێ جەلال پێم ناڵێیت ئەو جەریدەیەت لە کوێ بوو؟'

'لە هاوڕێیەکمم وەرگرتووە و ئەبێت سبەینێ بۆی بەرمەوە.'

'ئینجا تۆ بە ئەستەم ئەلیف و بێ ئەناسیت، بۆچیتە؟'

'چۆن باوکە، بەحونجە حەموویت بۆ ئەخوێنمەوە.'

'ئا دەی وەرە بزانم، ئەگەر ڕاســـــت بکەیت، قاتێک ڕانکوچۆخەی تازەت بۆ ئەکڕم.'

جەلال لەو کاتەوە لە قوتابخانە گەڕابووەوە، کورسییەکی هێنابووە ناوەڕاستی حەوشـەکە و قنج لەسـەری دانیشـتبوو، قاچی خسـتبووە سـەر قاچ و ڕۆژنامە ڕەنگزەردەکەی بە ڕوویدا کردبووەوە. مالیکیش لە پشـتییەوە ڕاوەسـتابوو، ئەویش وەکوو جەلال چاوی بە ڕووبەری ڕۆژنامەکەدا دەگێڕا.

جەلال زووزوو دەکۆکی و لە چواردەوری خۆیی دەڕوانی، یـان باشترە بڵێم بۆ ئەوەی یەکێک لەوێوە تێپەڕێت و ببینێت ئەو خەریکی چییە. میرزا کەریم هەڵیســـاند و ڕۆژنامەکەی لێ وەرگرت، پاشـــان لەســــەر ڕانی دانیشـــاند و پێی گوت: 'دەی فەرموو بزانم. تۆ تازە چوویتە مەکتەب و چۆن ئاوا خێرا فێری خوێندنەوە بوویت.'

'مەگەر پێش ئەوەی بچمە مەکتەب، کاکە غەفوورم دەرســـی پێ نەگوتبم.'

'مـاڵی کـاکە غەفوورت ئـاوەدان بێـت. ئـا دەی بزانم، ئەوە چی نووسراوە؟'

لەو کاتەدا میرزا کەریم ڕۆژنامەکەی بەرەو ڕووی خۆی و جەلال ڕاگرتبوو، چەنـاگەی لە ســـەردێڕی بـابەتێک لە ڕۆژنـامەکە نزیـک کردبووەوە، جەلال گوتی: 'س ە ر بە خ ۆ ی ی... ســـەربەخۆیی، و، ئ ی س ت ق ل ا ل ی ...ئیسـتقلالی، ب ۆ... بۆ، ک و ر د س ت ا ن... کوردستان.'

'تەواوە جەلال گیان، باوکی خۆت قەرزداری تۆیە، سبەینێ پێکەوە لە بازاڕین.'

مالیک له پشـــتیانه‌وه نووزه‌یه‌کی لێوه هات، وه‌کوو بڵێی گوێی لێ بووبێت و پێیان بڵێت؛ منیش لێره‌م.

میرزا که‌ریم ئاوڕی لێ دایه‌وه و گوتی: 'مه‌به‌ســـتم تۆ و جه‌لاله مالیک گیان.'

جه‌لال ده‌ستی کرد به گیرفانی شه‌رواڵه‌که‌یدا و کتێبێکی لوولکراوی ده‌رهێنا، پێش ئه‌وه‌ی بیکاته‌وه و نیشـــانی باوکی بدات، میرزا که‌ریم پرسیی: 'ئه‌وه کتێبی مه‌کته‌به؟'

'نه‌خێر، کـاکه غه‌فوورم پێی دام، گوتی که هـاوڕێیه‌کی خۆی نووسیویه‌تی.'

کتێبێکی به‌رگزه‌رد بوو: الف و بێی کوردی.

وێنه‌یه‌کی ڕه‌نگسه‌وزی نێو پۆلێکی قوتابخانه‌ی له‌سه‌ر بوو. پاشان له خواره‌وه نووسرابوو: حامید فه‌ره‌ج.

ساڵی چاپکردنی کتێبه‌که: ۱۹۳٦ بوو.

کتێبه‌که‌ی له‌ده‌ســـــت وه‌رگرت: 'کـاک حـامید فه‌ره‌جی خۆمـان نووسیویه‌تی، ئه‌مه‌ت خوێندووه‌ته‌وه؟'

'حه‌مووی، له سه‌ره‌تا حه‌تا کۆتایی.'

'چه‌ند جار؟'

'هه‌زار جار!'

'نا، نا، جه‌لال هه‌زار جار زۆره!'

'به خودا، هه‌زار جارم خوێندووه‌ته‌وه.'

'کوڕی خۆم درۆ مه‌که و سوێندی بۆ مه‌خۆ.'

'ده‌ی باشه، سه‌د جار.'

'هه‌ر زۆره.'

'ئه‌زانی باوکه، ئه‌وه‌نده، ئینجا ئه‌وه‌نده.'

لەو کاتەدا هەردوو دەستی بەرەو ڕووی باوکی کردبوونەوە.

'ئێ ئەوە دە جار ئەکات، کوڕی خۆم.'

'بۆ ئەوەندە زۆر نییە؟'

'بەڵێ، زۆر زۆرە و پڕ بە دوو مشـــتە، بۆ منداڵێکی وەکوو تۆ دە جار ئەو کتێبەی خوێندبێتەوە، زۆر زۆر ئازایت، بەڵام دە جار لە کوێ و سەد و هەزار لە کوێ.'

'گوتم بەڵکوو لەگەڵ قاتە جلەکەدا جووتێک پێڵاوی تازەشـــت پێ بکرم.'

'هەی زۆرزان.'

قادر هات و قسەکانی پێ بڕین، چەند کتێبێکی لە بن دەست بوون، دیـار بـوو لە قـوتـابـخـانەوە گەڕابـووەوە، پـرســـیـی: 'بــاوکە ئەو جەریدەیە هیی کێیە؟'

'ئەو جەریدەیە و ئەو کتێبەش هیی کاکە جەلالە.'

'بۆ کتێبەکە ئەزانم، کە هینی هەردووکمانە، بەڵام من ئیتر پێویستیم پێی نەماوە و بۆ جەلال، بەڵام ئەو جەریدەی کوردستانە ئەڵێم؟'

'ئەویش هیی جەلالە، ئێســتا لە ســەرەتاوە تا کۆتایی هەموویی بۆ خوێندمەوە.'

'چۆن؟ بە حونجە؟'

'قادر گیان بێقەزا بیت، تۆ ئاگات لە چییە، ئەو کتێبەی کاک حامید فەرەج دەبینیت؟'

'بەڵێ.'

'ئەوە جەلال هەزار جاری خوێندووەتەوە.'

'چەند جار؟ هەزار جار؟!'

'بەڵێ، قادر گیان ئا ئەوەندە.'

میرزا کەریم هەردوو دەستی بە کراوەیی بەرەو ڕووی قادر ڕاگرتبوو. قادر سەری لێ ڕاوەشاند و لە جەلالی ڕوانی و گوتی: 'باوکە ئەگەر مەبەستت لە دەیە، ئەوەندەی من بزانم دوو قات و سێ قاتیشی خوێندووەتەوە، من شایەتیی بۆ ئەیەم، ئەوەی ڕاستی بێت، نازانم بە دەقیقی چەند جار، بەڵام هەفتەی دوو تا سێ جار، کاکە غەفوورم پێی ئەخوێندینەوە.'

قادر هەرچەند هەوڵی لەگەڵ جەلالدا پێی نەگوت ڕۆژنامەی کوردستانی لە کوێ دەست کەوتووە. پێشتر جەلال بە میرزا کەریمی باوکی گوتبوو، لە هاوڕێیەکم وەرگرتووە.

ڕۆژی دواتر لە قوتابخانەی ئەیووبییە تەها بابان، کە هاوڕێ و هاوپۆلی قادر بوو، چپاندی بە گوێی قادردا: 'قادر ئەزانیت، لەژێر ئەو قادرمانە و لە دۆلابێکدا دوێنێ یەکێک جەریدەی کوردستانی لە حەمەسەعیدی فەڕاش دزیوە!'

قادر دوای تاوێک بێدەنگبوون، پرسیی: 'بە ڕاست؟ بۆ؟ حەمەسەعیدی فەڕاش خوێندەوارە؟'

'ئەی چۆن، لەو ژێر قادرمانە کتێب و جەریدەی لێ داناوە. وەرە با پێکەوە بچین سەیری بکەین.'

تەها ئەمەی گوت و دەستی قادری گرت و بردی بۆ ژێر قادرمەکان. دۆلابێکی کۆنی سێ قاتی بێدەرگەی لێ دانرابوو، قاتی یەک و دووی شتومەکی پاککردنەوە و سەتڵ بوون، بەڵام قاتی سەرەوەی کە ئەوان دەستیان پێی نەدەگەیشت، کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤار لەسەر یەک هەڵچنرابوون. پاشان هەردووکیان دوو مەترێک لە دۆلابەکە دوور

کەوتنەوە و خۆیان هێنایە سەر نووکی پێکانیان و لێیان ڕوانی، پڕ بوو لە کتێب و ڕۆژنامە و گۆڤاری کۆن و نوێ.

لە دەنگی حەمەسەعیدی فەڕاش ڕاچڵەکین، ویستیان بێدەنگ بڕۆن، پێشی لێ گرتن و گوتی: 'لە چی ئەگەڕێن؟'

جەلالی حاجی شەفیق، کە هاوپۆلیان بوو هاتبوو لە شانیانەوە ڕاوەستابوو. قادر و تەها بابان نەیانتوانی هیچ بڵێن، وەکوو ئەوان بە دزینی ڕۆژنامەی کوردستانەوە گیرابن. بەڵام جەلالی حاجی شەفیق گوتی: 'ئەو کتێبانە چین؟'

'ئێوە کارتان بە سەرەوە چییە؟ بڕۆن، بڕۆن دەی!'

قادر گوتی: 'دەی بۆ تووڕە ئەبیت، خۆ ئێمە نایاندزین!'

'قابیلە بیخوێننەوە، ناشێت ئێوە بووبن؟'

'ئێمە چی؟'

'ناڵێم دزی، بەڵام، دواژمارەی جەریدەی کوردستاننتان بێ پرس بردبێت؟'

قادر چوو بەرامبەر سەعیدی فەڕاش ڕاوەستا: 'نەخێر ئێمە نەبووین، بەڵام ئەگەر ڕووخسەتمان پێ بدەیت سەیری کتێب و جەریدەکانت بکەین، پێت ئەڵێم جەریدەکە لای کێیە!'

هەردوو هاوڕێکەی قادر زیاتر لە پێنج مەترێک دوور کەوتبوونەوە، کاتێک ئەمەیان لە قادر بیست، هاتن و لە شانیەوە ڕاوەستان. حەمەسەعیدی فەڕاش گوتی: 'ئەگەر تۆ ئەو چاکەیەم لەگەڵ بکەیت، چونکە ئەوە دواژمارەی جەریدەی کوردستانە و گفتم بە گەلێک هاوڕێ و دۆست داوە بۆیان بەرم.'

'کاک حەمەسەعید، پێت ناڵێم کێ بردوویەتی، بەڵام وەعد بێت، سبەینێ بۆت بێنمەوە.'

حەمەسەعیدی فەڕاش هیچی نەگوت و تەنیا سەری ڕەزامەندیی بۆ لەقاند.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە، کاتێک قادر داوای ڕۆژنامەکەی لە جەلال کرد و پێی گوت، کە حەمەسەعیدی فەڕاش پێی زانیوە و دەبێت بۆی بەرینەوە، جەلال لە وەڵامدا گوتی: 'ئینجا ئەیسووتێنم و ئیعتراف ناکەم کە من بردوومە.'

دوای ئەوەی ئەمەی گوت، ڕۆژنامەکەی بە دەستەوە و بە ماڵەکەدا بۆ دەرەوە و پاشان سەر و خوار، ڕای دەکرد و قادریش بە دوایەوە بوو. جەلال هاواری دەکرد، دەیسووتێنم، قادریش بانگی دەکرد، وەعدم داوە بۆی بەرمەوە و نایسووتێنیت.

پاشان باوک و دایک و تەنانەت غەفوور و عەزیزی برایان کەوتبوونە نێوانیانەوە. میرزا کەریم ڕۆژنامەکەی لە دەستی جەلال دەرهێنا، چرچولۆچ بووبوو، کاتێک قادر بەسەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە، جەلال دەستی کرد بە گریان و گوتی: 'بە خودا لەسەر ئەو دزییە هەزار ساڵ سجنم ئەکەن.'

عەزیز گوتی: 'مەگەر گونت بگرن، سجنی چی؟!'

'ئەگەر من سبەینێ بیبەمەوە و بیدەمە دەست حەمەسەعیدی فەڕاش، ئەوا هیچ ڕوو نادات.'

حەلاوەخان بێدەنگ جەلالی لە باوەش گرت و بردییە ژوورەوە، میرزا کەریم ڕۆژنامەکەی قەد کردەوە و دایە دەست قادر و پێی گوت: 'بینیت چەندی پێ ناخۆشە، کەواتە جەلالی برات دزی و فڕوفێڵی پێ ناکرێت! لای کەس باسی ناکەیت، تەنانەت لای هاوڕێکانیشت. ئەگەر حەمەسەعیدی فەڕاش لێی پرسییت، یان بڵێ خۆم بردوومە و

خوێندمەوە و ئەوا هێناومەتەوە، یان بڵێ کەسێکی نەناس بردوویەتی.
قادر بەو جۆرەی کە پێم گوتی، تێ گەیشتیت؟'
'بەڵێ، باوکە هیچ خەمت نەبێت.'

ڕۆژی دوایی لەگەڵ چوونەژوورەوەدا بۆ نێو قوتابخانەی ئەیووبییە، قادر چوو ڕۆژنامەکەی دایەوە دەستی حەمەسەعید و پێی گوت: 'کاک حەمەسەعید، ببوورە من جەریدەکەم بردبوو، گوتم لە ماڵەوە بە ئیسراحەت ئەیخوێنمەوە و دوایی ئەیگەڕێنمەوە.'
حەمەسەعید سەری ڕەزامەندیی بۆ لەقاند و هیچی نەگوت.

دواتر حەمەسەعید لە حەوشەی قوتابخانە لە ناو قوتابییەکانی تردا بانگی قادری کرد و بردی بۆ لای دۆڵابەکەی، کورسییەکی لە بەردەم دۆڵابەکەدا دانابوو، دەستی بەرەو ڕووی درێژ کرد و گوتی: 'ئا دەی خۆت بچۆرە سەر ئەو کورسییە و بزانە ئەو کتێب و جەریدانە چین!'
تەها بابان و جەلالی حاجی شەفیق، هەروەها حەمەکاکەش، کە بێدەنگ بە دوایانەوە بوو، هاتبوون، قادر سەر کەوت و دوای چەند هەناسەیەک خێرا دابەزی. چەند ژمارەیەکی کۆن و نوێی ڕۆژنامەی کوردستانی بە دەستەوە بوون، لەسەر کورسییەکە دانیشت و خستنییە سەر کۆشی، هەموو پێکەوە لێیان دەڕوانی.
پاشان حەمەسەعید ڕۆژنامەکانی لەدەست وەرگرت و پێی گوتن: 'ئێستا نا، دوای دەوام، ئەگەر تاقەتی خوێندنەوەتان هەبوو وەرن و لێرە بیخوێننەوە، ئەگەر قەولم پێ ئەدەن، لەگەڵ خۆتاندا نەیبەن!'
دوای ئەوەی حەمەسەعید ڕۆژنامەکانی خستەوە جێگەی خۆی، لە بەرباخەڵیدا کتێبێکی دەرهێنا و بەرەو ڕووی قادر ڕایگرت و گوتی:

'ئەوە کتێبێکی کاک عەبدوڵڵا تۆفیق جەوهەرە و بە ناونیشـانی ئاوات، کە لە لایەن میرییەوە یاسـاغ کراوە، ئەتوانن بیخوێننەوە و دوایی بۆم بگەڕێننەوە. بە مەرجێک نیشانی کەسی تری نەدەن.'

هەرچواریـان بێدەنـگ بوون، تەنیـا ئەوەنـدە نەبێـت سـەری ڕەزامەندییان بۆ لەقاند، قادر کتێبی ئاواتی لێ وەرگرت و خسـتییە ژێر کراسەکەی. پاشان بە دوای یەکدا بۆ حەوشەی قوتابخانە چوون.

لەو ڕۆژانەدا لە ناو خەڵکی شـاردا خوێندنەوە، وەکوو خۆیـان دەیانگوت؛ خۆپەروەردەکردن، بووبووە باو. ئەگەر هەندێک شانازییان بە بنەچەی بەگ و شـێخ و حەفیدزادە، هەروەها بابانییەوە دەکرد، ئەوا زۆرینەی لاوەکان ئەوەیان دەزانی یان ئەوە درابوو بە گوێیاندا؛ ئەگەر خۆت پەروەردە بکەیت فەرقی نێوان منداڵی شـێخ و گەدا و کرێکارێک نییە و دەتوانیت بە هیوا و مەبەسـتی خۆت بگەیت، یان جێگەیەکی دیار لە نێو کۆمەڵگەدا دەگریت.

ئەم قسـانە ڕۆژانە لە نێو چایخـانە و کۆڕ و کۆبوونەوەکـاندا دەگوترانەوە. بە تایبەتی ئەو کەسـایەتی و گەنجانە هەوڵیان دەدا یان بە پێویسـتیان دەزانی هەموو کەسـێک بخوێنێتەوە. کە بیروباوەڕی چەپگەراییان هەبوو، هەروەها وەکوو پەتایەکیش لە شـاردا مەلا و شێخ، هەروەها سۆفی و فەقێکانیشی گرتبووەوە.

لەو ڕۆژانەدا مـامۆسـتـا فوئاد ڕەشـید بەکر، کە بەڕێوەبەری قوتابخانەی ئەیووبییە بوو، لە چەند پۆلێکدا لە قوتابییەکان دەپرسێت: 'ماڵی کامتان کتێبی تێدایە، دایک و باوک یان برا و خوشـکی کامتان کتێب ئەخوێننەوە؟'

لە زۆربەی پۆلەکاندا، زۆرینەی قوتابییەکان دەست بەرز دەکەنەوە.

قادر بە باوکی دەڵێت: 'باوکە هەموو هاوڕێ و هاوپۆلەکانم بێجگە لە کتێبەکانی قوتابخانەمان؛ کتێبی تریش ئەخوێننەوە، تەنانەت هەندێکیان دایک و باوک و کەسوکاریشیان خوێندەوارن، لە سایەی سەری کتێبخانەکەی تۆ و کاکە غەفوورمدا. من لە هەموویان موعلووماتم زیاترە.'

ڕۆژی دوای ئەو ئێوارەیە، کە جەلال بە دڵشکاوی ڕۆژنامەکەی دایە دەستی باوکی، لەرزوتایەک دایگرت و نەچووەوە بۆ قوتابخانە. شەو تاوەکوو بەیانی خەوی لێ نەدەکەوت و تەنیا بەماڵەکەدا دەگەڕا. بە شەو دەچووە حەوشە و کۆڵان، لە بەر خۆیەوە بانگی لە جەمالی برای دەکرد. حەلاوەخانیش بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە بە دوایەوە بوو، کە مردنی جەمالی کوڕی هێشتا ساڵێکی بە سەردا تێنەپەڕیبوو.

میرزا کەریم ئێوارەی ئەو ڕۆژە چوو بە دوای حەمەسەعیدی فەڕاشدا و چیرۆکەکەی تێگەیاند و هێنای بۆ ماڵی خۆیان. پێکەوە بۆ ژوورەکەی خۆی چوون. جەلال بە درێژایی ئەو ڕۆژانە لەسەر دۆشەکێک ڕاکشابوو، مالیکیش بە تەنیشتییەوە بوو. کاتێک حەمەسەعیدی بینی، خۆی کۆ کردەوە و ڕاست لەسەر جێگەکەی دانیشت. میرزا کەریم گوتی: 'ئەوە چییە ڕۆڵە، بە هەڵە تێ نەگەیشتبیت و فەڕاشت لێ بووبێت بە موعەلیم!'

دوای ئەوەی کە بەم قسەیە پێکەنین، حەمەسەعید دەستی کرد بە گیرفانیدا و دوو پارچە حەڵوای لە گیرفانی دەرهێنا، دانەیەکی بەرەو ڕووی جەلال ڕاگرت و پێی گوت: 'هەرچی منداڵێک حەزی لە

خوێندنەوە بێت، بەخشـــیش وەردەگرێت و ئەبێت دەمی بەم حەڵوا خۆشە شیرین بکات.'

ئـاوڕی دایەوە و پـارچە حەڵواکەی تری دایە دەســـــتی قـادر، کە لەگەڵیاندا هاتبووە ژوورەوە و لە پشتیانەوە ڕاوەستابوو.

جەلال هیچی نەگوت و حەڵواکەی لە ناو دەسـتدا بوو، بەردەوام بە چاوی تەڕەوە لە باوکی دەڕوانی، پاشــــان میرزا کەریم پێی گوت: 'دەی کوڕم حەڵواکەت بخۆ.'

میرزا کەریم سـەری لێ ڕاوەشـاند و دەسـتی برد و حەڵواکەی لێ وەرگرت، پاشان لە نێوان جەلال و مالیکدا دابەشی کرد.

دوای ئەوە حەلاوەخان خوڵقی حەمەســـەعیدی کرد و نەیهێشـــت بڕوات. لە کـاتی نـانخواردنـدا جەلال و مـالیـک لە لای ڕاســـت و چەپی فەڕاشـــی قوتابخانەوە دانیشـــتبوون و پێکەوە نانیان دەخوارد. حەلاوەخان لە شـــانی جەلالەوە بوو. تاوەکوو ئەو ڕۆژە و ســـالانێک دواتریش... قاپێکی بەتاڵی فافۆنی بۆ جەمالی جوانەمەرگ لە نێوان جەلال و مالیکدا دادەنا.

# ٥

سەردەمی منداڵی و هەرزەییم تێپەڕی و من هەر لە بوون و نەبوونی مام زامن نەگەیشتم، تەمەنم چوار ساڵان بوو، کە بە ڕێکەوت ڕێگەم کەوتە سەر دووکانەکەی، باشترە بڵێم؛ماڵی مالیکی ئامۆزام ئاوەدانبێت. ئەو ڕۆژەی مام زامن شوێنبزر بوو، تەمەنم بیست و هەشت ساڵ بوو، کە بە دڵشکاوی ئەو شارەم بەجێ هێشت.

ئەوسا هەندێک جار لە خۆم دەکەوتمە گومانەوە، ئەو پرسیارەم بە خەیاڵدا دەهات، کە تۆ بڵێیت من کەسێکی تەواو بم، چونکە ڕۆژ هەبوو ڕێگەم نەدەچووەوە سەر دووکانەکەی، وام دەزانی وەکوو نێو گیرفانی شەرواڵەکەم شارەزای گەڕەکی مەڵکەندیم، لەو ڕۆژەوە زیاتر گومانم لە لا دروست بوو، کە بە میرزا کەریمی باوکمم گوت: 'مام زامنی نوقڵفرۆش پێی داوم!'

ئەمەم پێ گوت، لە کاتێکدا ئەو لێ پرسیم: 'ئەرێ جەلال ئەوە چی ئەخۆیت، زووزوو دەست ئەکەیت بە گیرفانتدا و شتێک ئەخەیتە دەمتەوە؟'

ناوی دووکانی مام زامنم هێنا و پاشان پێم گوت: 'مام زامن بەخۆڕایی پێی داوم.'

ئەو بە سەرسوورمانەوە پێی گوتم: 'مام زامن؟ بۆ، دووکانی مام زامن لە کوێیە؟'

ناوونیشانەکەیم پێ گوت، لە وەڵامدا پێی گوتم: 'کوڕە جەلال تۆ بۆ شــێتم ئەکەیت، ئەو شــوێنەی تۆ ئەیڵێیت، کەی دووکانی لێیە! ئەوەماڵی فلان و فیسارە. کەی لەو کۆڵانەدا دووکانی لێیە.'

'ئەی چۆن نـازانیـت، دووکـانی مـام زامن دەرگەیەکی دووتـاکیی گەورەی کۆنی لە دار دروست کراوە!'

لە ڕاســـتیـدا هەموو جـارێـک مـام زامن چنگێـک نوقڵی دەکردە دەسـتمەوە، بێ ئەوەی جارێک داوای پارەم لێ بکات، لە نێو دەسـتمم دەڕوانی و نوقڵەکانم دەژمارد، یان با بڵێم لە ڕەنگەکانیانم دەڕوانی، سـەیری شـووشـەکانی سـەر ڕەفەکانم دەکرد، کە حەوت شـووشـە بوون، دیســـان نوقڵەکانی نێو دەســـتم لەگەڵ ڕەنگی نوقڵەکانی نێو شـــووشـــەکـان بەراورد دەکرد، جـارێک نەبوو لەو حەوت ڕەنگە دانەیەکی کەم بێت، منیش تەنیا لە ژێر لێوەوە ســوپاســم دەکرد، مام زامنیش وەکوو هەموو جارێک دەیگوت: 'بەشـی خۆتە، جەلال بەشـی خۆتە!'

ئەو ڕۆژەی لەگەڵ باوکم لە باس و خواسـتی دووکانەکەی مام زامندا بووین، من تەمەنم هەشت ساڵان بوو، ئیتر ئەو وەکوو پیشەی هەموو جارێکی لێم کەوتە گومان و پێی گوتم: 'گوێ ڕووت، ئێســـتا پێشـــم بکەوە و دووکانی مام زامنەم نیشان بدە!'

لێم توورە بوو، بە دەســـتە گەورە و بەهێزەکانی توند دەســـتی ڕاســتمی گرت و گوشـیی، لەوە زیاتر قسـەی نەکرد، ئەگەر باش لە بیرم مابێت، گوتی: 'بۆ نوقڵ بە بەلاش ئەدات بە تۆ، کێ نـاڵێت ئەو مام زامنە منداڵباز نییە!'

لەو کاتەدا مامە مســـتەفام پەیدا بوو، پێش ئەوەی بگاتە لامان لە دەرگەی حەوشەکەوە بانگی کرد: 'چییە کاکە؟ چی قەوماوە؟'

باوکم کاتێک گوێی لە دەنگی مامە مستەفا بوو، وردە وردە دەستی شل کرد، کاتێک دەستم لە ناو دەستی دەرهێنا، پێستی دەستم سپی هەڵگەڕابوو، هەرپێنج پەنجەکەم پێکەوە نووســابوون، پاشــان دایکم هات و لەگەڵ مامە مســتەفادا قســەیان لەگەڵ باوکمدا کرد، کە دایکمم بینی، دەستم کرد بە گریان، بەڵام باوکم کۆڵی نەدا و پێش خۆیی دام و پێکەوە بۆ گەڕەکی مەڵکەندی چووین. لە نیوەی ڕێگە هەســتم بەوە کرد، کە مــالیکی ئـامۆزام دووراودوور دوامــان کەوتبوو. وا بزانم باوکم هەستی بەوە نەکردبوو.

تاوەکوو گەیشـــتینە ئەو کۆڵانەی دووکانەکەی مام زامنی لێ بوو، بێبـاکـانە پێشـــی کەوتبووم، هەســـتم کرد ئەویش بە دەم ڕێگەوە دەیویســـت دڵنەواییم بکا، پێی گوتم: 'جەلال گیان، باوکی خۆشـــت حەزی لە نوقڵە، پارەم زۆر پێیە و پێکەوە بە دڵی خۆمان نوقڵ لە مام زامن ئەکڕین!'

چەند جارێک ئەوەی لە بەر خۆیەوە گوتەوە، کە گوایە لەوە ناگات، بۆچی ئەو مام زامنە هەموو جارێک چنگێک نوقڵ بە خۆڕایی بە من دەدات!

نـازانم چ وەڵامێکم دایەوە، بەڵام ئەوەنـدەم لە بیرە کە پەلەم بوو زوو بگەین و دووکانەکەی مام زامنی نیشـان بدەم و لەدەسـت باوکم نەجاتم ببێت. ڕۆژانە چاودێریی من و مالیکی ئامۆزامی دەکرد، یان باشـــترە بڵێم کاکە عەزیزمی کردبوو بە چاودێرمان. ئەوەی ڕاســـتی بێت، کاکە عەزیز دەیزانی ڕۆژانە چی دەکەین و بۆ کوێ دەچین، لێم

دەپرســیی کاکە عەزیز تۆ چۆن دەزانیت، ئەویش لە وەڵامدا دەیگوت: 'چۆلەکەکانم بۆم ئەگێڕنەوە!'

ئیتر ئێمەش نەمـانـدەوێرا درۆی لەگەڵ بکەین، کـاتێـک مـالیکی ئامۆزام لەو قسەیە گەیاند.

مـالیک ڕۆژی دوایی دارلاســـتیکێکی دروســـت کرد و گیرفانی شەرواڵەکەی پڕ کردبوو لە خڕەبەرد و دەستی کرد بە چۆلەکەکوشتن. تەنـانەت ئەو توورەکە بچووکەی پێشـــتر بـاوکی مـالیک تووتنی تێ دەکرد، مـالیک لێی شـــاردبووەوە و هەڵماتمـان تێدا هەڵگرتبوو، لە مـاوەی دوو ڕۆژدا هەموو هەڵمـاتەکانی گرتنە چۆلەکەکـان. ئـامـاژەی بەوە دەکرد، کە ســەد چۆلەکەی کوشـتووە، چوار پەنجەرە و ســەری چوار کەسیشی شکاندبوو. لەسەر ئەوە لە منیشیان پێچایەوە.

ئەگەر بگەڕێمەوە ســەر باســەکەمان، کاتێک لەگەڵ باوکم گەیشـتینە گەڕەکی مەڵکەنـدی و کۆڵانی دووکـانەکەی مـام زامن، ئەو گوتی: 'فەرموو پێم بڵێ کوا دووکانی مام زامن؟'

وەکوو باوکم لە ماڵەوە پێی گوتم، لەو کۆڵانەدا تەنیا دەرگەی دوو ماڵی لەســـــەرە، دەســـــتی یەکـیەک بۆ دەرگەکان درێژ کرد و گوتی: 'ئەوە ماڵی حازم بەگە و ئەوەی ئەو بەریش، ماڵی شـــێخ حەســـەنی حەفیدە.'

منیش لەپێش ئەوەوە بەو کۆڵانەدا ڕام دەکرد. دەچوومە کۆتـاییی کۆڵانەکە و چاوم هەڵدەگلۆفین و دیســـان لەدەســـتی ڕاســت و چەپم دەڕوانییەوە. پاشـــــان باوکمم بۆ کۆڵانەکانی تری گەڕەکی مەڵکەندی برد، بەڵام هەرچییەکم کرد ڕێگەم نەکەوتەوە ســەر دووکانەکەی مام زامن.

من ڕام دەکرد و ئەو بەدوامەوە بوو. پاشان پەلاماری دام و گوێی گرتم، کاتێک دەستی لێ بەرز کردمەوە، لەناکاو مالیک خۆی خستە نێوانمانەوە، نازانم لە کوێوە پەیدا بوو، شەپازلەکە کێشای بە لاملی ئەودا، مالیک ئەوە یەکەم جار و دواجاری بوو لێدان بە دەستی یەکێک لە کەسوکاری بخوات، بەتایبەتی بە دەستی باوکم، کە زۆر جار بەخیلیمان پێ دەبرد و من و قادری برام دەمانگوت: 'باوکم مالیکی لە ئێمە خۆشتر ئەوێت.'

مالیکیش ئەوەی دەزانی و کاتێک لە من توورە دەبوون، ئەو دەهاتە بەردەمی من و ڕاست دەوەستا و دەیپاراستم. دوای ئەمە مالیک منی لە دەستی باوکم ڕزگار کرد و پێکەوە بە ڕاکردن بەرەو گەڕەکی سەرشەقام گەڕاینەوە. باوکم بە پێی ئێمە ڕانەدەگەیشت. کاتێک گەیشتینەماڵەوە، دایکم و تەنانەت مامە مستەفاشم تێگەیاند. بە بیرم دێت، پێش ئەوەی باوکم بگات پێم گوتن: 'میرزا کەریم شەپازلەیەکی بەبنە گوێی مالیکدا کێشا، حەوت هەنگاو پەڕاندی، سەری بوو بەژێر لاشەیەوە و ملی شکا، کاتێک ویستی لە منیش بدات، مالیکم هەڵساندەوە و دەستیم گرت و بەدوای خۆمدا ڕامکێشا، ئێستاش بە دوامانەوەیە، ئەگەر نەمانشارنەوە ئەمانکوژێت!'

مالیک لەو کاتەدا لەشانمەوە ڕاوەستابوو، دەستێکی بە ڕوومەتییەوە و بە دەستەکەی تری فرمێسکەکانی دەسڕی، هەرچەند هەوڵیان لەگەڵ دا، نەیانتوانی دەستی لە ڕوومەتی بکەنەوە. مام مستەفام لێی پرسیم: 'ئەمە کاکم لەسەر چی لێتان توورە بوو؟'

'نوقڵ!'

'نوقڵی چی؟'

کاتێک غەفووری برام ئەوەی گوت، هاتبوو لە پشـــتی دایکمەوە ڕاوەستابوو، منیش لێم ڕوانیی و گوتم: 'من نوقلم پێ بوو، باوکم لێی پرسیم ئاخۆ لە کوێم بووە، دەی خۆ منیش ڕاستییەکەم پێ گوت، کە مـام زامن بە خۆڕایی پێی داوم، کەچی بە زۆر پێش خۆیی دام بۆ گەڕەکی مەلکەندی، کاتێک ڕێگەم نەکەوتەوە سـەر دووکانەکەی، ئیتر لێم تووڕە بوو!'

مامە مســتەفام پرسـیی: 'دەی مالیک حەقی چی بوو بە سـەر ئەو بێنەوبەردەیەی تۆ و باوکتەوە؟'

کاکە غەفوورم هاتە پێشەوە و دەستی خستە سەر شانم و گوتی: 'ئیتر وەکوو هەموو جارێک... شـــەپازلەکەی باوکم ویســـتی لە تۆی بدات بە ڕێکەوت دای بە لاملی مالیکدا.'

'ئەوە لە مالیک خۆی بپرسە!'

'ئینجا جەلال، خودا مالیک بۆ تۆ بهێڵێت، ئەو کوڕە ئەوەندە قەدری تۆی لایە، زمانیشی هەبووایە هەر پشتی تۆی ئەگرت.'

کاتێک کاکە غەفوور لەو قسانەی بووەوە باوکم پەیدا بوو، ژنێک و کوڕ و کچێکی هەشـــت بۆ نۆ ســـالانی لەگەڵدا بوو، منداڵەکـان... یەکێکیـان بە ژنەکە و کوڕەکە، کە لە تەمەنی من و مـالیکدا بوو، بە باوەشی باوکمەوە بوو، من و مالیک چووبووین لە پشتی حەلاوەخانی دایکمەوە وەســتابووین، ئیتر کەس باســی لێدانەکەی مالیکی نەکرد و باوکم گوتی: 'ئەو شـــارە پڕ بووە لە لێقەوماو، منیش گوتم با ئێمەش پەنای خێزانێکیان بدەین!'

'لێقەوماو؟ لە کوێوە هاتوون؟' دایکم پرسیی.

'جوون و لە بەغداوە هەڵاتوون، خۆ وا بزانم ئەو ژنە قوڕبەســەرە ئەوەندە ترساوە قسەشی لە بیر چووەتەوە.'

'دەی با بڕۆن بۆ گەڕەکی جوولەکان!'

کاتێک کاکە غەفوور ئەمەی گوت، حەلاوەخانی دایکم چوو کچەکەی لە باوەشی ژنەکە وەرگرت و دەستی گرت، پاشان ڕووی لە باوکم و کاکە غەفوور کرد و گوتی: 'بە خودا جوانە، مادام پێیان ناوەتە حەوشەی ئەم ماڵە، ناهێڵم بە هیچ لایەکدا بڕۆن.'

لە دوای ئەمەوە کەس هیچی نەگوت، هەموو پێکەوە بە دوای یەکدا چوونە ژوورەوە، من و مالیک لە دواوە لێمان دەڕوانین، مالیک هێشتا دەستی لەسەر ڕوومەتی لا نەبردبوو، دەستەکەی تری کرد بە گیرفانی شەرواڵەکەیدا و چنگێک نوقڵی دەرهێنا، دانەیەکی خستە دەمی و زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و دەستی بەرەو ڕووم ڕاگرت. کاتێک نوقڵێکم لە مالیک وەرگرت، منداڵە جووە هاوتەمەنەکەی ئێمە کە لەگەڵ باوکمدا هاتبوو، هات و بەرامبەرمان ڕاوەستا و بێدەنگ لێی ڕوانیین. مالیک دەستی بەرەو ڕووی کردەوە و ئەویش بە شەرمەوە دەنکێک نوقڵی لێ وەرگرت و خستییە دەمی. دوو هەفتە لە ماڵی ئێمە مانەوە، ئەو ڕۆژانە من و مالیک لەگەڵ ئەو کوڕەدا، کە ناوی حسنا بوو، بێدەنگ بە دوای یەکترەوە بووین و پەیوەندی نێوانمان تەنیا بە ئاماژە بوو. بەیانییەک من و مالیک لەخەو هەستاین، حەسنا ڕۆیشتبوو، ئیتر ئەویشمان وەکوو جەمالی برام نەبینییەوە.

## ٦

ئێوارەی پێش ئەو ڕۆژەی مام ســمایلی باخەوان کوژرا، زیاتر لە دە پیاو هەردوو دەرگەی باخەکەی ســەید حەســەنیان لە گەڕەکی سەرشەقام لە دەڵەسەگێک گرتبوو. زەردەڵەیەکی باریکەڵەی لۆقدرێژ بوو، گوێقووت و چاوتەڕ، کلکی لە ناوگەڵی نابوو، گوانەکانی بۆر و شۆڕ بووبوونەوە.

کاتێک پیاوەکان بە دار و بەردەوە لە دوو لاوە وەستابوون، جەلال و مالیک، لەگەڵ دوو هاوڕێی تریاندا، یاســین حەمەســالح و وەهاب ســالح کۆیی، کە لە قوتابخانەی ئەیووبییە و گەڕەک بەردەوام پێکەوە بوون، لەســەر دیواری باخەکە بوون و لێیان دەڕوانین. ســەگەکە هەموو سەر و گوێلاکی سپی بوو، وەک سەری بە گوێنییەک ئاردا کردبێت. لە ناوەڕاستدا بە لا چاو لە پیاوەکانی دەڕوانی و جووڵەی لە خۆی بڕیبوو، پیاوەکان لەسەر نووکی پێ و بە هێواشی ڕێیان دەکرد، بە پســکە پســک یەکتریان دەدواند. لە یەک کاتدا بە چاو یەکتریان ئاگادار کردەوە، هێرشــیان برد، دار و بەردەکانیان لە ناو دەســتیان توند گرت. لە دوورەوە بەردەکانیان گرتە دەڵەسەگەکە، ئەویش وەک واقی وڕ مابێت، لە شــوێنی خۆی نەجووڵا و خۆی لە بەردەکان لا نەدا. لەو کاتەدا سەگەکە لە جەلال و مالیک و هاوڕێکانیانی دەڕوانی، بە ڕێکەوت خڕە بەردێک بەر ســەری کەوت و بێ ئەوەی نووزەی لێوە بێت، لە شوێنی خۆی کەوت، پاشان پیاوە داربەدەستەکان هاتنە سەری، تاوەکوو جووڵەی لێ بڕا داریان پێدا کێشا. پڕیشکی خوێن بە

دەرلنگی شەرواڵ و دار و تەیمانی باخەکەوە بوو. بە جۆرێک دەتگوت خوێن باریوە، پیاوێکیان هاواری دەکرد: 'هەی سەگی دز، دە بیخۆ دەی، ئاردی ماڵی فەقیروهەژار ئەخۆیت.'

جەلال و هاورێکانی، دەمیان داچرپیبوو، چاویان زەق و تەڕ، توند دەستیان بە لێواری دیوارەکەوە گرتبوو، هەناسەیان لە خۆیان بڕیبوو.

پاشان پیاوێک بە دەستەسرەکەی بەرباخەڵی کلکی گرت و تاوەکوو سەر شیوەکەی جوولەکان ڕایکێشا، پاشان بە نووکەپێی فڕێی دایە ناو شیوەکەوە.

درەنگانێکی شەو، دوو پۆلیس بە گەڕەکی سەرشەقامدا دەگەڕێن و بۆ پشوودان دەچنە باخەکەی سەید حەسەن، لە بەر ڕووناکیی گڵۆپەکاندا ئاسەواری خوێنەکە دەبینن و لە مەخفەر لێپرسراوی خۆیانی لێ ئاگادار دەکەنەوە.

ڕۆژی دواتر تاریکوڕوون سێ پۆلیس بە دوای مام سمایلی باخەوانی باخەکەی سەید حەسەندا دەنێرن، بەڵام پۆلیسەکان تاوەکوو دوای نیوەڕۆ ڕێکەوتی مام سمایل ناکەن.

مام سمایلی باخەوان، دوو ساڵ دەبوو لە شاری بانەوە بۆ سلێمانی هاتبوو، لەگەڵ باخەوانیی باخەکەی سەید حەسەندا، ئیشی ناترییشی لە حەمامی موفتی دەکرد. بە شەویش لە خانەکەی ماڵی میرزا کەریم دەنووست.

پۆلیسەکان کاتێک لە بەردەم خانەقای مەحویدا ڕێکەوتی مام سمایل دەکەن، یەکێکیان پێی دەڵێت: 'تۆ لە کوێیت گەواد؟ ئەو شارەت بە دوادا گەڕاین!'

مام سمایل، کە گوێی لەمە دەبێت، دەست ڕادەوەشێنێت: 'کوڕە فلتەفلت! حەیتەی بێفەڕ، خۆتان گەوادن.'

دەگەڕێتەوە و خاکەنازەکەی دەستی بەرز دەکاتەوە و بەرەو ڕوویان دەڕوات. یەکێک لە پۆلیسەکان فیشەکێکی پێوە دەنێت. کە دواتر لە مەخفەری پۆلیس دەڵێت، لەدەستم دەرچووبوو، فیشەکەکە بەر سینگی کەوتبوو. کاتێک هاتبوونە سەری هێشتا ڕۆحی تێدا مابوو، وەک لە هەستانەوەی ئەو پیاوە سیس و زەردەڵەیە بترسن، لوولەی سێ تفەنگیان تێ کرد و بە سەریەوە ڕاوەستان تاوەکوو گیانی دەرچوو. کاتێک پۆلیسەکان ڕۆیشتن و دووکاندارەکان هاتنە سەر لاشەکەی، خوێنەکەی بە سەکۆکەوە تا سەر شەقامەکە جۆگەلەی بەستبوو.

یادەوەریی جەلال:

لەبەر ئەو باران و سەرمایەدا هەڵدەلەرزی، ئەوەندە خۆی گرمۆڵە کردبوو، بە هەمووی چنگێکی مابووەوە، لە بن دیواری ماڵی حەمەقادری چایچیدا بوو. من و مالیک بە لایدا تێپەڕین، لە دوامانەوە گوێم لە دەنگی بوو، نووزەنووز، وەکوو بانگ لە یەکێک بکات.

ئەوسا من و مالیک تەمەنمان حەوت ساڵان بوو، ئەگەر بڵێم گوێم لە ناوی خۆم بوو: 'جەلال، جەلال.' بە ناوی خۆمەوە بانگی دەکردم. ئەوا درۆ ناکەم. کاتێک گەڕامەوە مالیک ئاگای لە من نەبوو، ئەو منی لەو تاریکییەدا بەجێ هێشت. هەرچەندە هەموو سەردەمی منداڵیم بە

پشتیوانیی مالیک بە شەودا لە دەرگەی ماڵەکەمان دەچوومە دەرەوە، چونکە ئەو بێجگە لەوەی زۆر باشتر لە من لە تاریکیدا دەیبینی، هیچ ترسیشی لە دڵدا نەبوو.

بە ترسەوە لە دواوە لە مالیکم ڕوانی و پاشان بۆ ئەو جێگەیە چووم کە دەنگەکەی لێوە دەهات، کاتێک دۆزیمەوە و بە سەریدا دانەویبوومەوە، ڕاچڵەکیم و هەڵسامە سەر پێ. ئەوە بوو مالیک بە دوامدا گەڕابووەوە و بێدەنگ دەستی خستبووە سەر شانم. دووبارە چیچکەم کرد و لێی نزیک بوومەوە، دەستم برد، هەڵمگرت و لە باوەشم گرت. لە سەرماندا هەڵدەلەرزی، خێرا خستمە ژێر پاڵتاوەکەم، بەڵام مالیک توند شانی گرتبووم و سەری لێ ڕادەوەشاندم.

لە بەردەم دەرگەی ماڵەوە ڕاوەستابووین، زۆرم پێ چوو تا مالیکم ڕازی کرد، کە لەگەڵ خۆماندا بیبەینە ژوورەوە. لە چوونەژوورەوەدا وەکوو دوو دز، لەسەر نووکی پێکانمان دەڕۆیشتین، تاوەکوو گەیشتینە ژووری نووستن. پاشان لەناو نوێنەکاندا شاردمانەوە، وەک ئەویش بزانێت... نووزەی لە خۆی بڕیبوو. کاتێک نووستین ئەو لە نێوان من و مالیکدا بوو.

بەیانی ڕۆژی دوایی لەخەو هەستاین، هەموو ماڵەکەی بە دوادا گەڕاین و نەماندۆزییەوە، ماڵی ئێمە و مام مستەفام هەمووومان لەسەر سفرە دانیشتبووین، مەحموودی مام مستەفام و برای مالیک نانی گەرمی هێنابوو، لەگەڵ قەیماغ و ماست و هەنگوین لەسەر سفرە دانرابوون.

هەموو بێدەنگ بووین و تەنیا گوێت لە دەنگی شێواندنی پیاڵە چاییەکان بوو، لە ناکاو، تووتەڵە سەگەکە لەو سەرەوە، بە سەر سفرەکەدا بە ڕاکردن بەرەو ڕووی ئێمە هات. من و مالیک لە کۆتاییی

سفرەکەدا بووین، بوو بە هەرا... پاشان لە بەردەم مالیکدا دەمی نایە ناو جامێک ماستەوە. باوکم ویستی بیگرێت، دیسان بە سەر سفرەکەدا گەڕایەوە، کە هیچ لە جێگەی خۆی نەما و بوو بە هاوار و پێکەنین. بێجگە لە باوکم و مامە مستەفام کە تووڕە بوون و هاواریان دەکرد، ئەری ئەوە لە کوێوە هاتووەتە ژوورەوە. ئەوەندە گورج‌وگۆڵ بوو، بە کەس نەدەگیرا. بێجگە لە دایکم، هەموومان بە دوایەوە بووین. سفرەکەمان سەروژێر بووبوو.

دوای ئەوەی کاکە غەفوورم پشتە ملی گرت و بردییە دەرەوە، باوکم گوێی من و مالیکی گرت و لێی پرسیین: 'ئەوە ئیشی ئێوەیە.'

من هیچم نەگوت و تەنیا سەرمان لە باوکم ڕاوەشاند.

پاشان دایکم هات و لەدەست باوکم ڕزگاری کردین، پێی گوت: 'میرزا ئەوە خەتای من بوو، لە بیرم چووبوو دەرگەی دالانەکە دابخەم و ئەوە برسییەتی و بۆنی نانی گەرمی کردووە... بۆیە هاتووەتە ژوورەوە.'

کە چووینە دەرەوە، کاکە غەفوورم، جامێک ماستی لە بەردەمی دانابوو، بە دیارییەوە چیچکەی کردبوو، لە ئێمەی ڕوانی و گوتی: 'ئەوە لە کوێتان بوو؟' لەو کاتەدا باوکم لە پشتمانەوە بوو، منیش سەیری باوکمم کرد و هیچم نەگوت. کاتێک باوکم ڕۆیشت، کاکە غەفوورم گوتی: 'جەلال ناوی چییە؟'

'جەمال.'

کاتێک ئەمەم گوت کاکە غەفوورم ماسولکەکانی دەموچاوی هێنانەوە یەک، مالیک شانی گرتم و پاشان لەویشم گەیاند.

'جەلال، نەخەڵەتابیت ئەوە بە دایکم بڵێیت، کە ئەو توتەڵەسەگەت بە ناوی جەمالی جوانەمەرگەوە ناو ناوە، تێم گەیشتیت؟'

'بۆچی کاکە؟ خۆ دایکم جەمالی خۆشەویست!'

'حەتمەن، بەڵام نەزانێت باشترە.'

شەو کاتێک لەژێر جێگەکەمدا لێم دەڕوانیی... چاو و دەم و لووتی وەکوو جەمالی جوانەمەرگی برام هاتە پێش چاوم.

بە کاکە غەفوورم گوت: 'جەمال هەتیوە، چونکە دوێنێ لە باخەکەی سەید حەسەن دایکیان کوشت.'

٧

ئەو بەیانییە زوو دایکم و پوورەکانم بە نیاز بوون بۆ سەرگۆڕی جەمالی برا بچووکم بچن، کە هەموو هەفتەیەک دەچوون. هەرچەندە دایکم هەوڵی لەگەڵ من دەدا، وەک هەموو جارەکانی تر، خۆمم لێ دەشاردەوە و بۆ سەرگۆڕی جەمال نەچووم. ڕۆژی پێشوو لێم تووڕە بوو، لەسەر ئەوەی بۆچی ئەو تووتەڵەسەگەم ناو ناوە جەمال. ئەوە نهێنییەک بوو، تاوەکوو ئەمڕۆش لای کەس باسم نەکردووە.

کاتێک دایکم و ئەوان گەڕانەوە؛ وەکوو هەموو بەیانییەک شەلەمۆ عەزیز، کە میرزا کەریمی باوکم پێی دەگوت خواجە شەلەمۆ، خۆی یان دەرویش عەزیزی خزمەتکاری هەردوو کچەکەی، گەلاوێژ و پەخشانیان، دەهێنانە ناو حەوشەکەی ماڵی ئێمە، تاوەکوو ڕادەستی حەلاوەخانی دایکمیان نەکردنایە، خۆیان بۆ دووکان لە قەیسەری نەقیب نەدەچوون.

ئەو دوو کچە، وەکوو دوو چۆلەکە بێدەنگ لەسەر سەکۆی حەوزەکە دادەنیشتن، پاشان سدیقی عەلی ئاغای عەرەبانچی دەهات و بۆ مەکتەبی زەهرای کچانی نزیک باخی گشتیی دەبردن. من و مالیک هەموو ڕۆژێک پێش هاتنی ئەوان لە حەوشەکە بووین و چاوەڕێمان دەکردن، دەچووین بەرامبەریان ڕادەوەستاین و دەستمان لەسەر سینگمان هەڵدەپێکان و بێدەنگ لێمان دەڕوانین. کاتێک سدیقی عەرەبانچی دەهات بە دوایاندا، تا کۆتاییی گەڕەکی سەرشەقام بە

دوای عەرەبانەکەدا ڕامان دەکرد، گەلێک جاریش دەستمان بە عەرەبانەکەوە دەگرت، یان خۆمان پێدا هەڵدەواسی. گەلاوێژ و پەخشان ئاوڕیان لێ دەدایەوە و پێدەکەنین، کە وا بزانم ئەوە تەنیا مەبەستی ئێمە بوو.

هەفتەی جارێک و بە تایبەتی ڕۆژی یەکشەممان پیرۆزە بنیامین یاقووبی ژنی شەلەمۆ کچەکانی دەهێنا، دوای ئەوەی کچەکانی بۆ قوتابخانە دەچوون، خۆی تاوەکوو نیوەڕۆ لای حەلاوەخانی دایکم دەمایەوە. پیرۆزە لەگەڵ دایکم درووومانیان دەکرد و هەندێک جاریش دەردەدڵی خۆی لای دایکم دەکرد و ئەوەی نەدەشاردەوە، کە غەریبیی شاری هەڵەبجە دەکات.

خۆم بە دیاریانەوە بووم، کە پیرۆزە بە دایکمی گوت: 'بۆچی ڕووناکی کچت نانێریتە ئەو مەدرەسەیە؟'

'ئەوە چۆن چۆنییە؟ بە کەڵکی ئەوە دێت، کچەکانمانی بە تەنیا بۆ بنێرین؟'

'دەی خۆ ئەوەندە دوور نییە، بچۆ بزانە!'

ئەو ئێوارەیە دایکم پرسی بە باوکم کرد، ئەویش پێی گوت: 'ئینجا حەلاو بۆ ناچیت بزانیت چۆن مەکتەبێکە.'

ڕۆژی دواتر، کاتێک سدیقی عەلی ئاغای عەرەبانچی بە دوای کچەکانی شەلەمۆدا هات، دایکم دەستی ڕووناکی گرت و سواری عەرەبانەکە بوو، وا بزانم داوام لە دایکم کرد لەگەڵیان بچم، بەڵام ڕازی نەبوو، پاشان وەکوو هەموو ڕۆژەکانی تر من و مالیک خۆمان بە پشتی عەرەبانەکەدا هەڵواسی، بەڵام ئەم جارەیان تا بەردەم مەکتەبی زەهرای کچان چووین.

دایکم دەستی گەلاوێژ و پەخشانی گرتبوو، ڕووناکی خوشکیشم لە پێشـــیانەوە دەڕۆیشـــت، لە چوونەژوورەوەدا مالیک نەیوێرا خۆی ئاشکرا بکات، بەڵام من بە دوای دایکمدا چوومە ژوورەوە، گەلاوێژ و پەخشـــان لێمان جیا بوونەوە، مامۆســـتایەک بە ناوی ئیفەلین لە ناو دەرگەکەدا خۆی بە دایکم ناساند. دوای ڕووناکی خوشکم... دەستی بە ڕوومەتی منەوە گرت و بە پێکەنینەوە گوتی: 'بەڵام وا بزانم تۆ بە هەڵە بۆ ئەم قوتابخانەیە هاتوویت!'

'چی بکەم، تکام لێی کرد کە نەیەت.'

ئەوە یەکەم جارم بوو، جەستەم گەرم داهات، لەبەر ئەوەی هەستم پێ نەکەن، بۆ ژوورەوە کووڕەکووڕ دوای دایکم کەوتم.

مامۆســـــتا ئیفەلین، قژکاڵێکی باریکەلە بوو، تەنوورەیەکی کورت و کراســـێکی ســـــپیی لە بەردا بوو، دوای ئەو ڕۆژانە و کە بوو بە هەرزەکـاریش، بەردەوام دەمبینییەوە و لە دوورەوە لێم دەڕوانی و بیری ئەو ڕۆژەم دەکەوتەوە. پـازدە ســــــاڵ دواتر ئەو چووبووە تەمەنەوە و من هەرزەکار و بۆ چالاکیی قوتابییانی شـیوعی بە سـەر مەکتەبەکاندا دەگەڕام، لە گەڕەکی شـێخان چوومە ئەو قوتابخانەیەی ئەو لێی مامۆســـــتا بوو، کە هەر قوتابخانەی زەهرا بوو، ناوەکەیان گۆڕی و بۆ گەڕەکی شـــــێخان گوازرایەوە. هەرچەندە لێی نەڕوانیم، بەڵام ویستم ئەو ڕۆژەی بهێنمەوە یاد، کە بینیم ڕەشپۆشـە، هیچم پێ نەگوت و یادەوەریی ئەو ڕۆژەم لە بیر خۆم بردەوە.

ئیفەلین فەرمووی لێ کردین و بۆ ژووری مامۆســتایان پێشـــمان کەوت، مامۆســـتایەکی باڵابەرزی ڕەشـــتاڵە بە ناوی جەبرییە تەوقەی لەگەڵ دایکم کرد، بە بیرم دێت دایکم نەیزانی چۆن جوابی بداتەوە و تەنیا لێی ڕوانی. پاشـــان یەکـیەک تەوقەی لەگەڵ مامۆســـتاکاندا کرد،

گەلاویژ، عەزیزە، سـەلمە، فەخرییە، پاشـان سـەبرییە حوسـین بەڕێوەبەری قوتابخانەکە.

دایکم دانیشـت، من و ڕووناکیش بە پێوە بووین، بەڕێوەبەر خۆی پێ ناساندین و گوتی: 'دیارە ئەو کچە جوانەت هێناوە لێرە بخوێنێت؟'

پێکەنی و لە منی ڕوانی و بەردەوام بوو، گوتی: 'بەڵام بۆ ئەو کاکەیە جێگەمان نییە.'

دایکم پێکەنی: 'بەڵێ، وا بە نیازین!'

'چاوم لێت بوو دەسـتی ئەو دوو کچە، گەلاویژ و پەخشـانت گرتبوو، خۆ خودانەخواستە، ئێوەش جوولەکە نین؟!'

'نەخێر. بەڵام دەی مەگەر ئەوانیش منداڵ نەبن؟'

'نا نا، تووخودا، بە غەڵەت تێم مەگە. ئێمە پێویستە ئەوە بزانین!'

'نەخێر. ئەزانم.'

'باشـە با واز لەو باسـە بێنین، بۆ داخڵکردنی کچەکەت، درەنگ هێناوتە و ئەوە نیوەی ساڵ تێپەڕیوە.'

'هاتووم بزانم شوێن و ڕێگەتان چۆنە، بەڵکوو ساڵی داهاتوو...'

'مانگی دە، دوای پشووی هاوین، زۆر باشتر ئەبێت.'

کاتێک هەسـتاین، مامۆسـتا ئیفەلین دەسـتی ڕووناکی گرت و پێش دایکم کەوت، تاوەکوو بە قوتابخانەکەدا بیگێڕێت، دایکم بە منی گوت: 'جەلال تۆ بچۆ لە دەرەوە بوەستە، تا ئێمە دێینەوە.'

چوومە بەردەمی و بەشـەرمەوە، لەژێر لێوەوە بە دایکمم گوت: 'دەستی سەرئاوم هەیە، ئێرە ئاودەستخانەی لێیە؟'

دایکم پێکەنی، ڕووی لە ئیفەلین کرد و پێی گوت: 'ئاودەستخانەکان لە کوێن؟'

ئیفەلین دەســـتی لە ڕووناک بەر دا و لەگەڵ خۆی بردمی بۆ کۆتـاییی ڕاڕەوەکە، چۆڵ بوو، هێشـــتـا قوتـابییەکـان هەموو لە گۆڕەپانەکە بوون، بردمییە بەردەم ئاودەستخانەکان و گوتی: 'ئەوەتا، دەستوبردی لێ بکە هەتا کچان نەهاتوونەتە ژوورەوە!'

ســـێ ئاودەســـتخانە بوون بە ڕیزی یەکدا، بە بەراورد لەگەڵ ئاودەســـتخانەکانی قوتابخانەی ئەیووبییە. لە بەرچاوم زۆر پاک و سپی دیار بوون. لە بەردەم ئاودەستخانەکە ڕاوەستابووم و هەرچەند هەوڵم لەگەڵ بەنەخوێنی شـــەرواڵەکەم دا بۆم نەکرایەوە، کە وا بزانم هەمووی دوو هەفتەیەک بوو، داوام لە دایکم کردبوو، بەنەخوێنەکەم لە لاســـتیکەوە بۆ بکـات بە پەت. ئەویش دوای ئەوە بوو، کە لە قوتـابخـانەی ئەیووبییە، ئەو منداڵەی بەنەخوێنی شـــەرواڵەکـانیـان لاستیک بوو گاڵتەیان پێ دەکردن، یان هەندێک جار، بێ ئەوەی ئاگات لە خۆت بێت، لەناکاو شەرواڵەکەیان دەهێنایە سەر ئەژنۆت و هەموو پێت پێدەکەنین. کە لە گۆڕەپانی قوتابخانە ئەوەم بە سەر هاتبوو.

گوێم لێی بوو زەنگی چوونەژوورەوە لێیـدا و من هێشـــتـا بەنەخوێنەکەم بۆ نەکرابووەوە، بە جۆرێـک بووبوو بە گرێکوێرە، توانام بە ســـەریدا نەدەشـــکا بیکەمەوە، کە ئەو دوو هەفتەیە ڕۆژانە ئەوەم بەســـەر دەهات، هەرچەندە قادری برام ڕایهێنابووم و ڕۆژی چەنـد جـارێـک پێی دەگوتم کە چۆن بەنەخوێنەکەم بکەمەوە و بە پەلەپەل نەیکەم بە گرێکوێرە، بەڵام بێسوود بوو.

دوای زەنگەکە، لە ڕاڕەوەکاندا گوێم لە دەنگەدەنگ بوو، دیار بوو قوتابییەکان هاتبوونە ژوورەوە، پزووی شـــەرواڵەکەم هەڵبڕیبوو... خۆم چەماندبووەوە و هەرچەند هەوڵم دەدا ددانم نەیدەگەیشـــتێ، ئەوەندە تەنگەتاو بووم دڵۆپ دڵۆپ میزم بە خۆمدا دەکرد. لەو کاتەدا

لە دەنگێک ڕاچڵەکیم، کە تەنیا چاوم لە پێڵاوەکانی بوو: 'ئەوە چی ئەکەیت لێرە؟'

کاتێک ڕاست بوومەوە و لێم ڕوانی، کچێکی باڵابەرزی قژخاو بوو، جلی ڕەش و سپیی مەکتەبەکەی لە بەردا بوو، بێدەنگ لە یەکمان ڕوانی، تەزوویەک بە گیانمدا هات و دڵم خێرا لێیدەدا، من بەردەوام لێم دەڕوانی، ئەو سەیری تەڕاییی سەر شەرواڵەکەمی کرد و پێکەنی. قورگم پڕ بووبوو لە گریان، ئارەقم کردبووەوە و گیانم دەلەرزی، بە جۆرێک هێزم لە بەر بڕا و ئیتر میزەکەم پێ ڕانەگیرا، لێم هاتبووە پێشەوە و گوتی: 'بەنەخوێنی شەرواڵەکەت بۆ ناکرێتەوە؟'

بێدەنگ بووم و نەمتوانی هیچ بڵێم، وا بزانم تەنیا سەرم لێ ڕاوەشاند. دەستی هێنا و هەوڵی دا گرێکوێرەکە بکاتەوە، پاشان نوشتایەوە و بە ددانەکانی کردییەوە، بەڵام، کاتێک چوومە سەر ئاودەستەکە، تەڕاییم تێدا نەمابوو، هەموو نافەکی شەرواڵەکەم تەڕ بووبوو، زۆر گەرم بوو، نێوگەڵم دەکزایەوە، شەرواڵەکەمم هەڵکێشایەوە و بەنەخوێنەکەمم بەستەوە، کاتێک هاتمە دەرەوە ئەو هێشتا لە جێگەی خۆی ڕاوەستابوو، لێی ڕوانیم و گوتی: 'ئێ دەی گوێی مەدەرێ و خێرا بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە، ئەوە نهێنیی نێوان خۆم و خۆت بێت.'

کاتێک ویستم بڕۆم، کچێکی هاوتەمەنی پەیدا بوو، بانگی لێ کرد: 'بەهار، بەهار.'

منیش بە پاڵیدا بە ڕاکردن بەرەو دەرەوەی قوتابخانەکە ڕۆیشتم، ئەوەندە تیژ ڕام دەکرد، وا بزانم کەس نەیبینیم، ئاگام لە دایکم و ئەوان نەما، تاوەکوو گەڕەکی سەرشەقام ڕام کرد، لە نزیکی ماڵەوە پێم زانی، مالیک بە هەناسەبڕکێ بە دوامەوە بوو.

دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە دایکم، ئەوەی بە باوکم گوت: 'میرزا گیان، ئەڵێم، ســـــاڵی داهاتوو ڕووناک بۆ مەکتەبی زەهرای کچان بنێرین، هەموو مامۆستاکانیان و تەنانەت فەڕاشەکەشیان ژنن.'

باوکم، تەنیا سـەری ڕەزامەندیی بۆ دایکم ڕاوەشـاند، دواتر باوکم پرسیی: 'حەلاو باوەڕ ناکەم ئەو مەکتەبە بەخۆڕایی بێت.'

'نەخێر، گوتیان حەقەکەی ساڵی نزیکی دوو دینارە!'

'ئێ، ئێ، دوو دینار!'

# ٨

'جەلال و مالیک لەگەڵ خۆتان بەرن، با ئەو کوڕانە تۆزێک چاویان بکرێتەوە!'

کاتێک میرزا کەریم ئەمەی بە غەفووری کوڕی گوت، ڕۆژی نەورۆزی ساڵی ١٩٤٦ بوو، غەفووری میرزا کەریم لەگەڵ دوو هاوڕێی، یەکێکیان بە خۆی دەگوت تایەر باراوی و ئەوی تر محەممەد حەمەئەمین قادر بوو، کە دواتر بە کاکەی فەلاح ناسرا. محەممەدی مام مستەفای ئامۆزایشی لەگەڵ بوو، بە نیاز بوون بۆ باخەکەی فەرەج بڕۆن. عەزیزیش لە شانی غەفوورەوە وەستابوو، هەرچەند لە نێوان خۆیاندا بۆڵەبۆڵیان کرد و ناڕەزایەتییان دەربڕی، بەڵام هیچیان نەیانتوانی بەرەو ڕوو ئەوە بە باوکیان بڵێن، کە جەلال و مالیک منداڵن و ئەوان بە هاوڕێیەتییان ڕازی نابن، لەو کاتەدا قادریش بە ڕاکردن لە ژوورەوە بۆ بەردەمیان ڕای کرد: 'منیش حازرم، دەی با بڕۆین.'

میرزا کەریم لە غەفووری ڕوانی و پێی گوت: 'کوڕی خۆم، دەی برای گەورە نەبوویتایە!'

'وەک ئەوە هەڵبژاردەی خۆم بێت!'

'پارەت پێیە و بێدڵی ئەو کوڕانە نەکەیت، چییان حەز لێ بوو بۆیان بکڕە.'

میرزا کەریم ئەمەی بە غەفوور گوت. پاشان وەک لە نێوان خۆیاندا شەڕیان بێت، لەوە دەترسان ئەگەر جەلال و قادر بە تایبەتی مالیک

لەگەڵ خۆیاندا بەرن، ئیتر دەبێت دەست لە هەموو پلانەکانیان بشۆن. ئەوەی ئەو ڕۆژە ئەوان خۆیان بۆ ئامادە کردبوو، لە باخی فەرەج بەشداری کۆبوونەوەی نهێنیی کۆمەنیستەکان بکەن. کە بڕیار بوو نەعیم بەدەوی لەوێ قسەیان بۆ بکات. پاشان جێگەیەکی کەنار بدۆزنەوە و پێکەوە لەو چارەکە ئارەقەی دوو ڕۆژ پێش ئەو ڕۆژە بە نهێنی کڕیبوویان، یەکی قومێکی لێ بدەن. غەفوور و حەمەی مام مستەفا لەگەڵ تایەر و حەمەی حەمەئەمین یەکەم جاریان بوو تامی عارەق بکەن، بەڵام عەزیز ئاگاداری نهێنییەکانی ئەوان نەبوو.

کاتێک هەموویان لەناو حەوشەکەدا و چەند هەنگاوێک لە نزیکی میرزا کەریمی باوکیان ڕاوەستابوون، میرزا کەریم خەریکی ژماردنی پێستە بوو، بە بارتەقای باڵای خۆی لەسەر یەک هەڵچنرابوون، زووزوو یەکێکی لە نێوانیاندا دەردەهێنا و جیای دەکردەوە.

غەفوور و دوو هاوڕێکەی پێشیان کەوتبوون، عەزیز و قادر بەشانی یەکەوە بوون. بە درێژایی ئەو ڕێگەیە جەلال دە مەترێک لە دوایانەوە دەڕۆیشت و قۆڵی لە قۆڵی مالیکی کوڕی مام مستەفادا بوو، جەلال دەیویست مالیک تێ بگەیەنێت کە بۆ کوێ دەچن، دەبوایە هەندێک جار بە ئاماژە دیمەنی کردنەوەی ئاگر بکات. مالیک چەند جارێک سەری بۆ جەلال ڕاوەشاند، دیار بوو دەمێک بوو لەوە گەیشتبوو، کە بۆ کوێ دەچن و نەورۆز چییە، چونکە لەگەڵ جەلالدا وا ڕاهاتبوو، کە هەرچییەکی بگوتایە دەیتوانی بە جووڵەی لێویدا تێی بگات.

حەمەی ئەحمەدی تەها، کە دواتر ناوی خۆی گۆڕی بە کامەران موکری، هاوڕێ و هاوتەمەنی غەفوور بوو، بە هەناسەبڕکێ گەیشتە لایان و قۆڵی کرد بە قۆڵی غەفووردا و گوتی: 'ئەرێ خۆ هەمووتان

وەک مـالیک کەڕ نین؟ لەوســــاوە بـانگتـان ئەکەم، چەنـدە ڕەفیقێکی خوێڕین! بێ من بۆ کوێ ئەچن؟'

'باش بوو مالیک تێ نەگەیشت گوتت چی، ئەگەر نا بە شەق قوڕی ئەکردیت!'

کاتێک عەزیز ئەمەی بە کامەران موکری گوت، مالیک لە عەزیزی ڕوانی و پەلاماری کامەران موکریی دا، باوەشـی کرد بە ناو قەدیدا و بەرزی کردەوە و کێشای بە سەرشۆستەکەدا، بە هەموویان هەوڵیان دەدا لەدەســـتی دەریبهێنێت، بەڵام هیچیـان توانـای هێز و بـازووی مـالیکیـان نەبوو، تـاوەکوو عەزیز یەخەی مـالیکی گرت و بێدەنگ لە چاوی ڕوانی، خێرا دەستی لە ملی کامەران بەر دا.

پاشـان غەفوور لە مالیک هاتە پێشـەوە و بە دەسـتێکی ئاماژەی بۆ کرد: 'چی بووە بۆ سواری سەری ئەو کوڕە بوویت؟'

مـالیک هەوڵی دەدا بە ئـامـاژە وەڵامی غەفوور بداتەوە، بەڵام دیار بوو ئەوەندە تووڕە بوو لە بیری چووبووەوە چۆن تێی بگەیەنێت، کە کامەران زۆر جار گاڵتەی پێ دەکات و لاسایی دەکاتەوە.

بە ئاماژەدانەکەی مالیکدا، غەفوور وا تێ گەیشـــت، کە مەبەســـتی بێت، ڕقی لێیەتی. تاوەکوو جەلال کەوتە بەینیانەوە و مەبەســـتەکەی مالیکی تێ گەیاندن. پاشـــان غەفوور داوای لە مالیک کرد بچێت لە پێشیانەوە بە تەنیا بڕوات.

بوون بە ســـێ بەشـــەوە و کامەران و جەلال لە دواوە بوون و مـالیکیش زووزوو ئـاوڕی دەدایەوە و لێی دەڕوانین. گەیشـــتنە نـاو باخەکەی فەرەج. هەرچەندە ســـەعات یەکی دوای نیوەڕۆ بوو. بەڵام بەرزاییەکانی ســـەیوان و ناو کارێزەکانی گردی ســـەیوان و وەســـتا شەریف جێگە نەمابوو دانیشیت. تەنانەت ئەو باخە گەورەیەی فەرەج،

که له گردی سەیوانەوە بۆ نزیک باخەکەی شێخ لەتیف بەرین بوو، پڕ بوو لە خەڵک.

کاتێک بۆ پێدەشتەکەی مامەیارە سەرکەوتن، چەند کچێک بە جلی کوردییەوە پەیدا بوون. سەروکڵاو و لاگیرەیان بەستبوو، تەمەنیان دە بۆ دوازدە ساڵێک دەبوو. لەسەر سینی یاپراخیان بە سەر ئەو خەڵکەدا دەگێڕا. بە شێوە و لێدوانیاندا لە سەرەژن دەچوون. جەلال و مالیک لە ڕاست و چەپەوە بێ ئاگاداریی یەکێک لە کچەکان دەستیان بۆ سینییەکەی سەر شانی برد، بەڵام پێش ئەوەی ئەوان هیچیان بەر دەست بکەوێت، کچەکە لە بەردەمیاندا سینییەکەی داگرت و گوتی: 'مەگەر ئێمە بە سەر ئەو خەڵکەیدا نەیگێڕین، بفەرموون، دەی بفەرموون کاکە گیان!'

جەلال کاتێک دوو دەنک لە یاپراخە گەڵامێوەکەی هەڵگرت، لە چاوی کچەکەی ڕوانی، کە منداڵانە چاوەکانی بە کل ڕشتبوو. پێ دەچوو سێ ساڵێک لە جەلال بە تەمەنتر بووبێت، چەند هەناسەیەک بێدەنگ لە یەکیان ڕوانی، یەکترییان ناسییەوە، پاشان یەکێک لە کچەکانی تری هاوڕێی بانگی لێ کرد: 'بەهار، بەهار... ئەوە بۆ واقت وڕ ماوە؟'

جەلال چەند جارێک ناوەکەی لە بەر خۆیەوە گوتەوە، مالیک بە سەرنجەوە لە جووڵەی لێوەکانی دەڕوانی.

غەفوور و حەمەی مام مستەفا شانیان نابوو بەیەکەوە و لە کچەکانیان دەڕوانی و هەردووکیان پێکەوە بە کورس پێیان گوتن: 'هەزار جار ئەڵێین و قەستەم ئەخۆین، ژەهریش بە دەست ئێوە بێت ئەیخۆین!'

سێ لە کچەکان، کە ژمارەیان لە بیست زیاتر دەبوو، هەموویان بەو جۆرە یاپراخیان بە سەر ئەو خەڵکەدا دەگێڕا، هاتبوونە بەرامبەریان و سینییەکانیان لەسەر دەستیان ڕاگرتبوو، بە دەمیانەوە پێدەکەنین.

دووبارە ئەو کچەی هاوڕێکانی بە بەهار بانگیان دەکرد، گەڕایەوە بەردەم جەلال و پێی گوت: 'گیانەکەم، بە کەیفی خۆت یاپراخ هەڵگرە!'

پاشان خۆی لە جەلال نزیک کردەوە و بە گوێیدا چپاندی: 'من و تۆ نهێنییەک لە نێوانماندا هەیە!'

مالیک لەو کاتەدا نوقورچکێکی لە لاڕانی جەلال گرت و سەرنجی لەسەر چاوی بەهار پێ گۆڕیی.

غەفوور دەیویست مالیک و کامەرانی هاوڕێی ئاشت بکاتەوە، قۆڵی کرد بە قۆڵیاندا و ئەوەی بە کامەرانی هاوڕێی گوت، کە هەوڵ بدات داوای لێبووردن لە مالیک بکات.

کامەران ئەوەی بە غەفوور گوت، کە پارەی پێیە و دەیەوێت سیفۆن بۆ مالیک بکڕێت، نەک هەر ئەو... بەڵکوو هەموویان دەعوەت بکات. کاتێک دەستی کرد بە گیرفانیدا و سەد فلسی لە گیرفانی دەرهێنا، مالیک تاوێک لە ناو دەستی ڕوانی، پاشان سەد فلسەکەی لێ وەرگرت. دیار بوو مالیک لە مەبەستی گەیشتبوو، چونکە دەستی هەڵبڕی و ئاماژەی بۆ ئەوە کرد، کە چۆن شووشەی سیفۆنەکە دەنێت بە سەرتەوە. دوای ئەمە دایانە قاقای پێکەنین.

عەزیزی میرزا کەریم لێیان جیا بووەوە و لەسەر سفرەی ماڵی سمە پاڵەوان دانیشت، کە هاوڕێی نزیکی یەک بوون و ڕۆژانە سەری ماڵی یەکیان دەدا. غەفوور و هاوڕێکانی لەگەڵ حەمەی مام مستەفا، چۆن پێشتر پلانیان بۆ دانابوو، کە ئەو ڕۆژە بەشداری لە

کۆبوونەوەی کۆمۆنیستەکاندا بکەن و پاشان جێگەیەکی پەنا لە باخەکەی فەرەج بدۆزنەوە و ئارەق بخۆنەوە. هەروەها کامەران موکری بێ ئەوەی داوای سەد فلسەکەی لە مالیک بکاتەوە دوایان کەوت.

جەلال و مالیک لەگەڵ قادردا مابوونەوە و لای عەرەبانەیەک ڕاوەستابوون، لە پشتی عەرەبانەکەوە بە بەرزیی دوو مەترێک سندووق هەڵچنرابوون، لەسەر عەرەبانەکە شووشەی سیفۆن، سۆدە، شەربەتی پرتەقاڵ و دوو سینیی پاقلاوە دانرابوون.

سیفۆنیان داوا کرد و هەرسێکیان ئانیشکیان خستبووە سەر تەختەی عەرەبانەکە و زۆر بە هێواشی قومیان لێ دەدا. بیست مەترێک لەو لای ئەوانەوە، سەکۆ ئامادە کرابوو، چەند ڕیزێک کورسی دانرابوون، پارێزگاری شار مەعرووف چیاوگ و حاجی تۆفیق و زیاتر لە سەد کەسێک بەرامبەر سەکۆکە دانیشتبوون. هەروەها ئێدمۆنس، حاکمی ئینگلیز، لەوێ بوو.

پیاوێکی قەڵەوی سەرزلی دەموچاوکونجن لەسەر سەکۆکە بوو، زۆری خەڵکەکە و غەڵبە غەڵب ڕێگەیان پێ نەدەدا قسە بکات یان شیعر بخوێنێتەوە. بێجگە لەوانەی لەسەر کورسی دانیشتبوون ژمارەی خەڵکەکە لە زیادبووندا بوو. دەوری سەکۆکەیان گرتبوو. کابرای سەر سەکۆکە بە دەنگی بەرز هاواری کرد:

'ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە.

وەختی بەندیی و ئەسارەت، پێ بە تەوق و کۆتەوە.'

شیعرەکەیان پێ بڕی، زۆری خەڵکەکە وای لە کابرای شاعیر کرد، کە زیاتر لە چوار جار ئەو دوو دێڕە بڵێتەوە. پاشان شاعیرەکە بە ئەستەم لە ناو خەڵکەکەدا دیار بوو.

پۆلیس و چەند گەنجێک دوو جار بەردەم سەکۆکەیان بە خەڵکەکە چۆڵ کرد، بەڵام ئاپۆرای خەڵک، کوڕ و کچ، پیر و منداڵ لە هەموو لایەکەوە بە تایبەتی لە باخەکەی فەرەجەوە بەرەو شوێنی ئاهەنگەکە دەهاتن و کەس گوێی لە دەنگی کەس نەبوو. تەنانەت هەندێک گەنج چووبوونە سەر سەکۆکە و کابرای شاعیریان خستبووە سەر شانیان و بە ناو خەڵکەکەدا دەیانگێڕا.

جەلال و قادر لەگەڵ مالیکی ئامۆزایاندا هێشتا لە دوورەوە قومیان لە شووشەی سیفۆن دەدا و لە خەڵکەکەیان دەڕوانی.

قادر گوتی: ئەوە بێکەس بوو!'

'کێ؟'

'فایەق بێکەس!'

'ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم!'

قادر بۆی سەندەوە: 'شێوەتم بیر کەوتەوە.'

دوای ئەوەی گوێیان لەو دێڕە شیعرە بوو، لە بەر خۆیانەوە دەیانگوتەوە. زووزوو دەنگیان لێ هەڵدەبڕی و وەک بێکەسی شاعیر دەستیان ڕادەوەشاند و دەیانگوت: 'ئەی وەتەن مەفووتنی تۆم.'

پاشان جەلال بە درێژاییی ئەو ڕۆژە تاوەکوو ئاگریش کرایەوە ئەو دێڕەی لەسەر زمان بوو.

چەند جارێک دێری دوای ئەوەی لە خەیاڵی خۆیدا تەواو دەکرد، کە خۆی بۆی زیاد کردبوو. قادر دەنگی هەڵبڕی:

'ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە
مالیک وەختێک توورە دەبێت ئەتخاتە ژێر پێیەوە.'

قادر هاواری دەکرد و پاشـــان قاقای لێدەدا، مالیکیش لەگەڵیدا پێدەکەنی، بەڵام جەلال بێدەنگ بوو، دەســـتی قادری گرت و چەند جارێک لە بەر خۆیەوە گوتی: 'کاکە، کاکە، هێواش.'

زۆری پێ چوو تاوەکوو توانی ســەرنجی قادر و مالیک ڕابکێشـێت و بێدەنگیان بکات. پاشـــان دەســـتی قادر و مالیکی گرت و لێکی جیا کردنەوە و بە توورەییەوە گوتی: 'ئەرێ کاکە دە گوێ بگرن! بزانین فایەق بێکەس چی ئەڵێت.'

خەڵکەکە لە بەردەم ســەکۆکە دانیشـتبوون، فایەق بێکەس پەنجەی بەرەو ڕووی پارێزگار و نوێنەری ئینگلیز درێژ کرد و هاواری کرد:

"بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم
بەنان و ئاو و جلوبەرگی خۆم
خزمەتم کردی لە ئێران و ڕۆم
لەپێناوی تۆ شکاوە ئەستۆم
کەچی هێشتا هەر دیل و ڕەنجەڕۆم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم؟!
بۆ چی بە ناهەق وا سووکت کردم؟!"

خەڵکەکە دیسان هەستانە سەر پێ، دوای ئەوەی چەپڵەیان لێ دەدا و هاواریان کرد، 'بژی کوردســـتان، بژی کوردســـتان.' چەند گەنجێک شاعیرەکەیان خستەوە سەر شان و بە ناو خەڵکەکەدا گێڕایان.

قادر نەیدەتوانی بێدەنگ بێت و دەستی بۆ مالیک درێژ دەکرد و بە ئاماژە دەیویســـت دیمەنی ئەوە بســـازێنێت، کە مالیک چۆن کامەران موکریی دابوو بە زەویدا. مالیک لە قادر هاتبووە پێشـــەوە و بێدەنگ، لە جووڵەی لێوەکانی دەڕوانی. پاشـان قادر لە مالیکی ڕوانی و گوتی:

'ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیر کەوتەوە. گەر پاقلاوەم بۆ نەکڕیت، وەک مار ئەیەم پێتەوە'

چەند گەنجێک دەورەیان لێ دابوون و بە قسەکانی قادر پێدەکەنین.

فایەق بێکەس، دووبارە دەستی کردبووەوە بە خوێندنەوەی شیعرەکەی. کاتێک عەزیز هات، قادر بێدەنگ بوو. هەروەها لە سەد فلسەکەی کامەران موکری بە مالیکی دابوو پەنجا فلسیان پێ مابوو. عەزیز هاوڕێیەکی بە ناوی قادر برسی لەگەڵدا بوو، کە مالیک سیفۆن و پاقلاوەی بۆ ئەوانیش کڕی.

پێش خۆرئاوابوون ئاگری نەورۆز کرایەوە و جەلال نوقمی نێو خەیاڵەکانی بووبوو، بێدەنگ چاوی بڕیبووە بڵێسەی ئاگرەکە و مالیکیش زووزوو لە جەلالی دەڕوانی.

لە گەڕانەوەدا، غەفوور و هاوڕێکانی شوێنبزر بوون، هەرچەندە نێو خەڵکەکە و ناو باخەکانیان بە دوادا گەڕان نەیاندۆزینەوە، پاشان عەزیز مالیک و براکانی پێش خۆی دابوون، لە دوایانەوە دەڕۆیشت و بۆیان نەبوو لەسەر شۆستەی شەقامەکە لا بدەن.

قادر لە بەر خۆیەوە شیعرەکەی بێکەسی دەگۆڕی و کاتێک پێدەکەنی مالیکیش لەگەڵیدا دەنگێکی لێوە دەهات، عەزیز زەردەخەنەیەکی دەکەوتە سەر لێو، جەلال چەند جارێک لە شوێنی خۆی وەستا و دەستی لەسەر سینگی دانا و دوو دێڕی شیعرەکەی وەکوو خۆی گوتەوە، هەوڵی دەدا ئەو دێڕانەی بیر بکەویتەوە، کە پێشتر خۆی بۆ شیعرەکەی فایەق بێکەسی زیاد کردبوون.

## ٩

ئەگەر یادەوەریی ئەو ڕۆژانە بگێڕمەوە کە لە پۆلی پێنج و شەشی سەرەتایی بووم، دەمەوێت لەو ڕۆژەوە دەست پێ بکەم، کە ڕۆژی شەممە لە گۆڕەپانی قوتابخانە بەڕێوەبەر قسەی بۆ کردین، باسی ئەوەی کرد، کە کەسێک لەسەر زۆربەی دیوارەکانی دەروژووری قوتابخانەکەمان قسەی نابەجێی نووسیوە. ئەو ڕۆژە لەسەر دیوارەکانی قوتابخانەی ئەیووبییە بە ڕەنگی سوور نووسرابوو: 'منەتان بە گونم، خوا بتانکرێ، حەموتان باوحیزن، منەتان بە حیچ، بێ کەلەشێر ڕۆژ ئەبێتێ.'

لەسەر دیواری گۆڕەپان و پۆل و ڕاڕەوەکە، بگرە ژووری مامۆستایانیش ئەوانە نووسرابوو. ئەگەر بڵێم لەگەڵ بینینی نووسینەکاندا زانیم ئیشی مالیکی ئامۆزامە، ئەوە درۆ ناکەم، چونکە هەمووی بە هەڵە نووسرابوو، ئەو هەڵانەی کە بەردەوام مالیک لە نووسیندا دەیکرد و دەستوخەتیم ناسییەوە. دەمزانی، چونکە من تەنیا مامۆستای بووم. ئەو ڕۆژە مالیک خۆی لێ ون کردم، ڕۆژی دواتر کاتێک نووسینەکانی سەر دیواری قوتابخانەی ئەیووبییەم لەسەر کاغەزێک بۆ نووسی. باوەشی پێدا کردم و توند گوشیمی بە خۆیەوە، پاشان بە ئاماژە پێی گوتم؛ کە ئەو نهێنییەی بۆ بپارێزم، وەک چۆن ئەو نهێنی بەهاری بۆ من پاراستبوو. وا بزانم لەو کاتەدا تەنیا سەری ڕەزامەندیم بۆ لەقاند. دەمزانی، ئەو ڕۆژەی کە لە منیان جیا کردەوە و لە قوتابخانەی ئەیووبییە وەرنەگیرا، پاشان ئەو شەش ساڵەی

ڕابردوو مالیک چەند خۆی بە دڵشــکاو دەزانی. دوای ئەوەی هەڵەی نووســینەکانیم بۆ ڕاســت کردەوە، مالیک بۆی نووســیم: 'ئەگەر ئەو ســەگبابانە منیشــیان وەک تۆ لە قوتابخانە وەردەگرت، ئەوا باشــتر فێری نووســین دەبووم، واتە تۆ مامۆســتایەکی خراپیت.' منیش تەنیا بەدەمییەوە پێکەنیم.

لە پۆلی پێنجی ســەرەتایی بووم، ســاڵی پێ چوو تاوەکوو قادر هاوڕێیەتیی من و مالیکی ئامۆزامی قبووڵ کرد، ئەویش لە کاتێکدا بوو کە قادر هەموو هاوڕێکانی تری لەدەســت دابوون. یەکترییان بە ڕێکەوت دەبینی و تەنانەت سڵاویشیان لە یەکتری نەدەکرد. لە پۆلدا ناچار لە تەنیشــتی یەکەوە دادەنیشــتن و بێدەنگ بە لای یەکتریدا تێدەپەڕین، ئاگادار بووم کە تەواو دەنگیان لێک دابڕیبوو.

قوتابییەکان لە قوتابخانەی ئەیووبییە و بە تایبەتی لە نێو پۆلەکان، بووبوون بە دوو بەشــەوە، من و قادر لە ڕێگەی کاکە غەفوور و باوکمەوە ئەو ناوەمان بۆ ڕژابوو، کە پێیان دەگوتن: 'تەحەڕوڕ.'

ســاڵانی پێشــتر زۆربەی هاوڕێ نزیکەکانی قادر بە ڕێکەوت لەوانە بوون؛ کە کەسوکاریان بیری نەتەوەییان هەبووبوو. هاوڕێکانی من، ئەمین جەلال، یاســین حەمەســاڵح و وەهاب ســاڵح کۆیی بوون. ڕووداوەکانی کۆماری کوردســتان لە مەهاباد و گۆڕانکارییەکانی عێراق، بە تایبەتی لە شاری سلێمانی، خەڵکی بە سەر چەند بەرەیەکدا دابەش کردبوو. ئێمە تاوەکوو ئەو تەمەنەمان لە قوتابخانە باســی ســیاســەتمان نەکردبوو. وەک چۆن کاکە غەفوورم ئامۆژگاریی کردبووین، بەڵام لەدەستدانی هەندێک لە هاوڕێکانمان تا چەندان مانگ

و بگره زیاتر له سـالێکیش کاریگەریی لەسـەرمان هەبوو. بە تایبەتی قادری برام، کە جەلالی حاجی شـەفیق و تەها بابان لەگەڵ حەمەکاکە دەنگیان لێ دابڕیبوو. لە سـەرەتای چوونی بۆ قوتابخانەوە بووبوونە هاوڕێ، کە تەنیا بۆ خواردن و خەو بۆ ماڵەوە دەگەڕایەوە و بەردەوام پێکەوە بوون. هەندێک جاریش لە ماڵی یەک دەنووسـتن. قادر زیاتر لە هەفتەیەک نەخۆش کەوت و نەچوو بۆ قوتـابخـانە. دوای ئەوە ڕۆژانە بێدەنگ و بە تەنیا بە بەر ماڵی هاوڕێکانیدا هاتوچۆی دەکرد. بە بـاوەڕی من هەر ئەوەش هۆکـار بوو، جیـاواز لە من و کـاکە غەفوورم، کە دواتر کاریگەریی بیری نەتەوەیی بە سەر قادرەوە دیار بوو. پاشان هەر لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەیدا یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی قوتابییان و لاوانی پارتی.

پەیوەندیی ئێمەی منداڵ کە تەمەنمان دە بۆ دوازدە سـاڵان بوو، بەو پارت و ڕێکخراوانەوە تەنیا لە ڕوانگەی سـۆزمانەوە بوو. من و قادر لە گەڕەکی سەرشـەقام و قوتابخانەی ئەیووبییە ناسراو بووین، کوڕی میرزا کەریمی سـەرشـەقام و برای غەفووری میرزا کەریم بووین. ئیتر ئەوەندە بەس بوو تاوەکوو منداڵی کەسـانی هەڵگری بیری نەتەوەیی دەنگمـان لێ دابڕن و هەندێک جار دژایەتیشـمـان بکەن.

ئەوەی لە سـەردەمی منداڵیمدا کاریگەریی لەسـەر من هەبوو، وەک مرۆڤ و پاشان خەباتکار و شاعیر، یان باشترە بڵێم ئەوەی بەردەوام بیرم لێ کردووەتەوە، ئەوە بووە؛ کە لە دروسـتبوونی ئەو شـارەوە کێشـەی چینایەتی شـارەکەی بە سـەر چەند چینێکی خەڵکی لە یەکدابڕاو و دژبەیەکدا دابەش کردبوو، هەروەها لەو تەمەنەی مندا، جیاوازیی نێوان بیری چەپ و نەتەوەیی، لاوانی کردبوو بە ڕکابەری

ســەرســەختی یەکتری، کە دواتر گەیشــتە ئەوەی دەســتیان بچێتە خوێنی یەکتریش. ئەوەی ئەوســا و ئێســتاش وەک گرێکوێرەیەک لە ناو خەیاڵەکانم و لەســەر ڕۆحمە، منداڵی ئەو کەسانە بوون، کە تەنیا چاویان لە بەرژەوەندیی خۆیان بوو، زۆر بە ڕاشــکاوانە لە بەرەی میری ئەو ســەردەمەدا بوون، کە پێیان دەگوتن منداڵی بەرژەوەندیخوازەکان. هەر ئەوانیش بوون دواتر قوتابخانەیان تەواو کرد، بوونە دکتۆر و ئەندازیار و خاوەن بەرژەوەندی و جێگەی باوک و کەسوکاری خۆیانیان گرتەوە، تەنانەت لێشیان بوو بە شاعیر!

* * *

دیســان یادەوەریی ڕۆژێکی شــەممە، بەڕێوەبەر و مامۆســتاکان لە قوتابخانەی ئەیووبییە؛ هەموو قوتابییەکانیان لە حەوشــەی قوتابخانە کۆ کردەوە. دوای ئەوەی بەڕێوەبەر جەمالی میرزا ســەلیم باســی رووخانی کۆماری مەهابادی بۆ کردین، پاشــان ئەوەی پێ گوتین: 'چوار ئەفســەر بە نێوەکانی، مســتەفا خۆشــناو، محەممەد قودســی، عیزەت عەبدولعەزیز و خەیروڵڵا عەبدولکەریم، لە لایەن حکومەتی ئێرانەوە دەســتگیر کراون و چەند ڕۆژێکە ڕادەســتی حکومەتی عێراقیان کردوونەتەوە. ئەمڕۆ ئێمە بە هەموومان هەوڵ ئەدەین ئیمزا کۆ بکەینەوە، هەتا گیانی ئەو چوار ئەفسەرە پارێزراو بێت.'

لە دوای ئەمەوە قوتابییەکانیان بە ســەر چەندان گرووپدا دابەش کرد و مامۆستاکانیش سەرپەرشتییان دەکردین. دیار بوو بەڕێوەبەر و مامۆســتاکان بۆ ئەو ڕۆژە خۆیان ئامادە کردبوو، چونکە کاغەزی چاپکراویان بەســەر هەموو قوتابییەکاندا دابەش کرد، کە وێنەی

ئەفسەرەکان بوون و چەند دێڕێکیان لەسەر نووسرابوون. لە ژێریدا خەڵکی دەیانتوانی ناوی خۆیان بنووسن و ئیمزای بکەن.

کاتێک لە قوتابخانە دەرچووین، مالیک کاغەزێکی بە دەستەوە بوو، لە شانی منەوە دەڕۆیشت. لە نێوان خۆماندا ڕێک کەوتبووین، کە من داوا لە خەڵکی بکەم و مالیک کاغەزەکەیان بداتە دەست. بەڵام کاتێک مالیک وێنەی ئەفسەرەکانی بینی، کاغەزەکەی لوول کرد و فڕێی دایە بەر پێم و ئاماژەی بەوە کرد: 'ئێمە چی بۆ ئەم پۆلیس و عەسکەرانە بکەین!'

هەرچەند ویستم تێی بگەیەنم؛ کە ئەمانە لەو پۆلیس و عەسکەرانە نین، بەڵام تێ نەگەیشت و بە تووڕەیییەوە بەجێی هێشتم.

ئەوەی ئەو ڕۆژە ناوی خۆیی نەنووسی و ئیمزای نەکرد بۆ ئازادکردنی ئەو چوار ئەفسەرە، کە بۆ پشتگیریی کۆماری مەهاباد چووبوون، فەرمانبەری پارێزگار و شارەوانی و پۆلیس و بازرگانەکان بوون، وەک ساڵانی پێشوو وەفدێک لە بەرژەوەندیخوازان پێک هێنرابوو، وەک دەمڕاستی خەڵکی سلێمانی قسەیان لەسەر پاشەڕۆژی ئەو چوار ئەفسەرە کرد. ئەو ڕۆژە بە پێشەوەی چایخانەکەی حەمەی بەکردا، لە ژێر قەسرەکەی تۆفیق قەزاز، لەسەر پارچە قوماشێکی سپی بە سوور نووسرابوو:

"دەک خەجاڵەت بن لە ڕووی مەحشەرا!
ئێمە خاکی غەم ئەکەین بە سەرا
ئێوەش ئەو عەرشەی بە خوێن گوڵڕەنگە
سوجدەی بۆ ئەبەن هیچ ناڵێن نەنگە
پیرەمێرد"

ئەو ڕۆژە بۆ من و قادر وەک جەژن بوو، حەزمان دەکرد ئەو ڕۆژە هەر تەواو نەبووایە، چونکە لەگەڵ ئەو هاوڕێیانەماندا بووین، کە دەنگیان لێ دابڕیبووین.

هاوڕێ نەتەوەییەکانمان چەند جارێک ئەو پرسیارەیان لێ کردین، کە ئێوە چی دەکەن لێرە و بۆچی بەشدارن؟ ئاخۆ ئەو چوار ئەفسەرە کوردە کە بەشداری کۆماری مەهاباد بوون، نەتەوەیی بوون؟ یەکێک بە قادری گوت: 'قادری میرزا کەریم لێت تێک نەچووبێت، چوار ئەفسەرە گیراوەکە کۆمۆنیست نین!'

قادریش لە وەڵامدا گوتی: 'ئەوەندە بەسە کە کوردن.'

پەیوەندی قادر لەگەڵ من و مالیکدا گەیشتبووە ئەوەی لەگەڵماندا دەنووست و بێ ئێمە لە ماڵ دەرنەدەچوو. باشترە بڵێم بە ناچاری هاوڕێیەتی من و مالیکی قبووڵ کردبوو. هەرچییەک لە گەڕەکدا ڕووی بدایە پێکەوە ئاگادار بووین و دواتر بۆ کاکە غەفوورمان دەگێڕایەوە، هەروەها ئەگەر کەسێک بهاتایەتە ئەو ماڵە و باسی هەر شتێکی بکردایە، ئێمەی منداڵ ئاگادار بووین، هەموو شتێکیشم لە مالیک دەگەیاند.

دواتر لە شاری بیسمارک، ئەو ڕۆژانەی پەککەوتە و تەنیا بووم، هەستم بەوە دەکرد، کە سەرەڕای ئەوەی ئازاری جەستەم بێزاری کردبووم، بەڵام خەیاڵم پڕ بوو لە شیعر و گێڕانەوە. لە فۆرمی جیاوازدا بەردەوام و بە شەووڕۆژ دەمنووسی، شانۆنامە، چیرۆک، شیعر، گوتار. کە بەرهەمی خەیاڵی ژیانی سەردەمی منداڵی و پەروەردەی ماڵەکەی میرزا کەریم بوون. ئەوسا کاتێک میوان دەهات و باسی سیاسەت دەکرا، ئێمەیان دەکردە دەرەوە. بە تایبەتی لە

ژێرزەمینەکە کۆ دەبوونەوە، بەڵام ئێمەی منداڵ قوژبنێکمان لەو ماڵەدا هەر شـــک دەبرد، خۆمانی تێدا بشـــارینەوە و گوێیان لێ بگرین. بە تایبەتی لەو ســاڵەدا کە کاکە غەفوورم بێجگە لەوەی بۆ ڕۆژنامەکانی دەنووسی، ئەندامی ناوەندیی حیزبی شیوعی سلێمانی بوو، کە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکان لە ماڵی ئێمەدا دەکرا. نووســەر، ســیاســی، بازرگان، شێخ و مەلا، لە هەموو توێژێکی خەڵک ڕوویان دەکردە ئەو ماڵە. بنکەی بابانییەکانی دانیشـتووی کفری و هەڵەبجە بوو، بێجگە لە جـاف و ڕۆخزایی و هەمەوەنـدییەکـان، جێگەی مـانەوەی کوردانی ڕۆژهەلاتیش بوو.

ئەو کەســـایەتیەتییانەی خۆم لەو تەمەنەمدا لە نزیکەوە بەریان کەوتم و هەندێکیانم بە عەقڵی منداڵیم بە هاوڕێ دەزانی؛ ئەمین زەکی، ڕەفیق حیلمی، فایەق بێکەس، تۆفیق وەهبی، عەبدوڵڵا گۆران، ڕەئیس مســتەفای کوڕی حاجی عەبدوڵڵا بانەیی ســەرشــەقام، زێوەر خاڵی میرزا کەریمی باوکم بوو، کوڕانی ئەحمەدی تەها و حەمەساڵح دیلان کە ڕۆژانە دەهـاتن و وەک خزمی خۆمـان لێم دەڕوانین. بە بیرم دێت پیرەمێرد هەموو ڕۆژی هەینییەک دەهات، بە مەرجێک باوکم یەکێکی بنـاردایە بۆ کەبـابکڕین. پیرەمێرد بەردەوام بە شـــانوبـاڵی کـاکە غەفووردا هەڵیدەدا و دەیگوت: 'میرزا کەریم ئـاگـات لەو کوڕە بێت، چونکە مانگەشەو سەرلەئێوارە دیارە.'

مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس و عەلائەدین ســـەجادی بە تایبەتی بۆ دەفتەری شـــیعرەکەی باوکم چەند جارێک هاتبوون، ئەوەیان بە باوکم گوت؛ ئەو دەفتەرە بێ وێنەیە و چەند شیعری شاعیرانی تێدایە، کە لە هیچ جێگەیەکی تر نەنووســراونەتەوە و بەردەســت ناکەون، بە تایبەتی ئەو شیعرانەی لە ڕابردوودا خودی ئەو شاعیرانە خۆیان لەو

دەفتەرەدا بە دەستوخەتی خۆیان نووسویانە. شێخ حوسێن بەرزنجی شـیعری ئەی ڕەقیبی لە بەر ئەو دەفتەرەدا نووسـیبووەوە و دواتر ئاوازی بۆ دانابوو.

خۆم وەک منداڵ لەو مەجلیسەدا بووم، کە عەلی مەردان و حەسەن زیرەک گۆرانییـان تێدا دەگوت. ئەمـانە تەنیـا بۆ ئەوە نەدەهـاتن کە قبوولی و پلاوەکەی دەسـتی حەلاوەخانی دایکم بە تام بوو، بەڵکوو لەبەر کتێبخانەکە و شوێنی حەوانەوە و کۆڕ و کۆبوونەوەیان بوو.

لە پۆلی شـەشـی سـەرەتایی بووم، کە شـێخ مەحموود و تۆفیق وەهبی، کـاتێـک بۆ کێشـەی جووتیـارانی عەربەت بە شـەو لە قەرەداخەوە هاتنە ماڵی ئێمە، تۆفیق وەهبی باسی ئەوەی کرد، کە ئەم ماڵە بنکەیەکی گرنگە بۆ هەموو ئەو شـتانەی کە شـارێک پێویسـتی پێیەتی. نووری ئەحمەدی تەهاش لەوێ بوو، گوتی: 'دەی جەناب خۆ بە گاڵتەوە ناویان لێ نەناوە خانەقا!'

'بریا سـی سـاڵ پێش ئێسـتا دوو خانەقای ئاوامان لەم شـارەدا دەبوو.' شێخ مەحموود ئەوەی لە بەر خۆیەوە گوت.

بێجگە لەوەی هەموو ڕۆژێک لە دەرەوەی شـاری سـلێمانییەوە خەڵک ڕوویان لەو ماڵە دەکرد، هەروەها بەشێک لە حەوشەی ماڵەکە خانی وڵاخ بوو، کاروانچییشـی تێدا دەمانەوە. مام مسـتەفاشـم، کە بە مام مسـتەفای ناڵبەند ناسـرابوو، ئەو پیشـەیەی لە باوکییەوە بۆ مابووەوە... کاری ناڵبەندیی تێدا دەکرد.

بـاوکم بۆی گێڕامەوە کە خواجە لەیفی، حـاخـامی کنێسـەتەکەی گەڕەکی جوولەکان بە نوێنەری حکومەتی بەریتـانیای گوتبوو: 'ماڵی میرزا کەریم لەم شـارە بۆ ئێمەی جوو وەکوو دەرگەیەک وایە، کە لێوەی ئەچین بۆ شار.'

پێش لەدایکبوونی من و تـاوەکوو تەمەنم بووبوو بە دە ســـاڵ، کەریمی عەلەکە شـــەریکە کـاســـبیی بـاوکم بوو. تـا ئەو ڕۆژەی هەڕەشەی لێ دەکرێت و بە یەکجاری شاری سلێمانی بەجێ دەهێڵێت. باوکم بێجگە لە ماڵەکەی، دووکانەکەی، کە لە خانی غەفوورە فەنی بوو، کە ئەویش بنکەی بازرگانی و کۆڕ و کۆبوونەوە بوو، کە منیش هەموو دوانیوەڕوانێک لەوێ بووم.

* * *

ئەگەر بگەڕێمەوە ســەر ئەو باســـەی کە بۆچی ئەو ماڵە کاریگەریی لەســـەر کەســـایەتیی من هەبووە. چونکە لەو ڕۆژانەدا کە من و قادر هەوڵمـان دەدا لە هەموو کۆڕ و کۆبوونەوەکـانـدا ئامـادە بین، بە خۆمانمان دەگوت ئێمە جاســـووســـیی بە ســـەر هەموو کەســـێکەوە دەکەین، کە دێتە ئەم ماڵە. ئەوەشـمان لە مالیک گەیاندبوو. بەو جۆرە هەرســـێکمان شـــایەتحاڵ بووین بە ســـەر چیرۆک و قســـەی ئەو کەسایەتییانەوە، بێجگە لەو قسانەی کە لە گەڕەک دەکران.

من و قادر پێش چوونە قوتابخانە دەمانتوانی بخوێنینەوە، چونکە هەرچی کتێب یان ڕۆژنامە و گۆڤارێک بهاتایەتە ئەو ماڵە، ئێمە دەبووایە بمانبینیایە. ناوی هەرچی کتێبێکت دەهێنا، دەمانزانی لە کتێبخانەکەدایە یان بۆ خوێندنەوە لای کێیە. تەنانەت بە ســـەعات سەرمان بەسەر کتێبە عەرەبی و فارسییەکانیشەوە بوو، بێ ئەوەی تێیان بگەین. تەنانەت وا ڕاهاتبووین ئەگەر حەلاوەخانیش میوانی بهاتایە دەچووین و بە دزییەوە گوێمان لەوانیش دەگرت.

بێجگە لەوەی بەردەوام هەرسێکمان بۆ کتێبگەیاندن و هێنانەوەی بەرێوە بووین.

بە تایبەتی لە نێوان باوکم و دووکانەکەی قادر ئاغای عەتاردا. هەندێک جاریش بۆ سابوونکەران و کەشتییەکەی نوح و ماڵی نەجمەدینی مەلا دەچووین، کە کتێبی بە قەرز لە باوکم وەردەگرت، بەڵام ئێمە هەر زوو لە نەجمەدینی مەلا بێزار بووین و بە نابەدڵی دەچووین، بە بیرم دێت من جارێک گلەیی ئەوەم لە لای باوکم لە نەجمەدینی مەلا کرد، کە هەندێک جار دەرگەمان لێ ناکاتەوە.

باوکم و قادر ئاغای عەتار لەو ئیشەیاندا شەریک بوون. هەرچەندە قازانجی نەبوو، بگرە زۆربەی جار زەرەریان دەکرد. قادر ئاغای عەتار بە باوکمی دەگوت: 'باوک و باپیرمان مزگەوت دروست دەکەن و پارە دەکەن بە خێر، وەک بەرتیل بۆ قیامەت، بەڵام من و تۆ دەیدەین بە کتێب!' هەر جارێک من و قادر یان مالیک بچوونایەتە دووکانەکەی قادر ئاغای عەتار، یەک فلسی دەنایە مشتمان، هەندێک جار دوو فلس و تا دەگەیشتە عانەیش. ئێمەش بێجگە لە دووکانەکەی مام زامنی نوقڵفرۆش لە گەڕەکی مەڵکەندی، بۆ هیچ جێگەیەکی تر نەدەچووین. مام زامنیش گوێی بە کەمی و زۆری پارەکە نەدەدا و هەرچەندێکمان پێ بووایە، حەوت دەنک نوقڵی ڕەنگاوڕەنگی پێ دەداین.

هەندێک جاریش لە بەرامبەر سەرا و سەرەتای شەقامی پیرەمێرد، دەچووین لە دووکانەکەی مام سەعیدی شەربەتچی تینوێتیی خۆمانمان پێ دەشکاند. مام سەعید شەربەتی مێوژی بە بەفری هەڵگیراوی گوێژەوە دەفرۆشت، زستانان دەیگۆڕی بە شێلمفرۆشی. ماڵی مام سەعید لە گەڕەکی مەڵکەندی و کۆڵانی پیرمەسوور بوو، کە

دەتتوانی لە دەرگەیان بدەیت و لەماڵەوەش شەربەتی سارد یان بە زستانان شیلمی کوڵاو بکڕیت. لەو ڕۆژانەدا گەنجان شانامەیەکیان هۆنیبووەوە و لەسەر زمانی خەڵکی شار بوو، دەیانگوت:

"شەربەتی باوکی بەکرە کۆڵ
سارد و شیرینە بێ سەهۆڵ
پۆلیسفرێنە بەکرە کۆڵ
عەسکەرترێنە بەکرە کۆڵ"

مام سەعیدی شەربەتچی، لەسەر سەرکێشییەکانی بەکری کوڕی، چەند جارێک بۆ سەرا بانگ کرابوو، وا بزانم سجنیشیان کردبوو.

باوکم ئەو ڕۆژانە، چەند جارێک هەرسێکمانی لەگەڵ خۆیدا بۆ دووکانی حاجی عارف برنووتی عەتار لە شەقامی مەولەوی برد، کورسی نەعنا و نوقڵی ئینگلیزیی بۆ کڕیین، بەڵام، من ئەوەم بە باوکم گوت: 'دووکانەکەی هەرچییەکی تێدایە، ناگات بە تامی یەک دەنک نوقڵی دووکانەکەی مام زامن.'

کاتێک من ئەوەم گوت، باوکم بە سەرنجەوە لێی ڕوانیم و لە ژێر لێوەوە گوتی: 'دیسان مام زامن، ئەبێت لەزەتی نوقڵەکانی ئەو مام زامنە نهێنییەکی تێدا بێت!'

بردن و هێنانەوەی کتێبەکان، لە نێوان خۆماندا وەک پێشبڕکێی لێ هاتبوو، باوکم یان کاکە غەفوور تفیان ڕۆدەکردە سەر ڕەفەی پەنجەرەی ژێرزەمینەکە، دەبووایە بە ڕاکردن بچووینایە و بهاتینایەتەوە و تفەکە وشک نەبێتەوە. ئەوە داواکاریی باوک و براگەورەکەمان نەبوو، بەڵکوو لە نێوان خۆماندا وەک یارییەکی پێشبڕکێمان لێ کردبوو.

یادەوەرییەکی تاڵی ئەو ڕۆژانەم، بەیانییەک کتێبێکم بۆ فەتاح چوارتایی برد، ئەویش قسەی لێ دەردەهێنام و باسی کتێبخانەکەی ماڵەوەم بۆ کرد، چونکە من ئەوم بە ڕەفیقی نزیکی کاکە غەفوورم دەزانی، پاشان فەتاح چووبوو شکایەتی لە باوکم و کاکە غەفوورم کردبوو. هەر ئەو ڕۆژە قاسمە ڕەشی پۆلیس دێت و کاکە غەفوورم ئاگادار دەکاتەوە، کە پێش خۆرئاوابوون کتێبخانەکە بگوازینەوە. زۆر ترسام، کە من ببمە هۆکاری بەگرتدانی باوکم و کاکە غەفوورم. ئەو ڕۆژە بە هەمووومان کتێبخانەکەمان بۆ ماڵی مەحموودی مامە عەبدوڵڵای جگەرەچیم گواستەوە و من و قادریان کردە لێپرسراوی. کە بێجگە لە ئێمە کەس نەیدەزانی کتێبخانەکە لە چ ماڵێکە. لە ژووری گەنجینەکە و لە پشتی ماڵەکەیاندا هەمان کتێبخانەمان دروست کردەوە، بێجگە لە مەحموودی ئامۆزام و بەدرییەی خێزانی کەسوکاریش نەیاندەزانی ئەو کتێبخانەیە لەو ماڵەدایە، لە کاتێکدا براکانی بەدرییە ئەندامی پارتی بوون و ڕۆژانە هاتووچۆی ئەو ماڵەیان دەکرد، بەڵام بە بوونی کتێبخانەکەیان نەدەزانی. بێجگە لە کتێبخانەکە بۆ شوێنی، کۆبوونەوەکانی حیزبی شیوعی، ئەوەی پەیوەندی بە کاکە غەفوورمەوە هەبوو، بۆ ماڵی شێخ عەلی بەرزنجی گوازرایەوە، لە دوای ئەو ڕۆژانەوە من و قادر، بە تایبەتی مالیک، بووبووین بە تەتەر و بەردەوام بەڕێوە بووین. پاشان ئەرکێکی ترمان بۆ زیاد بوو، ئەویش گەیاندنی نامە و هەواڵ و ئاگادارکردنەوە بوو، کە شەووڕۆژ بێجگە لە سەرپەرشتیی کتێبخانەکە دەمانکرد، لە نێوان گەڕەکەکانی سەرشەقام و قەزازەکاندا، بە تایبەتی دەرگەزێن و مزگەوتی بابەعەلیدا کە ئەو ڕۆژانە بەهائەدین نووری لەوێ بوو.

من بەرەو ڕووی عومەری عەلی ئەمین کرابوومەوە، کە ئەو کات لێپرسراوی قوتابییان بوو. کە دواتر جێگەی ئەوم گرتەوە. ئەو ڕۆژانە لەماڵی فەتاح بێســارانی و حەمید عوســمان نامەکان دەنووســران و دادەنران، کە کاکە غەفوور بۆ شوێنونی هەر ڕۆژە و لە ماڵێکیان بوو.

لەو ڕۆژانەدا کوڕێکی هاوتەمەنی من بە ناوی قادر فەتاح ماوڕێیی لەگەڵماندا نامەی دەگەیاند، شــاگردی فەتاح بێســـارانی بوو، من و مـالیک بە نهێنی چـاودێریمـان دەکرد، بێ ئەوەی کەس پێی گوتبێن، ئەوەش لە دوای ئەوەوە بوو، کە مالیک بە ئاماژە بە منی گوت: 'لەو کوڕە بە گومانم!'

چونکە من لەو تەمەنەمدا باوەڕی تەواوم بە بۆچوون و هەســـتی مالیک هەبوو، ئەوســـا دەمگوت: 'مالیک هەرچییەک ئەڵێت ڕاســـت دەرئەچێت، تەنانەت ئەزانێت کەی بەفر و باران ئەبارێت.'

هەروەها عەبدوڵڵای عەلی ســـاڵحە فەنی، کە پوورزامان بوو، لە تەمەندا دوو ســـاڵ لە من منداڵتر بوو، بۆ هاوکاریکردنمان هاتبوو، عەبـدوڵڵا کوڕێکی بـاریکەڵەی لۆقن بوو، کە لە چوون و هـاتنەوەدا پێشـــی هەمووومانی دەدایەوە. پێم وا بێت هەر ئەوەش هۆکار بوو، کە ئەوەندەمان گلەیی لە لای کاکە غەفوورم لێ کرد، ئیتر نەیانهێشـــت لەگەڵماندا بێت.

لە نێوان خۆماندا ئاوا ڕێک کەوتبووین، ئەگەر کتێبێکمان بدایە بە کەسێک و لای خۆمان بماننووسیایە؛ بۆ دوو یان سێ ڕۆژ مۆڵەتی خوێندنەوەمان پێ دەدا؛ پاشـــان لە کاتی خۆیدا بەردەرگەمان پێ دەگرت و نەدەڕۆیشـــتین تاوەکوو وەرماننەگرتایەتەوە، پاشـــان لە تەنیشتی ناوەکەیەوە دەماننووسی: 'خوێنەری تەنبەڵ.'

ئەگەر دووبارە ببووایەتەوە، ئەوا جارێکی تر کتێبمان بۆ نەدەبرد و دەمان نووسی: 'خوێنەری فاشیل.'

ئەو ڕۆژانە کاکە عەزیزم، ئیشـــی ئەوە بوو، چاودێریی ئێمە و تەنانەت باوکم و کاکە غەفوورمی دەکرد و دەیپاراستین، بەبێ ئەوەی بهێڵێت کەسمان پێی بزانین. بەڵام من هەردەم ئەوەم دەزانی.

## ١٠

یادەوەرییەک، کە وەک مۆتەکە بەردەوام بە دوامەوەیە. دیارە بیستن یان بەرکەوتنی لە کات و سەردەمی خۆیدا ئاسەواری لەسەر ڕۆحم بەجێ هێشتووە، لەوانەیە هۆکارەکەی ئەوە بێت، گەلێک جار لەگەڵ چیرۆکی بەهاردا بەراوردم کردووە.

غەفووری برام نامەیەکی پێ دابووم بیگەیەنمە ماڵی عومەر عەلی ئەمین، لە گەڕەکی مەڵکەندی و لە کۆڵانی پیرمەسوور، لە گەڕانەوەمدا چووم بۆ دووکانەکەی مام زامن، کاتێک چوومە ژوورەوە ئەو بە دیار زۆپاکەیەوە دانیشتبوو، وەک ئاگای لە هاتنی من بووبێت، لە کاتێکدا پشتی لێم بوو، پرسیی: 'جەلال، چاییەکەت شەکری تێ بکەم یان بە نوقڵەوە ئەیخۆیتەوە؟'

'بە نوقڵەوە!'

ئەو ئێوارەیە لە گەڕەکی مەڵکەندی کچێکی یازدەساڵان، خۆی سووتاندبوو، کەسوکاری بە پۆلیسەکان و دراوسێکانیان گوتبوو، هەواڵەکە بەو جۆرە بە ناو شاردا بڵاو بووەوە. کاتێک من بەرامبەر مام زامن دانیشتم و دەستم هەڵبڕی و لەپم بە ڕووی زۆپاکەدا گرت، مام زامن لە دۆلکەیەکدا چایەکی بەرەو ڕووم ڕاگرت، بە نووکی کلاشە هەڵگەڕاوەکانی شەکردانێکی بۆ نزیکم پاڵ پێوە نا، چەند دەنکێک نوقڵی ڕەنگاوڕەنگی تێدا بوو، تاوەکوو ئەو کاتە لێی نەڕوانیبووم، بەردەوام بە ڕقەوە مژی لە جگەرەکەی بەینی پەنجەکانی دەدا، وەک ڕاویان نابێت، هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو، دوای ئەوەی

دەرگەی زۆپاکەی کردەوە و لە گڕەکەی ڕوانی، ئەو زۆپایەی کە لە منداڵیمەوە نەمدەزانی ئاخۆ بە چی کار دەکات و گڕ دەسەنێت، چونکە لە دووکان یان باشـــترە ماڵیشـــی پێ بڵێم، قەت نەوت یان چڵێک دار چییە نەمبینیبوو، لە کاتێکدا خەڵکی شـار لە زسـتاندا بۆ لیترێک نەوت ســـەرەیان دەگرت یان ماڵەوماڵ دەگەڕان، زۆپاکەی مام زامن بێ دار و نەوت شەووڕۆژ دەگڕا. هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لێی ڕوانیم، دیسان لە گڕی نێو زۆپاکەی ڕوانییەوە و گوتی: 'مرۆڤ بوونەوەرێکی زاڵمە!'

'من گومانم لەوە نییە.'

کیسەی تووتنەکەی بەرامبەرم ڕاگرت: 'ئا دەی، سیغارێک بۆ خۆت و قلێکیش بۆ من وەپێچە.'

کاتێک کیســـەکەم لێ وەرگرت، بینیم، ســـەرپەنجەکانی خوێنیان لێ دەچۆڕا، وەک نینۆکەکانیان دەرهێنابێت، لێم پرســـیی: 'مام زامن، ئەو سەرپەنجانەت بە چی وا زامدار بوون؟'

دەســـتی گێڕایەوە و ســـەری پەنجەکانی لە نێو لەپیدا شـــاردنەوە، وەکوو شـــەرم لە من بکات، یان بیەوێت لێم بشـــارێتەوە. ئەوە یەکەم جارم بوو بەو جۆرە بیبینم. پاشـــان چۆکی دادایە ســـەر زەوییەکە و خۆی گرمۆڵە کرد، وەختا بوو تەپڵی سەری بە زۆپاکەوە بنووسێ، لە بەر خۆیەوە وەک گیاندارێکی بریندار دەینووزاند. لەو کاتەدا من وام زانی لەتاو ئازار وا دەکات، لە ڕاســـتیشـــدا ئەوەم بە خەیاڵدا هات؛ کە تۆ بڵێیت کەسێکی ناحەز یان شەلاتییەکانی شار، هاتبن و لێیان دابێت و نینۆکەکانیان دەرهێنابێت.

کاتێک چووم لە جێگەکەی ئەودا و لە پشـتییەوە دانیشـتم و وەکوو بڵێی لە باوەشـم گرتبێت. گوێم لێی بوو بە دەم نزا و گریانەوە گوتی:

'گوێم لە هاوار و گریانی ئەو کیژۆڵە بوو، پێشـــوەخت هەســـتم کرد ڕوو ئەدات، بەڵام بەختی ئەوم دایە دەست قەزا و قەدەر!'

'ئەو کچەی گوایە خۆیی کوشتووە؟'

'کێ وای گوت؟ پێم نـاڵێیت چ نـا ئینســـانێک ئەو نـاماقووڵییەی فەرمووی؟'

کاتێک ئەمەی پێ گوتم، خۆیی ڕاســت کردبووەوە و بەتووڕەییەوە چاوی بە ڕوومدا داچڕی بوو، منیش خێرا پێم گوت: 'دەی بێقەزا بێت، خۆ ئەزانم درۆ ئەکەن و کوشتوویانە.'

'کاتێک گوێم لە هاوار و بانگی بوو، بۆنی خوێنەکەشی هەناسـەیان لە بەر بڕیبووم، لە حەزرەتان وەک دەڵەسەگ ئەمویست ئەو عەرزەی هەڵکۆڵم و تێی بچم، ئەوەتانێ بزانە ئەو سـەرپەنجانەم پێسـتیان پێوە نەماوە.'

'وام زانی سەری پەنجەکانت...'

'وات زانی چی؟ بۆ تۆ هاواری ئەو کیژەت بەر گوێ نەکەوت، ئەی بۆنی خوێنەکەیت نەکرد؟'

گەڕابوومەوە جێگەکەی خۆم و خەریکی پێچانەوەی سـیگار بووم، لە کاتێکدا مام زامن دیسان خۆی گرمۆڵە کردبووەوە و نووزەنووزی بوو، دواقســـەی لە گوێمدا دەزرینگانەوە، بیرم لێ دەکردەوە و زیاتر ئەو پرســـیارەم لە خۆم دەکرد؛ ئایا ئەوەی مام زامن هەســـتی پێ دەکات، من و خەڵکی شـار هەسـتی پێ دەکەین؟ تۆ بڵێیت کەسـێکی تری وەک مام زامن لە شـــاردا و بە تایبەتی لە گەڕەکی مەڵکەندیدا گوێی لە هـاوار و بـانگی ئەو کچە بووبێـت، یـان بۆنی خوێنەکەی کردبێت؟

به دەم ئەم خەیاڵانەوە دوو سـیغارم پێچانەوە و چەند جارێک بانگم لە مام زامن کرد، کاتێک زانیم وەڵامم ناداتەوە سـیگارەکەی خۆمم داگیرساند. هەردوو سیگارەکەم کێشابوون، نازانم لەو کاتەدا لە چیم دەڕوانی، گوێم لە مام زامن بوو، گوتی: 'دەی مەگەر نەمگوت سیگارێکیش بۆ من وەپێچە!'

'خەیاڵم لای قسەکانی تۆ و ئەو کچە بوو.'

'ئەم بەیانییە برازاکەی وەستا سابیری گەچ دێتە ماڵیان و فرسەت لەو کیژۆڵە ئەهێنێت و پەلاماری ئەدات، ئیتر کەس لە ماڵ نابێت و کاری خۆی لەگەڵ ئەکات، تۆ بیهێنە پێش چاوی خۆت، کیژۆڵەیەکی یازدە سـاڵ و کوڕێکی جاحێڵی بیسـت و پێنج سـاڵ، کاتێک دایکی دێتەوە خوێن بە داوێنییەوە ئەبینێت، کیژۆڵەی بەدبەخت بۆ دایکی ئەگێڕێتەوە. دوای نیوەڕۆ دایکی کیژۆڵەکە بۆ مێردەکەی باس ئەکات، بەو جۆرە کابرا لەگەڵ کوڕەکەیدا ناهێڵن شەوی بە سەردا بێت و بە دار ئەیکوژن و پاشـان ئاگری تێ بەر ئەدەن و لێی ئەگەڕێن، دواتر ئەیکەن بە هاوار و بانگ و خەڵکی بە سـەریاندا دائەبارن، ئەوەتانی ئێسـتاش تێلا خوێناوییەکان لە نێو تەنوورەکەیاندا شـاردووەتەوە، کوڕەی کەتنکەریش لەگەڵ ئەو خەڵکەدا خەمی کوژانەوەی کیژۆڵە مردووەکەی بوو.'

کاتێک مام زامن ئەمەی بۆ گێڕامەوە، هەموو گیانم کەوتبووە سەر ئارەقێکی سـارد، ئیتر نازانم گڕی زۆپاکە بوو یان کاریگەریی ئەو چیرۆکەی مام زامن بۆی گێڕامەوە.

سـیگارێکم بۆ مام زامن پێچایەوە و دامە دەسـتی، دایگیرسـاند و لەگەڵ لێدانی یەکەم مژ، گوتی: 'عەقیدەی ئەوان بریتییە لە تێکسـت و سرووت، لە وەعز و واعیز، لە دوای بیرکردنەوە لە داهێنانی کاهینێک،

وەک چۆن نووسینەکانیان بە کاهین دەست پێ دەکات و لە هەواری یەقیندا بارگە ئەخات. داهێنانی کاهینێک وەک پاساو بۆ پاراستنی لە بەشی نێرینە، بۆ دانانی سنوورێک بە چواردەوری هەوەس و خەونی ژیانی ئەبەدیدا، کاهینی سەر زەوی کە مێیینە بوو، پێشینان "ما" خودایان پێ گوتبوو، دەسەلاتی لە دەست دا و ئیتر بۆ گیانداریکی زەلیل بچووک بووەوە، لە دوای ئەمەوە مێیینەکان تا ئەمڕۆ ئەو دڵشکانەیان پێوە دیارە، ئەو دڵشکانە بوو بە برینێک و نەوە لە دوای نەوە بە دیواری ڕۆحی هەموو مێیینەیەکەوە نووساوە و بەردەوام بوغزی لێ ئەچۆڕێت. ئیتر هەموو مێیینەیەک لە ڕۆژ و ساتی لەدایکبوونییەوە، لە دڵی خۆیدا و بە نهێنی بەردەوام نزا ئەکات! لەو ڕۆژەوە ئەو خەڵکە پشتیان لە "ما" خوداکانی خۆیان کردووە، خۆر لەم نیشتمانەی ئێمە بە پێچەوانەوە هەڵدێت و بەلا و شەڕوشۆڕ یەخەی بەرنەداوین. ئەوە بزانە ئەم خەڵکە هەزاران ساڵە باجی ئەو تاوان و بێعەقڵییەیان ئەدەن!'

مام زامن تاوێک بوو بێدەنگ بووبوو، لەگەڵ هەموو مژێکدا کە لە سیگارەکەی دەدا، لەپی بە سینگیدا دەهێنا، وەک بڵێیت دووکەڵەکەی لە سییەکانیدا گیریان خواردبێت، منیش لە بەر خۆمەوە پرسیم: 'کە واتە نەجاتبوونمان ئەستەمە؟'

'بێجگە لەوە، وزەی ئەو ترس و دڵشکانەی خوداوەندەکان ڕۆحی بوونەوەرەکانی تری ئەم هەرێمەی پێکاوە، لە سەردەمی ڕم و شمشێر و تیر و کەواندا هێشتا بەرەنگاربوونەوە و شەڕی مانەوە لە نێوان گیاندارەکاندا هاوسەنگ بوو، لەو ڕۆژەوە ئەو هاوسەنگییە کۆتایی هات، کە یەکەم تفەنگ گەیشتە ئەم هەرێمە، ئیتر شەڕێکی لاسەنگ دەستی پێ کرد و ڕۆژێک لە مانگی یەکەمی بەهارێکدا

گوللەی ئەو تفەنگە بۆ یەکەمین جار ملی ژنێکی شـــکاند، کاتێک پیاوەکان لە خۆشـیاندا شـاییان لەسـەر خوێنەکەی ئەگێڕا، لە دوای ڕۆژی ڕشـتنی خوێنی ئەو "ما" خوداوەندەوە، ئیتر ترس سـێبەری بە سـەر خەیاڵی هەموو ڕۆحلەبەرێکی مێینەدا کێشـاوە، ترسـی یەکەم ڕاوی نابەرامبەر، ترس لە زوڵم و شـەڕی نایەکسـانی، ترس لە سڕینەوەی سروشتی خۆمان، ترس لە ڕیایی و خۆپەرستی، چەندان سەدە دوای ئەو ڕووداوە، هێشتا ئەو ترسە وەک پەڵەیەکی ڕەش بە سـەر دیواری ڕۆحی مێینەکانەوەیە، لەو ڕۆژەوە هیچ مێینەیەک خۆشـەویسـتی و وەفای بۆ نێرینەکان نەماوە و وەکوو ڕۆحێکی مردووی بێهەست بۆ تۆڵەسەندنەوە جادوو لە نێرینەکان ئەکەن.'

'کەواتە منیش بەر تەلیسمی ئەو جادووە کەوتووم؟'

'ئەگەر تۆش گەمژانە بۆ هەوەس عەشقی بەهار بووبێت!'

بەردەوام هەندێک لە قسـەکانیم، وەک هەموو جارێک پێ دووبارە دەکردەوە، بەڵام ئەو جارەیان لەگەڵ ناوهێنانی بەهاردا، بێدەنگ بووم و نەمزانی چۆن مـام زامن ئەوەی زانیبوو، کە من لە منـداڵیمەوە عەشـقی بەهار بووم، بە داخەوە ئەو کاتە لە مام زامنم نەپرسـی؛ ئایا من چۆن بتوانم دڵی بەهار ڕازی بکەم و بە چ شـێوازێک عاشـقی ببم. دوای ئەوەی زیاتر لە دە سـیگاری پێ پێچامەوە، مشـکییەکەی لە سـەری کردەوە و کردی بە لەچک و لە نزیکی زۆپاکەی پاڵ کەوت، چاوی داخسـتبوو بێدەنگ بوو. کاتێک گوێم لە پرخەی بوو، دوو سـیگارم هەڵگرت و یەکێکیانم داگیرسـاند و ئەوی تریانم خسـتە گیرفانی کراسـەکەم. کاتێک لای مـام زامن هـاتمە دەرەوە، لە نـاو دەرگەی دووکانەکەی مام زامندا ڕێکەوتی سـوبحی فەیلیم کرد، کە لە سـەردەمی منداڵیمدا تەنیا لە لای مام زامن دەمبینی، بەڵام دواتر لە

هەموو جێگەیەک ڕێکەوتم دەکرد و وەک سێبەرەکەم بە دوامەوە بوو. مام زامن دەیگوت؛ سوبحی هێشتا منداڵێکی ساوا بوو، کاتێک کەسوکاری پێش لە دایک بوونی سوبحی لە بیابانی نێوان نەجەف و کەربەلا زیندەبەچاڵ کران، ڕەشەبا ئەوی بۆ ئەم شارە هێنا.

نازانم چۆن و چەندم پێ چوو تاوەکوو گەیشتمەوە گەڕەکی سەرشەقام. گەیشتبوومە ناو دالانەکە، غەفووری برام بەخەبەر بوو، دوو کتێبی لە بندەستدا بوو، بۆ ژێرزەمینەکە دەچوو، لێی ڕوانیم و پرسیی: 'ئەوە لە کوێوە پەیدا بوویت؟'

'خۆت نامەت پێدا نەناردم بۆ عومەر عەلی ئەمین لە گەڕەکی مەڵکەندی!'

'برای ئازیز، کە بۆ کارێکی ئاوات ئەنێرم، بیرت بێت و لە کاتی خۆیدا بگەڕێرەوە، چونکە من دڵم لە لاتە، تۆ ئەزانیت لە کەیەوە ڕۆیشتوویت؟'

'تۆ ڕاست ئەکەیت کاکە، ئیتر کەوتم بە سەر ڕووداوێکی دڵتەزێندا.'

'ڕووداوی چی؟'

'ئەمڕۆ ئەو هەواڵەت بیست؟ گوایە لە گەڕەکی مەڵکەندی کچێک خۆی سووتاندووە؟'

کاتێک من ئەمەم بە کاکە غەفوورم گوت، عەزیزی برام هاتبوو لە شانمەوە ڕاوەستابوو، لێم هاتە پێشەوە و گوتی: 'بەڵێ من بیستم، جەلال ڕاست ئەکەیت، گوتیان خۆی سووتاندووە!'

'کاکە غەفوورم لچێکی هەڵقورتاند: 'لە ئێوەی ئەبیستم.'

' 'ئێستا لای کەسێک بووم، ئاگای لە ڕووداوەکە ئەبێت، کە گوایە لە لایەن باوکی و براکەیەوە کوژراوە و پاشان بۆ شاردنەوەی تاوانەکەیان ئاگریان تێ بەرداوە.'

کاتێک چیرۆکەکەی مام زامنم بۆ گێڕانەوە، کاکە غەفوورم سەری بە سەر کتێبێکدا داهێشتبوو، پێم وا بێت، ئاگای لە قسەکانی من نەبوو، تەنیا ئەوەندە نەبێت گوتی: 'ئێستا ئێوە لە سرێی خۆسووتاندنی ئافرەت دەگەن؟!'

عەزیز بەجێی هێشتین... کاکە غەفوورم تا ڕۆژ بووەوە بە دیار خۆیەوە دانیام و هەشت نامەی پێ نووسیم، دوای تەواو بوونی نامەکان، مالیکی بانگ کرد و تاوەکوو من دانەیەکیانم گەیاند مالیک ئەوانی تری گەیاندبوو، کاتێک من گەیشتمەوە ماڵ، کاکە غەفوورم هەمان قسەی دووبارە کردەوە: 'دەی برا پێم نەوتیت، لە کاتی خۆیدا بگەڕێرەوە، چونکە من دڵم لە لاتە؟'

داوای لێبووردنم لە کاکە غەفوور کرد و بەڵام هۆکاری دواکەوتنەکەم پێ نەگوت، لە گەڕانەوەمدا کامەران موکریم بینی و باسی ئەوەی بۆ کردم، کە ئەو کوڕ و باوکەی دوێنێ کچەکەی خۆیان کوشتووە، پۆلیس گرتوونی، وەک هیچم نەبیستبێت پرسیم: 'دەی خەڵکی نەیانگوت ئەو کچە خۆی سووتاندووە؟'

'نەخێر، بێقەزا بێت، ئەڵێن کوشتوویانە و بۆ شاردنەوەی تاوانەکەیان ئاگریان تێ بەرداوە، تەنانەت، کوتەکە خوێناوییەکەیشیان لەماڵەکەیاندا دۆزیوەتەوە و کوڕەکە لە ترسی پۆلیسەکان هەر لە حەوشەی ماڵی خۆیاندا ئیعترافی کردووە.'

منیش لە خەیاڵی خۆمدا؛ تۆ بڵێیت کاکە عەزیزم خەبەری لێ دابن؟

* * *

سـەرەتای گەیشـتنم بە وڵاتی ئەمریکا، هەفتانە شـیعر و گوتارم لە گۆڤارەکانی ئەسـوات و دەنگی یەکگرتندا بڵاو دەکردەوە، ئەندامێکی چالاکی یەکێتیی دیموکراتخوازانی عێراق لە ئەورووپا بووم. هەروەها سـەرپەرشـتی کۆمەڵەی نیشـتمانی بووم لە کەنەدا و ئەمریکا. دوو کۆرسی فێربوونی کۆمپیوتەرم وەر گرتبوو، لەگەڵ ئەمانەشـدا نامەم بۆ زانکۆی ولایەتی تەکسـاس ناردبوو، بۆ خوێندن و لە هەمان کاتیشـدا دەرس گوتنەوە، چونکە ئەوەم بیسـت، کە ئەو زانکۆیە بەنیازی کردنەوەی بەشی زمان و مێژووی کوردی بوون. شەووڕۆژ سـەرقاڵ بووم و هەسـتم بە ماندوویەتی نەدەکرد، هاوشـێوەی ئەو ڕۆژانەی سەرنووسەری گۆڤاری بەیان و هاوکاری بووم.

ئەو ڕۆژەی لە زانکۆی بیسـمارک گەڕامەوە، ویسـتم بە تەنیا ئاهەنگێک بگێڕم، لەبەر ئەوەی ڕەزامەندیی خۆیان دەربڕی، کە دوای سـاڵێک خوێندنی زمان لەوێ دەتوانم ئەدەب و زمانی ئینگلیزی بخوێنم، لە خۆشـیاندا لەسـەر نووکی پێکانم دەڕۆیشـتم. بەڵام ئەو دڵخۆشییەم زۆری نەخایاند.

کاتێک گەیشـتمە ماڵەوە و بە نیازی خواردن دروسـتکردن بووم، غەفووری برام تەلەفۆنی بۆ کردم. زۆری پێ چوو تـاوەکوو ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاندم، کە لە سـلێمانی عەزیزی برامیان کوشـتووە. پێکەوە تاوێک بێدەنگ بووین و ئەو هەوڵی ئەوەی دەدا دڵنەواییی من بکا، بەڵام خۆی پێ ڕانەگیرا و تاوێک دەسـتمان کرد بە گریان و هەر بەو جۆرەش بەبێ ماڵئاوایی، کاکە غەفوورم دەنگی نەما.

خەیاڵم تەنیا لە لای ئەو قسـەیەی کاکە غەفوورم بوو، کە گوتی: 'ئەبێت کێ عەزیزی کوشـتبێت؟ تۆ بڵێیت بۆ تۆڵەسـەندنەوە لە ئێمە بووبێت؟'

دوای ئەوەی بە تەنیا شـینێکم بۆ لەدەسـتدانی عەزیزی برام گێڕا، عەزیزی برا و هاوڕێ و پارێزەرم. بە خەیاڵ گەڕامەوە بۆ سـاڵی ١٩٧٤ و دوو سـاڵ پێش کوژرانی عەزیزی برام. ئەو کاتە عەزیز لە بەندیخانەی ڕایەت گیرابوو، منیش لەگەڵ کۆمەڵێک لە هاوڕێکانم دوو خێمەمان هەڵدابوو، لە ڕادیۆی شـۆڕش کارم دەکرد و بۆ ڕۆژنامەی برایەتییش دەمنووسی. بێجگە لەوەی کتێبخانەیەکم بۆ پێشمەرگەکان دانابوو. کاتێک دوای هەوڵێکی زۆر، ئاسـۆی کوڕی کاکە عەزیزم و براژنە شـیرینم چوون و چاویان پێی کەوتبوو، ئەوەیان گوت؛ گوایە بە زنجیر بەستوویانەتەوە و لاواز بووە و خەریکە چاوەکانی لەدەست دەدات، ئەگەر هەفتەیەکی تر لەو جێگەیە بمێنێتەوە دەمرێت، براژنە شیرینم زۆر گریا و کڕووزایەوە. منیش لەگەڵ دارای تۆفیقە فەنی، کە لێپرسـراوی ڕاگەیاندن بوو چووم و لە لای ئیدریس بارزانی خۆی، داوام کرد، عەزیزی برام ئازاد بکەن. ئەوە بوو بە داواکارییەکەمان ڕازی بوون و عەزیز ئازاد کرا، ئەویش دوای ئەوە لە چۆمان لەگەڵمان مایەوە، پێم وا بێت دووکانێکی قاپوقاچاخ فرۆشی دانابوو.

جەبار کوردی، یان باشـترە بڵێم جەبار فەیلی لە نیوەی شـەودا خۆی کرد بە ناو خێمەکەماندا، تاوەکوو جامانە و عوینەکەی لا نەبردن، نەمناسـییەوە، لە بەرچاوی هاوڕێکانمدا هیچم پێ نەگوت، کـاتێـک چووینە دەرەوە، پێی گوتم: 'پێویسـتە عەزیزی برات بە زووترین کات لێرە بڕوات، چونکە ئەمری کوشتنی دەرچووە!'

'بۆچی و لەسەر چی؟'

'ئێمە نۆ کەسـین و پاراسـتنی پارتی بڕیاری کوشـتنی هەموومانی داوە.'

'عەزیزی برام بە ئەمری ئیدریس بارزانی ئازاد کراوە و لێی خۆش بوون!'

'موستەحیلە، ئەوانەی دوو ساڵێک پێش ئێستا لە سلێمانی، لە ماڵی عەزیزی برات بۆ مەبەستی دروستکردنی پارتی دیموکراتی یەکگرتووی کوردستان کۆ بوونەوە، بڕیاری کوشتنی هەرنۆمان دەرچووە، بۆ زانیاریت، لە ئێستادا کە من قسە لەگەڵ تۆدا دەکەم چەند کەسێکمان لە ژیاندا نەماوین. جەلال بۆ زانیاریت؛ باوەڕ ناکەم سەرکردایەتیی باڵای پارتی ئاگاداری ئەم بڕیارە بن، پێ دەچێت دەستێکی دەرەکی بێت، دوور نییە دەستی بەعسییەکانی تێدا نەبێت. ئەی تۆ ئەوەت لەبیر چووە، کە کاتی خۆی عەزیز لە بەغدا تەقەی لە نازم گوزار کرد.'

'ئەرێ تۆ باسی چی دەکەیت، نازم گوزاری چی؟ باشە ئێوە کێ بوون و چۆن ئەو بڕیارەتان دابوو، مەبەستتان لە دامەزراندنی ئەو پارتە چی بوو؟'

'بەندە، حاجی ئیبراهیمی شاتری، مەحموودی حاجی، میرزا حەسەنی نەورۆڵی، قادر برسی، ستاری سەعید خەڵەف، عەزیزی میرزا کەریم، لەگەڵ فاخر مێرگەسۆری و جەوهەری برای. حیزبی شیوعی و پارتییش دروستکردنی پارتێکی لەو جۆرە بە خەتەر بۆ سەر خۆیان دەزانن. مەبەست لە دروستکردنی ئەو پارتە؛ کۆکردنەوەی چەپ و نەتەوەییەکان بوو پێکەوە. بۆ زانیارییت، عەزیز محەممەدی سکرتێری حیزبی شیوعییش ئاگاداری بڕیاری ئەم ئیختیالاتەیە. لە ڕاستیدا کاتی خۆی هەمووی سوچی فاخر مێرگەسووری بوو.'

'ئەی ئێستا تۆ چی ئەکەیت لێرە؟'

'لەگەڵ قادر برسـی هاتم، ئەو لە شـەقلاوەیە و منیش بەو جۆرەی کە دەمبینیت خۆم گەیاندە ئێرە، ویسـتم ڕاسـتەوخۆ بۆ لای عەزیز بڕۆم، بەڵام نەمتوانی، وا بزانم تۆش برای ئەویت و وەک من خەمتە.'

'دوێنێ هەواڵی ئەوەم بیسـت، کە فاخر مێرگەسـۆری و چەند برایەکیان کوشتووە.'

'بەڵێ، قابیلە، خۆ من درۆت عەرز ناکەم!'

من ئەو نهێنییەم دەزانی، بەڵام بێجگە لە عەزیزی برام لە لای کەس باسـم نەکردبوو، کاتێک لە چۆمان بە کاکە عەزیزم گوت، لە وەڵامدا گوتی: 'منەتیان نەبێت!'

# ١١

دەمەوئێوارەی ڕۆژی هەینی بوو، پێش خۆرئـاوابوون. غەفوور پیاوێکی تەمەنچلساڵە و کوڕێکی باریکەڵەی چواردە بۆ پازدە ساڵانی لەگەڵ خۆیدا هێنابووەوە. کاتی شـێوخواردنی ئێوارە بوو. لەو ڕۆژانەدا لەو ماڵە گەورەیەدا جێگە بۆ ژنەکـان نەمـابوو. بە ڕۆژ دەهاتن، کاری ماڵیان دەکرد و چێشـتیان لێدەنا و پاشـان بۆ خەوتن دەچوون بۆ ماڵی عەبدوڵلای جگەرەچی.

غەفوور گوتی: 'کاک سـەعید ناکام داوای لێ کردم، کە ئێمە پەنای ئەو دوو برا ئاوارەیە بدەین.'

ئـاوارەکـانی ڕۆژهەڵات گەلێـک زۆر بوون، بە شـــاردا بڵاو بووبوونەوە و هەرمـاڵە و پەنـای چەند کەسـێکی دابوو. کە دوای ڕووخانی کۆماری مەهاباد لە دەست ڕژێمی شا ڕایان کردبوو.

'ئەمڕۆ لە چایخانەکەی بەکر بوون، وا بزانم دوێنێ شەویش لەوێ نووستبوون.'

دوای ئەوەی غەفوور ئەمە بـە بـاوکی دەڵێـت، پیـاوەکە بە عەبدولڕەحمان زبیحی خۆی دەناسـێنێت و کوڕە گەنجەکەش، دەڵێت من ڕەحیم موکریانیم.

ئەو شـەوە لە دیوەخـانەکەی میرزا کەریم، کە غەفووری کوڕی نـاهێڵێت کەس پێی بڵێت دیوەخـان، بەڵکوو تەنیا دەبێت ژوورەکەی میرزا کەریمی ناو بێت، دەڵێت: 'دیوەخان لە ماڵی شـێخ و ئاغا و دەرەبەگەکانە.'

ژوورەکەی میرزا کەریم زیاتر لە سـێ کەسـی لێ دەبێت، کاتێک دەست دەکرێت بە باسی سیاسەت، لە بیری چەپ و ڕاستەوە بگرە تا فەلسـەفەی پێکهاتەی سیاسـەت و دین. عەبدولڕەحمان زبیحی بوار بە کەسیان نادات، یان باشـترە بڵێین هەموویان چاویان لە دەمی زبیحی دەبێت. باسـی کەموکورتی و هۆکاری شـکسـتی کۆماری مەهابادیان بۆ دەکات، هەموو بێدەنگ گوێی لێ دەگرن، کاتێک ئەو قسـە دەکات کەس سەرنجی نابێت و قسەکانی پێ نابڕن.

دواتر باس دێتە سـەر ناوی شـاعیرەکانی کۆماری مەهاباد، عەبدوڵڵا گۆران دەڵێت: 'شیعر کاریگەریی زۆری لەسەر شۆڕشەکان هەیە.'

ڕەحیم موکریانی لە نێوان جەلال و قادردا تەنیا سـەری دیار بوو، لە پێشدا دەستی هەڵبڕی و پاشان کە لێیان ڕوانی، گوتی: 'ئەو دەمەت خۆش، مامۆستا گۆران هەر شۆڕش نا، مەجلیسیش بێ باسی شیعر و ئەدەب، بێئەرزشە.'

میرزا کەریم لـە ڕەحیمی ڕوانی: 'دەی ڕۆڵـە گیـان، مەجبوورین باسـی سـیاسـەت بکەین، لەوانەیە ئێوە ئاگادار نەبن، ئەوە هەفتەیەکی تر هەڵبژاردنە و ئا لەم مەجلیسـەیدا بەندە و دوو کەسـی تر خۆمان هەڵبژاردووە.'

'هەڵبژاردن، بۆچی؟'

زبیحی کاتێک ئەمەی پرسـی، میرزا کەریم لێی ڕوانی و گوتی: 'بۆ پەرلەمانی عێراق، ئێمەش بۆ نوێنەری ناوەندی سـلێمانی خۆمان هەڵبژاردووە.'

'دەی ماندوو نەبن و سەرکەوتوو بن.'

زبیحی وای گوت، پاشـــان باســـەکەی گۆڕی و ڕووی لە ڕەحیم موکریـانی کرد و گوتی: 'بەڕێزان، کـا ڕەحیم، جگە لەوەی خەتی خۆشـــە و زمانە کوردییەکەشـــی ئێجگار خۆش و پاراوە، گەلێک شـــیعری شـــاعیرانی لە بەرن، هێند لێزانانەش شـــیعر دەخێنێتەوە، سەرت سوور دەمێنێ.'

ئەوجا ڕەحیم لە ســـەرچۆکان، نیو مەترێک لە ڕیزی دانیشـــتووان چووە پێش و بێدەنگ لە زبیحی ڕوانی: 'خوایشتەکەم مامۆستا.'

مام مســـتەفای برای میرزا کەریم، کە بەرامبەر ڕەحیم دانیشـــتبوو، پێی گوت: 'دەی بزانین کوڕیلە چیمان بۆ ئەخوێنیت؟'

'ئەگەر دەست و بردی لێ نەکەیت، دوایی خۆشت گوێت لە دەنگی خۆت نابێت، چونکە ئەم مەجلیســە چەند شـاعیر و گۆرانیبێژێکی زۆر دەنگخۆشی تێدایە.'

میرزا کەریم بەردەوام بوو: 'ئەگەر ئاوا بێت مامۆســتاکەت مەدحت ئەکات، ئەوا ســـبەینێ کراس و ڕانکێک لەگەڵ جووتێک پێڵاوت عایدی من بێت.'

کە ڕەحیم ئەمەی بیست، خۆی ڕاسـت کردەوە و سـەری هەڵبڕی، پێش ئەوەی شـــیعر بخوێنێـت، زبیحی گوتی: 'ڕەحیم گیـان، هەر شـیعرێکی دەخوێنیەوە، لە پێشـدا ناوی شـاعیرەکەی بڵێ و مەیکە بە شـــیعری خۆت، ئەم مەجلیســـە هەموو خوێندەوارن و دەنا دوایە بەر تانەوتەشەریان دەکەوین.' هەموو پێکەنین.

ڕەحیم شیعرێکی هێمن موکریانیی خوێندەوە، پاشان کاتێک بێدەنگ بوو، حەمەساڵح دیلان شیعرەکەی هێمنی بە مەقام خوێند. ئەو شیعرە پێشتر لە ڕۆژنامەی کوردستاندا بڵاو کرابووەوە.

ئەو شـــەوە ڕەحیم موکریانی لە ژووری کوڕەکان نووســـت، کە حەلاوەخان ئاوای بەو ژوورە دەگوت، کە ژووری جەلال و قادر بوو، جەلال و قادر تاوەکوو بەیانی دانیشـــتن و ڕەحیمیش شـــیعری بۆ خوێندنەوە. مالیک زوو نووســـت و لێیان بێزار بوو، چونکە جەلال ئامادە نەبوو بە ئاماژە واتای شیعرەکان بۆ مالیک لێک بداتەوە.

دوای ئەو شـــەوە، زبیحی و غەفوور بوون بە هاوڕێ و بەردەوام ســـەریان نابوو بەیەکەوە و چپە چپیان بوو. هەروەها ڕەحیمیش بێدەنگ بە دوای جەلال و مالیکەوە بوو، ئەوەندە بێدەنگ بوو، ئەگەر مالیک نووزەیەکی لێوە بهاتایە، ئەو ئەوەشی نەبوو.

زبیحی بە غەفوور دەڵێت لە هەڵگرتنەوەی پیتە کوردییەکاندا بۆ چاپخانە شارەزاییی هەیە. کاتێک غەفوور لە شەقامی سابوونکەران و بەر ماڵ و قوتابخانەکەی کەشـــتیی نوحی نەجمەدینی مەلادا باســـی زبیحی بۆ پیرەمێرد دەکات، لەگەڵ غەفووردا بۆ ماڵەوە دێت و قســـە لەگەڵ زبیحیدا دەکات. دوای ئەو ڕۆژە، زبیحی لە ڕۆژنامەی ژین دەست بەکار دەبێت.

زەبیحی کـاتێـک دەبینێـت زۆربـەی نـامـە و بڵاوکراوەکـانی ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی دەستنووسن، لە شوێنی کتێبخانەکەی مـاڵی مەحموودی عەبـدوڵڵای جگەرەچی، دەســـت دەکـات بە دروســـتکردنی ڕۆنیۆیەک. زبیحی بە شـــەو لەوێ دەبێت و جەلال و قـادر بەردەســـتیی دەکەن. تـاوەکوو ئەو بەیـانییەی بێگـەرد، کچە چوارســـاڵانەکەی مەحموود، بە تەنیا دەچێتە پشـــت خانەکە و کەتیرە دەخوات. کاتێک بۆ نەخۆشخانەی دەبەن، دەڵێن گوایە دارتاشن. چوار ڕۆژ لە نەخۆشـخانە دەیخەوێنن، مانگێک دوای چاکبوونەوەی بێگەرد،

زبیحی ڕووی نایەت بۆ ئەو ماڵە بچێتەوە و چاوی بە مەحموود و بەدرییە بکەوێتەوە.

ئەو ڕۆژانەی بۆ لای بێگەرد بە ڕێگەی نەخۆشخانەوەن، زبیحی و غەفوور ڕێکەوتی ئەحمەد شوکری دەکەن، کە لەو نەخۆشخانەیە برینپێچ دەبێت، کاتێک باسی خۆییان بۆ دەکات، بە تایبەتی کاری چاپ و پیت هەڵگرتنەوە، لێی دوودڵ دەبن و وا دەزانن بە کارەکەی ئەوانی زانیوە و پێ دەچێت جاسووسی میری بێت. بەڵام کە دەڵێت؛ چووە بۆ لای پیرەمێرد و بەویشی گوتووە، بۆچوونیان دەگۆڕێت و ئەو ئێوارەیە لەگەڵ خۆیاندا بۆ ماڵی میرزا کەریمی دەهێننەوە.

پاشان هەموو کەرەستەی دروستکردنی ڕۆنیۆکە، کە عەلائەدین سەجادی لە بەغدا بۆی پەیدا دەکردن و میرزا کەریم بۆ سلێمانیی دەهێنایەوە. لە ماڵی مەحموودەوە دەیهێننەوە ژێرزەمینەکەی ماڵی میرزا کەریم. ئەحمەد شوکری، پێی گوتبوون هاوڕێکانی پێی دەڵێن دکتۆر شۆ، لەگەڵ زبیحی بە هەفتەیەک چاپخانەیەکی بچووکیان دامەزراند. دوای ئەوەی تەواو بوون، غەفوور پێی گوتن: 'دەستان خۆش بێت، ئەوە لە سایەی سەری ئێوەوە حیزب بوو بە خاوەنی ڕۆنیۆی خۆی.'

زەبیحی دەڵێت: 'چما بە خۆمان ئەوەی نازانین، ئێمەیش بۆ ئەو حیزبەی نەبا دروستمان نەدەکرد.'

ڕۆژێک دوای تەواوبوونی ڕۆنیۆکە، عەبدوڵڵا گۆران دەفتەرێکی ڕەشنووسی شیعرەکانی هێنابوو. بە پێکەنینەوە پێی گوتن: 'ئەزانن هاوڕێیان بە سەرەیش بێت، سەرەی چاپکردنی ئەم شیعرانەی منە.'

'جا خۆ ئەو شـــیعرانەی ئەتۆ قاچاخ نین، ئێمە ڕۆنیۆمان بۆ چاپی شیعری دانەناوە. بڕۆ لە جێگەیەکی دیکەی چاپ بکە!'

زەبیحی کاتێک ئەمەی بە تووڕەییەوە گوت، هەموو لێیان دەڕوانی و پێی پێکەنین، زەبیحی ســـەری لێ ڕاوەشـــاندن و بێدەنگ بەجێی هێشتن.

## ١٢

سالی ١٩٤٨

تەمەنم سـیازدە سـاڵ بوو، لە پۆلی یەکی ناوەندی بووم، مانگی دووی ئەو سـاڵە لەگەڵ باوکم و کاکە غەفوورم چووم بۆ بەغدا، باوکم کامێرایەکی وێنەگرتنی مارکەی *رۆلەیی* بە دیاری بۆ کڕیم، لەگەڵ هەموو ئەو پێداویسـتییانەی وێنەگرێک پێویسـتی پێیەتی، تاوەکوو خۆم لە ماڵەوە بتوانم وێنەکانیش بشـۆمەوە. پێشـتر بۆ ئەو مەبەسـتە دوو مانگ شـاگردی و بەردەسـتیی ڕەفیق مەحموودی وێنەگرم کردبوو.

لەو سـاتەوەی لە شـەقامی بەتاوین کامێراکەمان کڕی، شـەووڕۆژ تەنانەت بۆ خەویش لە ملمدا بوو، بە خەون و خەیاڵ هەزاران وێنەم لەو شـەقامانەی بەغدا پێ گرتن، بەڵام لە ڕاسـتیدا یەک جار چییە زوومەکەیم نەچرکاند، تەنانەت وێنەیەکی باوکم و کاکە غەفووریشـم پێ نەگرت.

کاتێک بۆ سلێمانی گەڕاینەوە بە زۆربەی کۆڵان و شەقامەکاندا گەڕام و کامێراکەم پیشـانی هەموو هاوڕێکانمدا. قاتێک چاکەت و پانتۆڵم لەبەر کردبوو، کە باوکم سـاڵی پێشـوو لە هەنگاریا بۆی هێنابووم. چووم بۆ لای ڕەفیقی وێنەگر، پێی گوتم؛ کە ئەو کامێرایە لەوانەی ئەو تازەتر و باشـترە. تەنانەت ڕەفیقی وێنەگریش داوای لێ کردم کە تاقیی بکەمەوە و وێنەیەکی پێ بگرم، بەڵام ڕازی نەبووم. ئەو ڕۆژە

یەکەم وێنە کە چرکاندم، وێنەی بەهاری غالب عەربەتی بوو. لە دەرگەکەیانمدا و دوو مەترێک چوومە داوە و چاوەڕوان بووم کێ دەرگەکە دەکاتەوە، کاتێک لە زوومی کامێراکەمەوە بینیم، خۆی گۆڕیبوو، قژی شانە کردبوو، چەپکێک گوڵی نێرگزی بە دەستەوە بوو، وەکوو زانیبێتی، زەردەخەیەکی بۆ کردم و چەپکە نێرگزەکەی لەسەر سینگی ڕاگرت و لێی ڕوانیم، منیش وێنەکەم چرکاند. بەهار پیرۆزبایی کامێراکەی لێ کردم، منیش شەرمنانە و بێدەنگ بەجێم هێشت.

ئەگەر بگەڕێمەوە سەر باسی ئەو ڕۆژانەی لەگەڵ باوکم و کاکە غەفوورم لە بەغدا بووین. ئەوەندەی من ئاگاداربم تاوەکوو ئەو ڕۆژانە کاکە غەفوورم لە نێوان کاری ڕۆژنامەوانی و ئەندامێتی لە حیزبی شیوعیدا هێشتا خۆی یەکلایی نەکردبووەوە. بە تایبەتی کێشەی ناوخۆیی حیزبی شیوعی، وەک خۆی دەیگوت؛ کتلەبازی و خۆپەرستی،ماندووی کردبوو. لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا بزووتنەوەی نەجمەیان دامەزراندبوو، کە زۆر دڵنیا نەبوو لە پاشەڕۆژی بزووتنەوەکە.

لە بەغدا لەگەڵیدا بووم کە چاوی بە عەلائەدین سەجادی و ئیبراهیم ئەحمەد کەوت. بە بیرم دێت ئەوان داوایان لێ کرد، بچێتە بەغدا دابنیشێت و لە دەرکردنی گۆڤاری گەلاوێژدا هاوکاریان بێت. کاکە غەفوورم بۆ پێنج ساڵ دەچوو لە ژێر ناوی جیاوازدا لە زۆربەی ژمارەکانی ئەو گۆڤارەدا گوتاری بڵاو دەکردەوە. هەروەها بۆ گۆڤاری نزار دەینووسی کە عەلائەدین سەجادی سەرپەرشتیی دەکرد. ئەوەی

دەینووسی من بۆم دەگەیاند. گوتار و نووسینەکانی تاوەکوو دەهات زیاتر باسیان لە کێشەی چینایەتی دەکرد. ئەوەم دەزانی، چونکە بە دزی کاکە غەفوورمەوە هەموویانم دەخوێندەوە. ئەو ڕۆژە عەلائەدین سەجادی ئەوەی بە کاکە غەفوورم گوت: 'غەفوور خۆزگە تۆ تەنیا خۆت بۆ نووسین تەرخان دەکرد، چونکە دەرک و ئیدراکی تۆ لە توانای زۆربەی نەوەکانی سەردەمی خۆت بەرزترە.'

'لە نێوان سیاسەت و نووسیندا دووکەرت بووم و خۆم بۆ یەکلایی ناکرێتەوە، بەڵام کە ئەبینم زۆربەی خەڵکی ئێمە نەخوێندەوار و هەژارن، هەست ئەکەم دەبێت تێکەڵیان بم و لە نزیکەوە هاودەنگ و هاوخەمیان بم. بە کورتی؛ ناتوانم ڕۆژێک لێیان دوور بم، تەنیا ئەوەشە وام لێ ئەکات کە شیوعی بم.' ئەو ڕۆژە کاکە غەفوورم ئاوا وەڵامی عەلائەدین سەجادی و ئیبراهیم ئەحمەدی دایەوە.

ئەو ڕۆژانەی ئێمە لە بەغدا بووین، خەڵکی لە خۆئامادەکردندا بوون بۆ هەڵبژاردنی نوێنەرانی پەرلەمانی عێراق. ڕژێمی پادشایەتی گرنگییەکی زۆری بە شاری سلێمانی دابوو. بۆ هەڵبژاردن، نەتەوەیی و چەپەکان کاندیدیان لە هەموو گەڕەکەکان هەبوو. لە گەڕەکی سەرشەقام میرزا کەریمی باوکم و عەزیزی حەمەڕەش، لەگەڵ نامیق ئاغا خۆیان کاندید کردبوو. شەریف ئەلشێخ، کە لە بەغداوە لەگەڵ ئێمە هات بۆ سلێمانی، لەگەڵ مەحموود فەقێ محەممەد هەمەوەندی خۆیان بۆ ئەندام پەرلەمان لەسەر لیستی تەحەڕوڕ هەڵبژاردبوو. دەنگی ئەو سێ کەسە و دەنگی دانیشتووانی گەڕەکەکانی تری ناوەندی سلێمانیان بەدەست دەهێنا. ماڵی ئێمە بووبوو بە بنکەی بانگەواز بۆ هەڵبژاردنەکان و شەووڕۆژ پڕ بوو لە خەڵک.

دوای نیوەڕۆ بوو کە گەیشـــتینەوە ســـلێمانی، کاکە غەفوورم خێرا هـاوڕێکـانی لـە مـاڵی خۆمـان کۆ کردەوە، پێی گوتن: 'بۆ پووچەڵکردنەوەی دەنگی لایەنگرانی ئێمە چەندان بەکرێگیراویـان بۆ ئەو مەبەســـتە ڕاســـپاردوون. بێجگە لەوە دەرەبەگ و شـــێخ و بەرژەوەنـدیخوازەکـان، ئەوانەی زۆرینەی میللەتی کورد گۆرانییـان بەسـەردا هەڵدەدەن، مەلاکانیش لە ڕۆژانی هەینیدا ستایشیان ئەکەن. هەموویان ئەندامی پارتە عەرەبییەکانی وەک: یەکێتیی دەســـتوور و نەتەوەییی ئیشـــتراکیی. زۆر ئەســـتەمە ئێمە و پارتییەکان بتوانین بەرەنگاریان ببینەوە و دەنگی پێویســـت بهێنین. چونکە دۆســـتانی بنەماڵەی مەلەکییەت و لایەنگرانی یەکێتیی دەســـتوور و نەتەوەییی ئیشـــتراکی عەرەبی لە ســـلێمانی و شـــار و شـــارۆچکەکانی تری کوردستاندا پێش ئێمە ڕەگیان داکوتاوە و دوو قاتی ئێمەن.'

کەریم ئەحمەد لە وەڵامدا پێی گوت: 'ئیتر ئەوە ڕێگەی خەباتە، کەواتە ئیشمان زۆرن!'

ئەحمەدی حەللاق: 'بەڵێ، ئێمەش کۆڵ نادەین و ناچارین ماڵ بە ماڵ بگەڕێین، بە نامە زۆربەی خەڵکی ئەم شارە لە سیاسەتی خۆمان ئاگادار دەکەینەوە.'

دوای ئەم گفتوگۆیە، کە تاوەکوو شـــەو درەنگی خایاند و من ماندووی ڕێگە بووم و وا بزام لە نێوانیاندا بە دانیشتنانەوە خەوم لێ کەوتبوو. ڕۆژی دوایی پێش تاریکوڕوون لەخەویان هەڵساندم، دایکم گوتی؛ کاکە غەفوورم خەو نەچۆتە چاوی. پاشـــان منیان بۆ کڕینی کاغەز و مەرەکەب کڕین نارد، کاکە غەفوورم بۆ نووســـینی نامەکان پرسی بە هاوڕێکانی، بە تایبەتی زبیحی و عەبدوڵلا گۆران کردبوو.

شـــەوی دواتر، لە ژێرزەمینەکە بە دیار چرایەکەوە دانیشـــتین و نامەکانمان نووسینەوە. لە خوارەوە ناوی کاندیدەکەمان دەنووسـی و هەر خۆیشـمان ئیمزامان دەکرد. بە ناوی کاندیدەکانەوە نووسـرابوو: 'ئەگەر دەنگی پێویسـت بهێنم و هەرچی پۆسـتێک لەم شـارە بگرمە دەست، گرنگی بە خوێندەواری ئەدەم و بازاڕ ڕێک ئەخەم، تێئەکۆشم بۆ مافی جووتیار و هەژار.'

دوو هەفتە پێش ئەو ڕۆژە قادری برام هـاوڕێیەکی قوتـابخانەی بە ناوی مســـتەفا ســـاڵح کەریم لەگەڵ خۆیدا هێنابووەوە، بە دایک و باوکمی گوت؛ گوایە پۆلیس بە دوایدا دەگەڕێت. مسـتەفا خەتی خۆش بوو. لەگەڵ ئەحمەد شـــوکری برینپێچ، کە تەنیا زبیحی بە نازناوی دکتۆر شـــۆوە بانگی دەکرد، لەگەڵ ئەحمەدی حەللاق و محەممەد حەمەئەمین قـادر لە نووســـینەوەی نـامەکـاندا بەشـــدار بوون. نووســـەرەکان بە ژمارە هەشـــت کەس بووین و لە نێوان خۆماندا کردبوومـان بە پێشـــبڕکێ؛ کێ بێ هەڵە و بە خەتی جوان نـامەکان دەنووســـێت. یەکێک لەوانە ڕەحیم موکریـانی بوو، کە هەر زوو نازناوی ڕەحە شێتمان بە سەردا دابڕی.

ناوی هەموو ماڵەکانی گەڕەکی سـەرشـەقام، چوارباخ، هەندێک ماڵ لە گەڕەکەکانی ترمان نووسـیبوو، تەنانەت گەڕەکی جوولەکانیشـمان لێ نەپەڕاند. من یەکێک بووم لەوانەی یەکـیەک نـامەکـانم دەگەیاند. کاکە غەفوور پێی گوتم: 'بە تایبەتی بیدەرە دەســـت خۆیان و پێیان بڵێ، ئەوە نامەی تایبەتیی فڵان کاندیدی حیزبی تەحەڕوڕە بۆ بەڕێزت و خۆی ڕێز و ئیحترامی هەبوو.'

کاکە غەفوور ئەوەی چەند جارێک لێ دووبارە کردمەوە، کە لەوە زیاتر هیچی تر نەڵێم، تەنانەت ئەگەر لێشـــیان پرســـیم، وەڵامی هیچ نـەدەمەوە. تـەنیـا ئـەوەنـدە نـەبێت؛ ئـەگـەر مـاڵێـک بمـانزانیـایـە نەخوێندەوارن، ئەوا نامەکەیان بۆ بخوێنمەوە. بێجگە لەو نامەیەی کاکە غەفوورم دابووی بە یاقووب ئەولێی هاوڕێی و لە کنێســـەتەکە بۆ جووەکانی گەڕەکی جوولەکانی خوێندبووەوە.

کاتێک بۆ گەیاندنی نامەکان لە ماڵ هاتمەدەر، گیرفانی بەرباخەڵ و شــــەرواڵەکەم بڕ بوون لە نامە، بۆچی ویســـتم لە ماڵی غالب عەربەتییەوە دەســـت پێ بکەم؟ نازانم، کە دەبوایە نامەکەم بدایەتە دەســـت غالب خۆی و لە ڕێگەی ئەوەوە بە جووتیاران و خەڵکی عەربەت بگات. لە دەرگەی ماڵی غالب عەربەتیم دا، کامێراکەم لە ملدا بوو. بەهار دەرگەکەی لێ کردمەوە. کاتێک چاوم بە بەهار کەوت، لە بیرم چووەوە بۆچی لە دەرگەکەیانم دابوو. بەهار فەرمووی لێ کردم و پێی گوتم: 'هاتوویت دیســـان وێنەیەکی ترم بگریت؟! حازر نیم، جەلال گیان ڕجات لێ ئەکەم، حازر نیم.'

وەڵامم نەدایەوە، بێدەنگ دەســـتم هەڵبڕی و نامەکەم بەرەو ڕووی ڕاگرت. دەســـتم دەلەرزی، بەهار بە پێکەنینەوە دەســـتی گرتم و ڕایکێشامە ئەو دیو دەرگەی حەوشەکەیان، خۆیی لێ نزیک کردمەوە، پێی گوتم: 'چەند کوڕێکی چاو قایمیت!'

لـە نـامـەکـەی نـەڕوانی و لـە گیرفـانی بـەربـاخـەڵی لای چـەپی ســــوخمەکەیدا هەڵیگرت. ویســـتم ئەوەی پێ بڵێم؛ کە ئەو نامەیە بۆ باوکت نووســـراوە، بەڵام کاتێک بەهار دووبارە دەســـتی گرتمەوە، عارەقەم کرد و بێدەنگ بووم، بەهار بەردەوام لە چاومی دەڕوانی و

له بەر خۆیەوە پێی گوتم: 'من پێت ئەڵێم ئازیزم جەلال گیان، ئەی تۆ چیت لە دڵدایە بە منی بڵێیت؟'

هەرچەند هەوڵم دا نەمتوانی هیچی پێ بڵێم، پاشـــان ئەو گرێی لچکی فەقیانەکەی کردەوە و پارچەیەک پەڕۆی لوولکراوی خستە نێو مشتم، پێی گوتم: 'دوایی جوان لێی بڕوانە!'

بەهار خۆی لێ نزیک کردمەوە و ماچێکی ڕوومەتمی کرد، نازانم بۆچی خێرا دەستم لە دەستی بەهار دەرهێنا و هەنگاوێک لێی چوومە دواوە، جەســـتەم گەرم داهاتبوو، هەســـتم دەکرد پێڵاوەکانم بە پێم تەنگن و گوێم لە لێدانی دڵی خۆم بوو، باس لە لەزەت و دڵخۆشـــی ناکەم، بەڵام لەو ســـاتەدا هەســـتم دەکرد ئەو بەرکەوتنەم بۆ ســـەر ڕۆحم گران بوو، چاوم پڕ بووبوون لە فرمێسک. ناچار بووم، بە پەلە پشـــتم تێ کرد و لە دەرگەکەیان هاتمە دەرەوە. ئاوڕم لێ نەدایەوە و دەســـتێکم بە کامێراکەمەوە گرت و بە ڕاکردن بەو کۆڵانەدا داگەڕام. لە بیرم چووبووەوە کە دەیان ماڵی تر لەو کۆڵانەدا ماون نامەیان بۆ بەرم. کاتێک گەیشتمەوە بەردەم ماڵی خۆمان، مالیک بە هەناسەبڕکێ دوام کەوتبوو. لە حەوشـــەکەدا دەســـتم کردەوە و لە نێو پارچە پەڕۆکەم ڕوانی، بینیم حەوت دەنک نوقڵی ڕەنگاوڕەنگ، لە نوقڵەکەی مام زامنی تێدا بوو، لەگەڵ مالیک بە ســـەرســـوڕمانەوە لە یەکترمان ڕوانی.

ڕۆژی هەڵبژاردن میری هێرشی کردە سەر ئەوانەی دەنگیان هێنابوو. یان پێ دەچوو دەنگی زۆرینەی خەڵکی سلێمانییان بەدەست هێنابێت، کە ئەوە لە تەواوی عێراقدا ڕووی دابوو. شـەریف ئەلشـێخ لە ڕۆژی هەڵبژاردنەکـانـدا گیرا و ڕەوانەی بەغـدایـان کردەوە. مەحموود

هەمەوەندی، پێشـوەخت لە گوندی دەرگەزێن خۆی شـاردەوە. میرزا کەریمی باوکم و نامیق ئاغا خۆیان شـاردەوە و عەزیزی حەمەڕەش گیرا. حەمەی بەکری چـایچیی یەکێـک بوو لەوانەی خۆیـان هەڵبژاردبوو، چایخانەکەی لە ژێر قەسـرەکەی تۆفیق قەزازدا بوو، تاوەکوو ئەو تەمەنەم تەنیا بۆ کاری باوکم و کاکە غەفوورم چەند جارێک چووبووم، شـوێنی کۆبوونەوە و یەکتربینینی ئەوانە بوو، کە خوێندەوار و ئەندامی پارتی و شـیوعی بوون. دەنگۆی ئەوە لە سـلێمانیدا بڵاو بووەوە، کە حەمەی بەکر و نامیق ئاغا دەنگێکی زۆریان هێنابوو، دەیانگوت کە لەسـەر ئاسـتی سـلێمانی زۆرترین دەنگیان بەدەسـت هێنابێت. چونکە لای زۆربەی خەڵکی شـار ناسـراو بوون، بەگوێرەی یاسـای هەڵبژاردنەکان بووایە، یەکێک لەو دووانە دەبوونە پارێزگاری شـار. ئەوە بوو میری بە ئەنجامی هەڵبژاردنەکان ڕازی نەبوو، حەمەی بەکری چـایچیش یەکێـک بوو لەوانەی گیران، پاشـان چایخانەکەی داگیر کرا و لەو پێناوەدا هەرچییەکی هەبوو لەدەستی دان.

* * *

ئەو ڕۆژانە بـاوکم و کـاکە غەفوورم لە مـاڵی خۆمـان خۆیـان شـاردبووەوە، من و مـالیک لە کۆڵان چـاودێر بووین و لە هـاتنی هەموو نەناسـێک ئاگادارمان دەکردنەوە. بێجگە لە چاودێریکردنی گەڕەک، داواکاری و ئیشـی حیزبیی کاکە غەفوورم و ڕاسـپاردەکانی باوکم لەسەر شانی من و قادری برام بوون. ئیشوکاری ئەوان من و قادری تەواو لە قوتابخانە دابڕیبوو، باوکم و کاکە غەفوورم دەرفەتی

ئەوەیان نەبوو لێمان بپرســـــنەوە. ئەوەی ئەو ڕۆژانە کاریگەرییان لەسـەر من هەبوو، گرانی و سیاسـەت و گرفتی ئیشـوکاری باوکم و کاکە غەفوورم نەبوو، بەڵکوو عەشـــقی بەهار بوو، خواردنم کەم دەخوارد و شـــەو خەوم لێ نەدەکەوت، بێجگە لەوەی کەســـوکارم هەموو لێم بە گلەیی بوون، دایکم چەند جارێک ئەوەی بە باوکم گوت، کە جەلال نەخۆشە و بەڵکوو بۆ لای دکتۆرێکی بەریت.

لەگەڵ ئەوەیشدا لە ناو شاری سلێمانی ڕۆژانە لایەنگرانی پارتی و تەحەرور خۆپیشـاندانیان ڕێک دەخست. پاشـان ڕژێم بۆ دەرچوونی لە دۆرانی هەڵبژاردنەکان و بۆ ئەوەی لە بیری خەڵکی بباتەوە، یاسای ســـەربازیی زۆرەملێی ڕاگەیاند، لە ناو خەڵکیدا دەنگی دایەوە و زوڵم و گەندەڵیی ڕۆژانی هەڵبژاردنیـان لە بیر چووەوە. لـە کۆڵان و نـاو بازاڕەکانی ســـلێمانیدا بێجگە لە بەرژەوەندیخوازەکان تەنیا منداڵ و ژن و پەککەوتەت دەبینی. ســـەربازیی زۆرەملێیان بۆ بەشـــداریکردن بوو لە جەنگی فەلەستین. دەبووایە گەنجانی لەدایکبووی سـاڵی ١٩٢٥ بە دواوە، تـاوەکوو لەدایکبووانی ١٩٣١ لە مـاوەی بیســـــت و چوار سـەعاتدا خۆیان ناونووس بکەن. لە ماڵی ئێمە کاکە غەفوور و عەزیز، محەمەدی مام مستەفایش دەبووایە بۆ سـەربازی بچن، بەڵام گوێیان پێ نەدا و باوکم و مام مستەفام پشتیان کردن.

لە ڕۆژی دەرچوونی بڕیارەکەوە، حکومەت ســـەربازی هێنایە ناو شار و کەوتنە بازگەدانان و پەلاماردان و گرتنی گەنجان و ڕاپێچانیان بۆ سەربازی. ئەوەندە باش پلانەکەیان بۆ داڕشتبوو، سەرکردایەتیی پارتی و تەحەرور هیچ وەلامێکیان پێ نەبوو، بێجگە لە خۆشـاردنەوە و هەڵاتن لە شار.

ئەوانەی ماڵی خۆمان کە لە ترسی حکومەت خۆیان شاردبووەوە، ژمارەیان چوار کەس بوون، هەروەها محەممەد حەمەئەمین قادر کە نازناوی کاکەی فەلاحیان بە سەردا دابڕیبوو، لەگەڵ ئەحمەدی حەلاق لە ماڵی ئێمە خۆیانیان شـــاردبووەوە، هەردووکیان بێجگە لەوەی بۆ نۆبەتی ســـەربازی پەیوەندییان نەکردبوو، دوو کەســـایەتیی دیاری شیوعییەکانی سلێمانی بوون. دەتوانم بڵێم؛ گوتارخوێن و دەمڕاستیان بوون، وێنە و ناوی ئەو دووانە بە دەرگەی مزگەوت و قوتابخانەکاندا هەڵواســـرابوو. ئەحمەد و کاکەی فەلاح بە من و مالیکیان گوت؛ کە بچین بە شـــاردا بگەڕێین و لە هەر جێگەیەک وێنەی ئەوان هەڵواســـرابوو، لێی بکەینەوە، کە بۆ هەر وێنەیەک دوو فلســـیان پێ دەداین. بە ڕۆژێک، بیست و شەش وێنەی خۆیانمان بە کاکەی فەلاح و ئەحمەدی حەلاق فرۆشتەوە، ڕۆژی دواتر، پێیان گوتین، کە پارەیان پێ نەماوە و مەگەر بە قەرز ئەو ئیشەیان بۆ بکەین.

کاکە غەفوورم دەربارەی ئەو ڕۆژانە لە گوتارێکدا دەنووســـێت: 'ڕژێمی پاشـایەتی بۆ ڕازیکردنی هەژموونی ئینگلیز لە عێراق دادگەی عورفیی دامەزراند، یەکەم هەنگاوی ئەو دادگەیە ئەوە بوو کە فەهد، سارم، حازم. سێ سەرکردەی باڵای حیزبی شیوعییان تێدا دادگەیی کرد و بڕیاری لەسێدارەدانیان بۆ دەرکرا. دوای ئەوەی عێراق و وڵاتە عەرەبییەکان لە جەنگی دژ بە ئیســـرائیلدا تووشـــی دۆڕان بوون. حکومەتی پادشایەتی ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکاندا دەینووسی:. "جووەکان برای شـــیوعییەکانن!" ئەوەیان کردە مانشـــێتی ڕۆژنامەکان و دامەزراندنی حیزبی شیوعییان بە دەسیسەی زایۆنیزم ناو برد. بەمە زەبرێکی کوشـــندەیان لە ڕێکخســـتنەکانی حیزبی شـــیوعی دا. لەم

ڕۆژانەدا لە گەلێک ڕۆژنامە و گۆڤاری وڵاتانی ئەوروپاییدا ڕەخنەی توند لە خەڵک و دەسەڵاتدارانی عێراق گیرا. لەسەر کوشتارەکەی ساڵی ١٩٤١ و فەرهوودەکەی بەغدا، کە لە سەردەمی ڕەشید عالی گەیلانیدا ڕوویان دا. گەلێک وێنە و دۆکیۆمێنت بڵاو کراونەوە. هەندێک ڕۆژنامەنووسی ئەوروپایی، دەسەڵاتداران و گەلی عێراقیان بە فاشیست و نازی بەراورد کردبوو، کە سەدان جووی تێدا کوژرابوون. حکومەتی عێراقی بۆ پاراستنی لە ناوبانگی بنەماڵەی پادشایەتی و ڕازیکردنی ئیمپریالیست. لە دادگەی عورفیی بەغدا دادگەیی کەسانێکیان ئەکرد، کە گوایە بە ناو جوون و حیزبی شیوعی و زایۆنیزم هانیان داون بۆ ئاژاوەگێڕی و ناشیرینکردنی دەسەڵاتی پادشایەتی، تەنانەت هەوڵی ڕووخاندنیشی ئەدەن. ڕۆژانە هەواڵی نێو هۆڵی دادگە لە ڕۆژنامەکاندا بڵاو ئەبووەوە. هەموو ئەو هەواڵ و ڕاپۆرتانە لە دێڕێکدا کورت ئەبوونەوە؛ دروستکردنی حیزبی شیوعی لە عێراق بە پلانی زایۆنیزم بووە. هەندێک جار پارتی و تەنانەت گەلی کوردیش بە دۆست و لایەنگری ئیسرائیل تاوانبار ئەکەن؛ کە واتە سیاسەتی ڕژێمی پادشایەتی ئەوەیە؛ بۆ ڕازیکردنی دەسەڵاتدارانی ڕۆژئاوا دژایەتیی شیوعییەکان ئەکەن و بۆ هاندانی عەرەبە نەتەوەییەکان کورد و زایۆنیزم.'

* * *

لەو ڕۆژانەدا باوکم داوای لێ کردم، ئەو دەفتەرە شیعرەی لە سەردەمی ئەحمەدی نالبەندی باوکییەوە شیعریان تێدا کۆ کردبووەوە، بۆ کتێبخانەی ئەوقافی بەرم، ئەوەی پێ گوتم: 'جەلال

لەوێ مەلا عەلائەدین سەجادی چاوەڕوانت ئەکات و ئەیدەیتە دەست خۆی.' دەمناسی و چەندین جار هاتبووە ماڵمان.

کاتێک گەیشتمە شەقامی مەولەوی، بەردەم قەسرەکەی تۆفیق قەزاز بە پۆلیس و سەرباز گیرابوو، خەڵکێکی زۆر بەرامبەر چایخانەکەی حەمەی بەکر وەستابوون و لێیان دەڕوانی. مالیکی ئامۆزام لەگەڵدا بوو، ئێمەش تێکەڵی خەڵکەکە بووین، لەو کاتەدا دوو پۆلیس بە دەستەبەرە حەمەی بەکریان لە چایخانەکەیەوە هێنایە دەرەوە، جلەکانی لە بەریدا دڕابوو، ئاسەواری خوێن بە دەموچاوی و جلەکانییەوە بوو، تەنانەت شاگردەکانیشی بە کەلەپچەکراوی سواری ئۆتۆمبێلە سەربازییەکان کران. ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەوە بوو کە زۆرینەی ئەو خەڵکە هووهایان دەکێشا و چەپڵەیان لێدەدا، بە عەقڵی ئەوسا نەمدەزانی بۆچی ئەو خەڵکە بە گرتن و داخستنی چاخانەکەی بەکر دڵخۆش بوون. دوای ئەوە کورسی و مێز و تەنانەت وەجاخ و سەماوەر و کەلوپەلی نێو چایخانەکەیان لە لۆرییەکی سەربازی بار کرد و دەرابەکەیان داخست. پاشان پۆلیسەکان لوولەی تفەنگەکانیان کردە خەڵکەکە و بڵاوەیان پێ کردن.

لەگەڵ مالیک کاتێک گەیشتینە بەر دەم کتێبخانەی ئەوقاف، عەلائەدین سەجادی لەگەڵ عیزەدینی مەلا مستەفا لە پێش دەرگەکە ڕاوەستابوون، عیزەدینی مەلا مستەفام ناسییەوە، بەڵام پێشتر عەلائەدین سەجادیم بە جلوبەرگی مەلایەتییەوە بینیبوو. کە ئەو ڕۆژە سمێڵی تاشیبوو، قاتێکی چاکەت و پانتۆڵی لە بەردا بوو، قژی چەور کردبوو، بۆ سەرەوە شانەی کردبوو. دوای ئەوەی تەوقەمان لەگەڵ کردن و هەواڵی باوکم و کاکە غەفووریان پرسی، عەلائەدین سەجادی

گوتی: 'وەختە بوو بڕۆین، پۆلیس لە ژوورەوەن و تەحەڕی ئەکەن، لە دوامانەوە وەرن.'

ئەوان بەرەو مزگەوتی بنتەبەق بەڕێ کەوتن و من و مـالیـک دووراودوور بە دوایانەوە بووین، مزگەوتی دوودەرگە یان مزگەوتی بنتەبەق، ئەو مزگەوتەی ڕۆژانێـک مـاڵی بـاپیرەم ئەحمەدی نـاڵبەنـد بووبوو، لەبەر دەرگەی مزگەوتەکە عەلائەدین ســـەجادی ئاوڕی لێ داینەوە و پرسیی: 'ئەمانەتییەکەتان هێناوە؟'

'بەڵێ قوربان.'

دەفتەرەکەم لە ژێر کراسەکەمەوە دەرهێنا و بەرەو ڕووی ڕامگرت، عیزەدینی مەلا مســـتەفا لێی وەرگرتم، پاشـــان عەلائەدین ســـەجادی گوتی: 'سـوپاسـی باوکت ئەکەم، کە من جێگەی متمانەی بووم، ڕێز و ئیحترامی منی پێ ڕابگەیەنە. ئەو کتێبەی خۆشـــم بە جەنابی هەدییە بێت.'

کتێبێکی پێ دام، لەســـەری نووســـرابوو: *مێژووی ئەدەبی کوردی.* عیزەدین هاوتەمەن و هاوڕێی قادری برام بوو، دەستی خستە سـەر شـانم و گوتی: 'سـەلام لە غەفووری برات بکە و پێی بڵێ: ئەم ڕۆژانە خۆی نەخاتە بەرچاو و ئاگای لە خۆی بێت!'

* * *

دوای داخســـتنی چایخانەکەی حەمەی بەکر، گەنجانی شـــار و بە تایبەتی ئەوانەی ئەندام بوون لە پارتێکی ســـیاســـی یان لایەنگریان بوون، هەموو دەچوون بۆ باخی فەرەجی حەمەموراد.

باخەکە لە خوارووی گردی سەیوانەوە دەستی پێ دەکرد، دەیدا لە باخەکەی شـێخ لەتیف. باخێکی گەورە بوو، پڕ لە داری میوە و گوڵ و گوڵزار، شوێنی دانیشتنی زۆر لێ بوو، جۆگەلەیەکی پێدا تێدەپەڕی کە ئاوەکەی خاوێن بوو، پێیان دەگوت ئاوی کارێزی دایکی پاشـا، کە لە مـاڵی عەزمی بەگەوە دەهـات. چـایخـانەیەکی تێدا بوو، چـایی و شـەربەت و سیفۆنی دەفرۆشت. خوارووی باخەکە شـوێنی قوتابی و گەنجە سیاسییەکان بوو. مزگەوتەکەی سـەروو باخەکە، کە بەردەمی بەردەڕێژ کرابوو پیـاوانی نوێژکەر و هەنـدێـک جـاریش فەقێ و سۆفییەکانی بۆ دەهاتن و ئێوارانی هەینی کۆڕی شیعری تەسـەوفیان دەبەسـت. هەروەها لە خوارووی باخەکە زۆربەی شـاعیرە نەتەوەیی و چەپەکان دەهاتن و لەسـەر سـەکۆیەک شـیعریان دەخوێندەوە، من سـەری کۆڕی شـیعری سـەروخواری باخەکەم دەدا، ئەو شـاعیرەی لەو تەمەنەمـدا بێجگە لە فـایەق بێکەس و گۆران کـاریگەریی بە سەرمەوە هەبوو، قانعی شاعیر بوو، چەند جارێک لە باخەکەی فەرەج شـــیعری خوێندەوە، پێشــــتر هـاتبووە مـاڵی خۆمـان و زۆربەی شیعرەکانیم بە دەنگی خۆی لێ بیستبوو. کاکە غەفوورم دەیگوت: 'لە کوردستان، قانع باوکی ڕۆحی بیری چەپگەرایە!'

ئەو ســـەکۆیەی باخەکەی فەرەج ڕۆژانە و بە درێژاییی ســـاڵ لە لایەن شــــاعیر، ســــیاســــی، گۆرانیبێژەوە گیرابوو. منیش جارێک شیعرێکی ئەحمەد موختار جاف، کە لە دەفتەری شیعرییەکەی باوکم دەرمهێنـابوو، لەوێ خوێنـدەوە، پێم وابێـت چەنـد ڕۆژێـک دوای هەڵـبـژاردنەکـان بـوو، کە هەنـدێـک چەپڵـەیـان بـۆ لـێـدام و گەلێکیش هوهایان لێ کێشـام، ئەوانەی ئەو شیعرە بەری دڵی گرتن و پێیان ناخۆش بوو، لایەنگری بەرژەوەندیخوازەکان بوون، گەیشـــتە

ئەوەی پەلاماریان دام، دیسان ئەگەر کاکە عەزیزم لەوێدا پەیدا نەبووایە و نەیپاراستمایە، خراپیان بە سەر دەهێنام. ئەو ڕۆژە من ئەم چەند دێڕەم لە شیعرێکی ئەحمەد موختار جاف، لە باخەکەی فەرەجی حەمەموراد خوێندەوە:

"لادە شاعیر تۆ لە باسی عیشقبازی و سەیری کە
چۆن خەریکن چەن کەسێ ئێستا وەتەن وێران ئەکەن
جاهیلان بۆ ئیستیفادەی زاتی خۆیان ڕۆژ و شەو
لەم موحیتە مەنعی عیلم و سەنعەت و عیرفان ئەکەن
ڕووڕەشی دنیا و قیامەت ئەو نەفامانەن کە وا
هەجوی قەوم و میللەتی خۆیان بە پارە و نان ئەکەن"

لە ناو باخەکەدا دەیان کورسی دانرابوون، بێجگە لەو ڕاخەرانەی خەڵکی لەگەڵ خۆیاندا دەیانهێنان. ئەو ڕۆژانە پرسی ئەوەم بە باوکم کرد، کە دەمەوێت لە باخەکەی فەرەج کاری وێنەگریی گەڕۆک بکەم، بەڵام باوکم پێی گوتم: 'موستەحیلە، تۆ ئیحتیاجیت بەوە نییە و من کامێرام بۆ ئەوە بۆ نەکڕیویت!'

لە باخەکەی فەرەج، مەحموودی مچەحاجیی پاقلەفرۆشی لێ بوو، کە بە خولەی پاقلە ناسرابوو، شاگردەکانی قاپی پاقلەیان بە سەر ئەو خەڵکەدا دەگێڕا و دەیانفرۆشت. مەحموود و شاگردەکانی تەحەڕوڕ بوون. خەڵکی خولەی پاقلەیان بەوە تووڕە دەکرد، کە قاپەکانیان لێ دەشاردەوە، یان لە ناو باخ و گوڵەکاندا فڕێیان دەدان و پاشان شاگردەکانی بە شەو دەهاتن و بە دوایدا دەگەڕان.

خولەی پاقلە زوو تووڕە دەبوو. خەڵک سەریان دەکردە سەری و ئەویش وەڵامی هەموویانی دەدایەوە. بەردەوام لەسەر سیاسەت

دەدوا و قسەی دەکرد. ڕای خۆی نەبێت، ڕای کەسی بە ڕاست نەدەزانی. لەسەر ئەو کەللەڕەقییەی چەندان جار لە لایەن نەتەوەییەکانەوە پەلامار درابوو و لێدانی خواردبوو.

لە باخەکەی فەرەج خۆم بە دیارەوە بووم، کە لەسەر جیاوازیی بیر و ڕا دەبووە شەڕ و خەڵک پەلاماری یەکتریان دەدا. ئەوانەی بە شەڕ دەهاتن نەخوێندەوار و بێکارەکان بوون. هەندێکیش لە لایەن میرییەوە بە کرێ گیرابوون، بۆ زڕاندنی ناوی ئەوانەی لایەنگری پارتی و شیوعی بوون، بە چەند فلسێک یان بۆ نانخواردنێک ئامادە بوون هەموو کارێک بکەن. تەنانەت لە کۆڵانەکاندا بە ڕۆژی نیوەڕۆ پەلاماری منداڵ و گەنجی کوڕی هاوتەمەنی من و مالیکیشیان دەدا. بووزیان پێوە دەکردین و خۆیان پێوە دەنووساندین، ئەوە ئەگەر بە شەو بووایە، خراپتریان بە سەر دەهێناین. بەتایبەتی منداڵی ئەو خێزانانەی شیوعی و پارتی بوون. تەنیا بۆ ئەو مەبەستە، وەک خۆیان دەیانگوت: 'منداڵی پارتی و شیوعییەکان حیز و سەرشۆڕ بکەین.'

لە باخەکەی فەرەج لایەنگرانی شیوعی ئەو پرسیارەیان لە پارتییەکان دەکرد: 'ئایا کورد نەتەوەیە؟'

پارتییەکان دەیانگوت: بەڵێ، نەتەوەیە.'

شیوعییەکان لە وەڵامدا: 'هێشتا بنەمای نەتەوەیی نەچەسپاوە و ماویەتی، چونکە ستالینی مەزن وا دەڵێت.'

ئیتر لە دوای ئەمەوە بە درێژاییی ڕۆژ و تاوەکوو تاریک دادەهات لێدوانی بێکۆتایی بوو.

حیلمی عەلی شەریف و برایم ئەحمەد لە مامۆستا و سەرکردە دیارەکانی پارتییەکان بوون. کاکە غەفوور و بەهادینی مەلا نووری،

لەگەڵ نووری عەزیز کە یاسای لە بەغدا تەواو کردبوو، وەک شیوعی دەهاتن و دەدوان و قسەیان دەکرد.

دوای هەڵبژاردنەکان پۆلیس چاودێرییان لەسەر باخەکە دانابوو، ڕێگەیان لە قەرەباڵخی دەگرت، لە سەرەتاوە چایخانەکەیان داخست و بە مەبەستی نۆژەنکردنەوەی، کورسییەکانیان گواستەوە و ئاویان لە باخەکە بڕی، خولەی پاقلە و شاگردەکانی گیران. شەقامێکی بەرینیان بە ناوەڕاستی باخەکەدا لێدا و کردیان بە دوو بەشەوە، بەشی خوارووی لە ماوەی سێ مانگدا تەخت کرا و خەستەخانە و قوتابخانەیەکیان لێ دروست کرد. بەشی سەرەوەی خرایە سەر گردی سەیوان و کرا بە قەبرستان. ساڵانی دواتر هەرکەسێک توانای لێدوانی هەبووایە و قسەی ڕەوان ببووایە، پێیان دەگوت: 'ئەڵێیت لە باخەکەی فەرەج پەروەردە بوویت و بە پاقلەکەی خولە گۆش کراویت!'

* * *

ساڵی ١٩٤٨ حکومەت بە سیاسەت و بە هاوکاریی بەرژەوەندیخوازەکان لە کوردستان و بە تایبەتی لە ناوچەی سلێمانی، بۆ ئەوەی زوڵم و زۆریی هەڵبژاردن لە بیری خەڵکی ببەنەوە، سیاسەتی برسیکردنی خەڵکیان پەیڕەو کرد. تاوەکوو لە بێکاری و برساندا کەس دەرفەتی نەبێت ناڕەزایی دەرببڕێت. تەنانەت ڕێگەیان لە دێهاتییەکان دەگرت بەرهەمەکانیان، بە تایبەتی دانەوێڵە، بگەیەننە ناو شار. لە بەردەم نانەواخانەکاندا سەدان کەس لە ڕیزدا بۆ نان دەوەستان، کە تەنیا نانێکی ڕەشی ئاردی جۆت دەست دەکەوت. لە

بازاڕ گەنم و جۆ دەست نەدەکەوت و ئەگەر هەشبووایە زۆرینەی خەڵکی شار نەیاندەتوانی بیکڕن. ئەو ڕۆژانە میرزا کەریمی باوکمم دەبینی، کە چۆن بە سەر ماڵە هەژارەکاندا دەگەڕا و خەمی دەخواردن، لەگەڵ ئەوەشدا کە زۆر دەوڵەمەند بوو، ڕۆژانە نانی وشکی دەرخواردی ئێمە دەدا، چونکە لە دەمی ئێمەی دەگرتەوە و دەیدا بە هەژاران. نەوەک لەبەر ئەوەی باش لە بیروباوەڕی سۆسیالیزم گەیشتبوو، بەڵکوو لەگەڵ حەلاوەخانی دایکمدا لە سروشتییانەوە بەخشندە بوون. هەروەها گەلێک جار ئەوەم لە باوکم بیستبوو، کە دەیگوت: 'ئەوانەی بەناو یان لە پێناوی خودادا خێر دەکەن و یارمەتی ئەوانی تر دەدەن، درۆزن و خۆ پەرستن!'

سەرلەبەیانیی ڕۆژی هەینی بوو، شیوعییەکان دیسان بڕیاریان دابوو لە ماڵی ئێمە کۆ ببنەوە، بەڵکوو سنوور بۆ بازاڕ دابنێن. نان هەرزان بکرێت، نرخ بۆ جلوبەرگ، میوە و سەوزە دابنرێت و کرێی ئۆتۆمبێل و عەرەبانە یایلییەکان کەم بکرێتەوە. بە نیاز بوون لیژنە دروست بکەن و بە سەر شاردا بگەڕێن و چاودێریی تەواوی شار بکەن. لە کاتێکدا برسێتی و گرانی خەڵکی بێزار کردبوو، میری بە سیاسەت بەروبوومی ناوچەی سلێمانیی بە پارەی زیاتر دەکڕییەوە و بۆ شارەکانی باشووری ڕەوانە دەکرد. دەنگۆی ئەوەش هەبوو کە لە دەرەوەی شار سووتێنرابن، تەنانەت ئاوی خواردنەوەشیان دوو هەفتە جارێک بۆ گەڕەکان بەر دەدایەوە. هەموو شەوێک لە گەڕەکەکانی سلێمانی دزی دەکرا، تەنانەت تەنەکەی خۆڵی بەرماڵانیان دەبرد. سواڵکەر لە ناو بازاڕ و کۆڵانەکاندا ژمارەیان لە ڕێبواران زیاتر بوو.

ئەو ڕۆژە دووەم وێنە، کە بە کامێراکەم گرتم، وێنەی جووتیارەکانی عەربەت بوو، زیاتر لە پەنجا ژن و پیاو بە پێ لە عەربەتەوە بۆ بەر دەرکی ســـەرا هاتبوون، بۆ ئەوەی دەنگی ناڕەزاییی خۆیان بگەیەننە کاربەدەســـتان. لەتیفی شـــێخ مەحموود دوو هەفتە بوو ئاوی لە کێڵگەکانیان بڕیبوو. ئەوەی ئەو ڕۆژە ســـەرنجی منی ڕاکێشـــا ئەوە بوو، کە جووتیارەکانی عەربەت ســـەروگوێلاک و تەواوی جەســـتەی خۆیان لە قوڕهەڵکێشـــابوو. وەک نیشـــانەیەک بۆ بێدەســـەڵاتییان لە بەردەم کوڕەکەی شێخ مەحموودداا، کە خۆی بە خاوەنی زەوییەکانی نـــاوچەی عەربەت دەزانی. وێنەیـــان تـــاوەکوو ئەمڕۆ لە خەون و خەیاڵمدا کاڵ نابێتەوە، کە لە فەرهەنگ و زمانی کوردیدا بەرچاوم نەکەوتووە نووســـەرێک تەنیا دێڕێکی لەبارەوە نووســـیبێ. ئەوەندە نەبێت، خەڵکی لێیان کۆبوونەوە و فیکەیان بۆ لێدان و هووهایان لێ کێشـــان. ئەوەی ئەو ڕۆژە بڵاوەی بەو جووتیارە قوڕبەســـەرانەی عەربەت کرد، پۆلیس و سەرباز نەبوون، بەڵکوو چەکدارەکانی لەتیفی شێخ مەحموود و شەقاوەکانی شار بوون.

هەندێک لەو جووتیارانە لەتاو ماندوویەتی و برسێتی لە ماڵی ئێمە مانەوە. بێجگە لەوان لە زۆربەی شـــار و گوندەکانەوە، بە تایبەتی بۆ ماڵی میرزا هاتبوون. لە ئاشەکەی مام سلێمانی گەڕەکی جوولەکانەوە دوو فەردە ئاردی گەنم بۆ ماڵی ئێمە هاتبوو، ژنان لە چەند ماڵێکەوە بە هەرەوەزی زیاتر لە سێ سەد نانی تیرییان کردبوو.

من و مالیک بیست مەنجەڵ ماستمان لە دێی قرگە کڕیبوو، چاییيان لە مەنجەڵی گەورەی چێشتدا لێنابوو.

گۆران و حەمەساڵح دیلان لەگەڵ ئەحمەد هەردی سەریان بە سەر پارچە کاغەزێکدا شـــۆڕ کردبووەوە، لەســـەری نووســـیبوویان:

'برسیکردنی خەڵک بەسە، ئێمە پارێزگاری لە چینی هەژاران ئەکەین، ئێمە داوای مافی ڕەوای خەڵک ئەکەین.'

دواتر لەسەر پارچە خامێکی سپی بە ڕەنگی سوور نووسییان و بە دوو چڵەداردا دایاندووری.

کاکە غەفوور و کەریم ئەحمەد، ئەنوەری حەمە ئاغا، بەهادینی مەلا نووری، ئەحمەد غەفوور، کاکەی فەلاح، هەروەها ئەحمەدی حەللاق، لە ژێرزەمینەکە بوون، بەیاننامەیەکیان بۆ ئەو ڕۆژە نووسیبوو. بە نیاز بوون ئەحمەدی حەللاق یان کاکەی فەلاح لە بەر دەرکی سەرا بۆ خەڵکی بخوێنێتەوە و پاشان بیگەیەننە دەستی پارێزگار.

لە ڕۆژانی پێشوودا چەندان کۆمەڵە دامەزرابوون، کە ئەو ڕۆژە هەموو لەوێ بوون و بە جیا و لە سووچێکەوە کۆ بووبوونەوە و یەکێک قسەی بۆ دەکردن.

کۆمەڵەی شۆفێرەکان؛ قادر ڕەشید ناسک لە نێویاندا ڕاوەستابوو و بە دەنگی بەرز قسەی بۆ دەکردن، کە لە دوورەوە گوێت لە دەنگی دەبوو.

کۆمەڵەی نانەواکان، ئەحمەد مارف.

خەیاتەکان، نائیب عەبدوڵڵا.

لێپرسراوی سەرتاشەکان، بەقاڵەکان و کرێکارانی مەلاریا، ئەحمەدی حەللاق و کاکەی فەلاح بوو، کە لە لێدوان و پەیوەندیدا لە هەموو هاوڕێ شیوعییەکانیان کارامەتر بوون. لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا ئەو دووانە گوتار یان بەیاننامەیان دەخوێندەوە.

هەروەها ئەو ڕۆژە بەیاننامەیەکیان بۆ پێشنیازکردنی دامەزراندنی یەکێتیی نیقابەی سلێمانی نووسیبوو، کە بیرۆکەی زبیحی و گۆران

بوو. که دواتر کۆڵیان نەدا و داخوازییەکەیان بۆ دامەزراندنی یەکێتیی نیقابەی سلێمانی جێبەجێ کرا.

سەرلەبەیانیی ئەو ڕۆژە لە ناو بازاڕ و پێش ئەوەی بۆ ماڵی میرزا بێن، بەقاڵ و قەسابەکان بە شەڕ هاتبوون و چەقۆیان لە یەکتر دابوو، کاتێک گەیشـــتنە ماڵی میرزا چوار کەس بریندار بوون، بۆ ئەوەی تووشـی لێپرسینەوە نەبن، دکتۆر شـۆ تەداویی کردن و برینەکانی بۆ پێچان و ئاشتی کردنەوە، پاشان گەیەنرانەوە ماڵی خۆیان.

کاتێک لە دەرگەی ماڵی میرزا هـاتنە دەرەوە و بۆ فلکەی خـانەقا چوون، گەلێک کاسـبکار و دووکـاندار تێکەڵاویـان بوون. زۆریی خەڵکەکە بووە هۆی گیرانی شەقامەکان.

تەهای شـــێخ جەلال، کە ســـەید تەهایان پێ دەگوت، تاوێک لە پێشـــیانەوە دەڕۆیشـــت و هەندێک جار دەیانخســـتە ســـەر شـــان و بەردەوام بە دەنگە بەرزەکەی هاواری دەکرد، گەلێک جاریش شیعری دەخوێندەوە. لە هەموو خۆپیشـاندانەکاندا ئەوە پیشـەی بوو. دەنگێکی زوڵاڵ و گڕ، کـاتێـک ئەوان لە فلکەکەی بەر خـانەقـا بوون، لە بەر دەرکی سەراوە گوێت لە دەنگی سەید تەها دەبوو.

چەند ساڵێک دوای ئەو ڕۆژانە سەید تەها تووشی جەڵدەی دەماخ بوو و مرد. دوای مردنی، دەیان گەنج بە هەمان شـــێوازی دەنگ و دەســتجووڵاندنی ئەو لاســاییی ســەید تەهایان دەکردەوە، بە تایبەتی من و کامەران موکری کە زۆر پێی سـەرسـام بووین. جێگەی ئەومان گرتەوە.

خۆپیشـــاندەران هێشـــتا لە بەردەم گومرگە ســـووتاوەکەدا بوون، چەند کەسێک هەواڵی ئەوەیان هێنا کە چوار لۆری لە ئاشی گاورەکە

و دووکانەکانی ســـەعید ســـاڵح گەنمیان بار کردووە و بۆ بەغدای دەبەن.

لەو کاتەدا کاکە غەفوورمیان خستە سەر شان و داوای لە خەڵکەکە کرد: 'تکایە ڕێڕەوی خۆپیشـــاندانەکە مەگۆڕن و تەنیا گرووپێک بچن و ڕێگە لە لۆرییەکان بگرن، با تەنیا کۆمەڵەی نانەواکان بچن، کە ئاردیان نییە بیکەن بە نان.'

کاتێک کۆمەڵەی نانەواکان دەگەنە شـــوێنی بارکردنی گەنمەکە، چوار لۆرییەکە لە گەنم بار کرابوون. پێش کۆمەڵەی نانەواکان، ئەم هەشــت کەســە پێشــتر لەوێ دەبن: عەلی حاجی عەبدوڵڵا بۆسـکانی، سەعەی گەوهەر، عەبدولڕەحمان حەلاج، ئەحمەد مارف، حەمەڕەشیدی ئەحەشـــانە، حەمەئەمین ئاســـنگەر، عوســـمانی ئاســـنگەر و نائیب عەبدوڵڵا.

ئەم ناوانە، ئەو سێ پۆلیسـەی لەوێ چاودێریی بارکردنەکە دەکەن چەک دەکەن و شـۆفێرەکان باڵبەســت دەکەن، پاشـــان لۆرییەکان بۆ گەڕەکی ســـەرشـــەقام لێدەخوڕن. تاوەکوو پۆلیس دەگات، بە چەقۆ گوێنییەکان دەدڕن و دانەوێڵەکە بە ســـەر خەڵکیدا دابەشـــی دەکەن. پاشـان خۆپیشـاندەران لەگەڵ پۆلیسـدا دەبێت بە شـەڕیان و سـەری شەش پۆلیس دەشکێنن. پۆلیسەکان پاشەکشە دەکەن.

میری ئەو ڕۆژە ناوی ئەو هەشت کەسە بە گێرەشێوێن و دز بڵاو دەکـاتەوە و فەرمـانی گرتنیـان دەردەکـات، کە بـازرگـانـانی دانەوێڵە شـــکایەتیان لێ کردبوون و ناویان بە میری دابوون. ناوەکانیان بە دیواری بەریدەکە و ژێر سەعاتەکەدا هەڵدەواسرێت.

تاوەکوو شـیوعییەکان نەگەیشـتبوون، بەر دەرکی سـەرا ئارام بوو، من و مالیک لە پێشـــیانەوە بووین و خامێکمان بە دوو چڵ دارەوە

کردبوو. بە ڕەنگی سـوور و بە عەرەبی لەسـەری نووسـرابوو: 'برسیکردنی خەڵک بەسە، ئێمە پارێزگاری لە چینی هەژاران ئەکەین، ئێمە داوای مافی ڕەوای خەڵک ئەکەین.'

لە دوای خۆپیشـاندەرانەوە بە کوردی هەمان نووسـین هەبوو. محەممەدی مام مستەفام و قادری برام هەڵیانگرتبوو.

پۆلێک ژن لە پێشـمانەوە دەڕۆیشـتن. خەڵکەکە کاتێک ژنەکانیان بینی، کەوتنە فیکەلێدان و هاوارکردن. ئەوە بۆ یەکەم جار بوو ژنان بەو ڕێژەیە بەشـداریی خۆپیشـاندان بکەن و پێشـڕەو بن و بێنە بەر دەرکی سەرا.

پێ دەچوو ئەو خەڵکە هاتنی ژنەکان تووڕەی کردبن، یان لەو دێڕە نەگەیشـتبن و ڕەنگی تۆخی نووسـینە سـوورەکە بێزاری کردبن، کە لەو ڕۆژەدا سێ بەشی دانیشتووانی شار هەژار و برسی بوون.

لە سـەرەتاوە ئەو خەڵکەی لە چواردەوری سـەرادا ڕاوەسـتابوون، نە نەتەوەیی بوون و نە شـیوعی، هەندێک پێڵاوەکانیان و ئەوانەی لە دواوە بوون بەردیـان تێ گرتین. ئێمە بێگوێدانە کەس، گەیشـتینە نزیکی فلکەکە و نزیکی گومەزی مروورەکە. پـاشـان جووتیـار و کرێکارەکان تێکەڵاومان بوون.

"لە دە ساڵی ڕابردوودا سەد جار بۆ بەر دەرکی سەرا هاتووین!" جووتیارێکی عەربەتی ئاوای بە کاکە غەفوورم گوتبوو.

لەگەڵ میلی سـەعاتەکەی بەر دەرکی سـەرا لەسـەر دوازدە جووت بوو، لە مینبەرەکانەوە بـانگ درا. تـاوەکوو بـانگخوێنەکەی مزگەوتی گەورە بەردەوام بوو، هەموومـان نووزەمـان لە خۆمـان بڕیبوو، لە شـوێنی خۆمان وشـک بووبووین. تەنانەت شـیوعییەکانیش، وەک لە بیریـان چووبێت بۆچی بۆ ئەو جێگەیە هـاتوون. لەگەڵ تەواوبوونی

بـانگەکەدا خەڵکی لە هەرچوار لاوە کەوتنەوە هووهـاکێشــــان و فیکەلێدان. وەک گۆڕەپـانی ســــێرک خەڵـک بە دەورمـانـدا ڕیزیـان بەســــتبوو. هەنـدێـک گەنجی بێکـار نەک ئەو ڕۆژە، بەڵکوو هەموو ڕۆژێک لە بەر دەرکی ســـەرا دەبینران، تاوەکوو ئەو کاتەش ئەوان لە کەنارەوە ڕاوەستابوون و لەو خەڵکەیان دەڕوانی. ناویان بە شـەقاوە و بێکار زڕابوو، پاشـــــان هاتنە ناو گۆڕەپانەکە و بە بەرچاوی ئەو خەڵکەوە پەلاماری شیوعییەکانیان دا.

ئەو ڕۆژانە خەڵکی شـار هەموو دەیانزانی کێ سـەر بە چ پارتێکە. هەندێک جار شــەقاوەکان خۆیان لە ناو خەڵک و چایخانەکاندا باسـی ئازایەتیی خۆیانیان دەگێڕایەوە، زۆر بێباکانە باسیان دەکرد، کە چۆن لە شیوعییەکی بێدینیان داوە.

بۆ یەکەم جـار بوو حکومەت بە نهێنی مەعـاشـــی بۆ بێکـار و شــــەقاوەکانی ســــلێمانی بڕیبووەوە، بە مەرجێک، ئاژاوە بنێنەوە و خۆپیشـــــاندانەکانی پارتی و تەحەڕوڕ بە لاڕێدا بەرن. هەروەها لە سـینەما، چایخانە و کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا شـەڕ و پشـێوی بنێنەوە، تاوەکوو خەڵکی لێیان دوور بکەوێتەوە.

زیـاتر لە پەنجـا گەنج ڕژابوونە نـاوەڕاســـتی گۆڕەپـانەکە و بە مشـــتەکۆڵە بەر بووبوونە ســــەر و چـاوی یەکتری. چەنـد هەزار کەســـێکیش لێیـان دەڕوانین. پۆلیســــەکـان تەنـانەت لە شـــوێنی ڕووداوەکەشـــیـان نەدەڕوانی و وەک بڵێی هیچ ڕووی نەدابێـت، ناوەڕاستی گۆڕەپانەکە بووبوو بە شوێنی بۆکسێن و شەقوەشاندن.

نوێژکەرەکان لە مزگەوتەکانەوە هاتن، بێ ئەوەی بزانن چ باســـە. یەکـیەک بۆ شـــیوعییەکـان دەچوونە نـاوەوە و بێ ئەوەی کەس ناوبژیوان بێت، یان دەســتیان بگرێت، چونکە مەلاکان لە گوتاری ئەو

ڕۆژەیاندا هۆکاری گرانی و نەهامەتییان خستبووە ئەستۆی شیوعییەکان و گوتبوویان: 'شیوعییەکان بەکرێگیراوی زایۆنیزمن و دژی گەلی فەلەستینی موسڵمانن.'

ئەوانەی بەرامبەری یەک ڕاوەستابوون، لە پێشدا جنێویان بە یەکتری دەدا. عەباسی گوڵچینی شەقاوە یەکێک بوو لەوانەی بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: 'سواری لینینی خوشکی مارکس دەبم.' خەڵکیش بە دەمییەوە پێدەکەنین و چەپڵەیان بۆ لێدەدا!

فەقێکانی مزگەوتی گەورە و خانەقا بەردەوام ئەوەیان دەگوتەوە: 'شیوعییەکان بێدینن، سواری خوشک و دایکی خۆیان ئەبن.'

شیوعییەکانیش دەیانگوت: 'ئێوە کۆنەپەرستن و جاهیلن!'

پاشان پەلاماری یەکیان دەدا، لە نێو تەماشاکەراندا زۆرینە هاندەر و لایەنگرانی شەقاوەکان بوون. کە لەو ڕۆژانەدا شەلاتی و شەقاوەکانی شار، لایەنگر و هەوادارانیان لە شاعیر و نووسەر و سەرکردە سیاسییەکان زیاتر بوو.

خامە نووسراوەکان دڕێنران و ئەحمەدی حەللاق نەیتوانی بەیاننامەکە بخوێنێتەوە، یان باشترە بڵێین؛ چەند جارێک هەوڵی خوێندنەوەی دا و پێیان بڕی و گوێیان لێ نەگرت. هووهایان لێ کێشا و جرتیان بۆ لێدەدا.

ئەو ڕۆژە لە ڕۆژنامەی العراق-دا و لە لاپەڕەی یەکەمیدا نووسینێک بڵاو کرابووەوە، بڕیارێک بوو نووری سەعید دەریکردبوو. ڕەگەزنامەی لە شەست هەزار جووی دانیشتووی کوردستان و سێ سەد هەزار و بگرە زیاتریش لە تەواوی عێراقدا سەندەوە. بڕیارەکە بە جۆرێک داڕێژرابوو، کە گەلێک لە سەرکردە شیوعییەکانیشی دەگرتەوە، بەڵام لەبەر پشێویی ئەو ڕۆژە، ڕۆژنامەی ناوبراو

نەگەیشـــتە شـــاری ســـلێمانی و کەس ئاگاداری بڵاو بوونەوەی ئەو بڕیارە نەبوو.

لەو مەیدانەدا کاتێک زۆربەی خەڵکی شـــار ســـەرقاڵی شـــەڕ و فیکەلێدان بوون، پۆلیس و ســـەرباز دەوری خەڵکیان گرت و زیاتر لە پەنجا کەســـیان لە کۆمۆنیســـت و نەتەوەییەکان گرتن و وەک ئاژاوەگێڕ و شەلاتی دادگەییان کردن.

* * *

چیرۆکی ئەو برینانەی ســـەر ئەژنۆکانم، کە بە درێژایی تەمەنم دەخورێن و سارێژ نابن، دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی منداڵیم: کە چوار ڕۆژ دوای خۆپیشـاندانەکەی بەر دەرکی سـەرای سـاڵی ١٩٤٨ من و مالیکی ئامۆزام وەک لافیتەهەڵگر بەشـدار بووین. لە نیوەی شـەودا، سەرباز و پۆلیس لە یەک کاتدا، هەڵیانکوتایە سەر زیاتر لە سەد ماڵ. حەوشە و سەربانی ماڵی ئێمەشیان گرت. ئەو کاتەی لە دەرگەیان دا، تەنیا جەمال لێیان وەڕی و بە هاتنیانی زانیبوو، ئەو شـەوە باوکم بۆ چارەســـەرکردنی کێشـــەی جووتیارەکان بۆ عەربەت چووبوو. مام مستەفا دەرگەی کردەوە و پێی گوتن: 'غەفوور لێرە نییە.'

پاشـــان یەکێک لە پۆلیســـەکان گوتبووی: 'غەفوور، عەزیز و قادر هەروەها حەمەی کوڕیشتمان ئەوێت.'

'بۆچی خێرە؟'

کاتێک مام مستەفا ئەمەی پێ گوتبوو، پۆلیسەکە دەنگ هەڵدەبڕێ: 'چونکە شیوعین و داواکراون.'

لەو کاتەدا من و مالیک لە ژێرزەمینەکە لە ناو دوو سندووقی چاییدا خۆمان شاردەوە، هەرچەندە بۆ ئێمەش نەهاتبوون و ناویان نەهێنابین، بەڵام لەگەڵ گوێمان لە دەنگی وەڕینی جەمال بوو، کاکە غەفوور و عەزیزمان لەخەو هەڵساند و لە هاتنی پۆلیسەکان ئاگادارمان کردنەوە، پاشان من داوام لە قادر کرد کە خۆی بشارێتەوە، بەڵام بە گوێی نەکردم و دوای مام مستەفام کەوت. ئەوسا وا بیرم دەکردەوە کە ئێمەش لە خۆپیشاندانەکاندا بەشدار بووین و دەمانکوژن.

یەکێک لە پۆلیسەکان باڵی قادر دەگرێت و دەڵێت: 'قادر لەگەڵ خۆماندا ئەبەین.'

مام مستەفا توورە دەبێت و دەڵێت: 'کوڕە ناماقووڵیتان کرد، مەگەر بە سەر لاشەی مندا ئەو کوڕە بەرن، چونکە منداڵە و ئێوە هەمووتان خوێڕی و سەرسەرین و جێگەی باوەڕ نین.'

پۆلیسەکان یەکێکیان لەگەڵدا دەبێت، شەرواڵ و کراسێکی لە بەردا دەبێت و بە جامانەیەک سەر و گوێلاکی خۆی داپۆشیبوو. پۆلیسەکان دەیانویست مام مستەفا ڕازی بکەن و دەست لە باڵی قادر بەر بدات. مام مستەفا فرسەت دەهێنێت و پەلاماری کابرا دەموچاوهەڵبەستراوەکە دەدا، جامانەکەی لێ دەکاتەوە و ئاشکرای دەکات، مەجید ڕەئووف دەبێت، مام مستەفا هاوار دەکات: 'مەجە خوێڕی، دەک دابوەشێیت، بێسیفەتی خوێڕیی جاسووس، کەم نانی ئەمماڵەت خواردووە، هەی نمەکحەرام.'

مام مستەفا یەخەی مەجید دەگرێت، پۆلیسەکان ژمارەیان لە زیادبووندا بووبوو، زیاتر لە دە کەس بوون، ویستبوویان مەجید ڕەئووف لە دەستی مام مستەفا دەربهێنن، بەڵام مام مستەفا ئەوەندە

تووڕە بوو، پۆلیسێک و مەجید ڕەئووف کەوتبوونە ژێر دەستوپێیەوە، ناچار پۆلیسەکان میلیان هێنابووەوە و لوولەی تفەنگەکانیان کردبووە مام مستەفا. کاتێک مام مستەفا دەستی لە شان و ملی مەجید دەکاتەوە، وەک بڵێیت ملی شکابێت، نەیتوانیبوو بە پێوە خۆی ڕابگرێت.

ئەفسەرەکەیان، تاوەکوو ئەو کاتە لە گۆشەیەکەوە لێی ڕوانیبوون، لە مام مستەفام دەچێتە پێشەوە و پێی دەڵێت: 'ئەگەر سبەینێ غەفوور و عەزیز و محەممەدی کوڕت خۆیان تەسلیم کرد، ئەوا قادر ئەنێرینەوە ماڵ.'

من و مالیک لە پەنجەرەی ژێرزەمینەکەوە سەیرمان دەکرد، کە لە دیوی دەرەوە نەدەبینراین، جەمال هاتبوو لە پەستا زمانی بە شووشەی پەنجەرەی ژێرزەمینەکەدا دەهێنا و کلکی ڕادەوەشاند.

کاکە غەفوور و عەزیز لە ژووری میوانەوە، دۆلابە دارەکە ڕادەکێشن و لەوێوە دەچنە ماڵی حەسەنی حەماڵ و کوبرا، شوێنی ئەو دۆلابە دارەی کاتی خۆی دەرگە بوو، کاتێک حەسەنی حەماڵ ژن دەهێنێت، باوکم ئەو دوو ژوور و هەیوانە جیا دەکاتەوە و دەرگەی حەوشەی بە دیوی سەرەوەدا بۆ دروست دەکات و حەسەن تێیدا نیشتەجێ دەبێت. دۆلابەکە بە جۆرێک لە دیوارەکە جێگیر کرابوو، کەس نەیدەزانی ئەوە پێشتر دەرگە بووە. حەسەنی حەماڵ و کوبرای خێزانیشی لەو نهێنییە ئاگادار بوون. حەسەن لە گەنجێتییەوە وەکوو منداڵی ماڵەکەی لێ هاتبوو، لەو ڕۆژەوە لە شاری سنەی ڕۆژهەڵاتەوە بۆ سلێمانی هاتبوو، لە خانەکەی غەفوورە فەنی و دووکانەکەی باوکم دەبێتە شاگرد، باوکم و مام مستەفام ژنیان بۆ هێنابوو. هەروەها کوبرای خێزانی بەردەستیی حەلاوەخانی دایکمی دەکرد.

پۆلیسەکان تەواوی ماڵەکە گەڕان، هەنگاو بە سەر جێگە بەتاڵەکانی کاکە غەفوور و عەزیزدا دەنێن، بەڵام ناپرسـن ئایا ئەم جێگەیانە هیی کێن.

هەروەهـا دوو پۆلیس هـاتنە ژێرزەمینەکە، من و مـالیکیـان لە سـندووقە چاکان دەرهێنا و یەکێکیان، خۆی تووڕە کرد و لوولەی تفەنگەکەی خسـتە سـەر سـینگم و هاواری کرد: 'بوم، بوم. ئەوە شیوعییەکم کوشت.'

لەو کاتەدا دەسـتم بە دەموچاومەوە گرتبوو. کاتێک دەسـتم لا برد و چاوم هەڵبڕی، جۆگەلەی خوێنی خۆمم لە بەر پێکانمدا هـاتە پێش چاو، ئازارێک لە سینگمدا پەیدا بوو، وەک بڵێیت پۆلیسەکە بە ڕاستی گوللەکانی پێوە نابم، ئازارێک؛ وەکوو ڕووشـاوی و برینی سـەر ئەژنۆکانم ئێستاش هەستیان پێ دەکەم.

پۆلیسەکەی تر پێی گوتین: 'ئێوە بۆچی خۆتان شاردووەتەوە؟'

'لە ترسی ئێوە.'

کاتێک ئەمەم پێ گوتن، چاوم پڕ لە فرمێسک و هەناسەبڕکێم بوو. مالیک بێدەنگ لە منی دەڕوانی، پۆلیسـێکیان پێی گوت: 'ئەی تۆ لە ترسی ئێمە زمانت شکاوە؟!'

ئێمەش تەنیا بێدەنگ لێمان دەڕوانین. ئەژنۆکانم ئازاریان دەهات و خوێنیان لێ دەچۆڕا، کووڕە کووڕ دەڕۆیشـتم، چونکە بە ئەسـتەم لە سندووقەکەدا جێگەم بووبووەوە.

ئەو شـەوە پۆلیسـەکان قادریان بۆ بەندیخانەی سـەرا برد، تاوەکوو دەیگەیەننە ئەوێ، هیچ ناڵێت و بە ترسـەوە بەردەوام بە لاچاو لە پۆلیسـەکـان دەڕوانـێـت. ئەوانەی لەوێ بـوون، بە پـارتـی و

شــــيوعييەكانەوە قادر دەيناســــين و هاتبوونە ماڵی ئێمە، بە تايبەتی محەممەدی مام مستەفای ئامۆزام و هاورێکانی غەفووری برام. وەک قادر خۆی بۆی گێڕامەوە، کە ئەوان دەبینێت؛ هەناســــەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێت و زەردەیەک دەکەوێتە سەر لێوی.

ئەگەر ئەوەشم لە بیر نەچێت، کە ئەو شەوە پۆلیسەکان سوبحی فەیلییان لە خانی وڵاخەکاندا دۆزیبووەوە، پۆلیســـەکان وایان زانیبوو، کە ئێمە لەوێدا سجنمان کردووە. دوایی ئەوەمان لەلا ئاشکرا بوو، کە ســـوبحی هەفتەیەک بووبوو، لەوێدا خۆی شــــاردبووەوە، کە هیچ پەیوەندی بە خۆپیشاندان و هاتنی پۆلیسەکانەوە نەبوو، بەڵکوو تەنیا لە بێزاری خۆی و ترســـی خەڵک لەوێدا بەبێ نان و ئاو خۆی شاردبووەوە، کە لە برساندا وشک هەڵگەڕابوو، قسەی بۆ نەدەکرا و پێستی بە ئێسقانەکانی جەستەیەوە نووسابوو. ئەوە بوو، زیاتر لە دوو هەفتە لە ماڵی ئێمە لە جێگادا کەوت و دایکم وەکوو منداڵێکی ساوا خزمەتی دەکرد.

## ١٣

سالّی ١٩٥٢

خواجه شـــەلەمۆ، دەروێش عەزیزی خزمەتکاری بۆ لای میرزا کەریم نـاردبوو، داوای لە میرزا کەریم کردبوو، لێیـان قەومـاوە و هەرچی زووە خۆی بگەیەنێتە گەڕەکی جوولەکان و مالّی ئەوان. ئەو ڕۆژە تەنیا پێنج مالّی جوو لە گەڕەکی جوولەکاندا مابوون، یەکێک لەوانە مالّی خواجە شـــەلەمۆ بوو. خواجە پێشـــتر تەگبیری ئەوەی لەگەلّ میرزا کەریم کردبوو، کە هەردوو کچەکەی بە موســـلّمان بە شـوو بدات، بەلّکوو خۆی و پیرۆزەی ژنی بتوانن لە سێبەری ئەواندا بژین و دەربەدەر نەبن.

کـاتێـک دەروێش عەزیز ئەو هەوالّەی بۆ میرزا کەریم هێنـابوو، پیرۆزە بنیامین و دوو کچەکەی خواجە شەلەمۆ، گەلاوێژ و پەخشانی بۆ مالّی میرزا کەریم هێنابوون. کچەکان لە تەمەنی خۆیان گەورەتر دیار بوون. چاویان بە کل ڕشـــتبوو. لەو کاتەدا حەوشـــەکەی مالّی میرزا کەریم پڕ بوو لە خەلّک. کە ئـەوان هـاتنە ژوورەوە، هەموو بێدەنـگ بوون. مـالیک و جەلال بە دوایـانـدا هـاتبوونە ژوورەوە و بەرامبەریان دانیشتبوون، وەک سەردەمی منداڵییان بێدەنگ لە یەکیان دەڕوانی. کـاتێـک پیرۆزە دەســـتی کرد بە گریـان، حەلاوەخـان هەردووکیانی کردە دەرەوە.

میرزا کەریم و دەروێش عەزیز گەیشـــتنە بەردەم مـالّی خواجە شـــەلەمۆ، خۆی لـە بـەر دەرگەکە چاوەڕێی دەکردن. پێی پەتی و

شەرواڵێکی کورت، کراسێکی سپیی چرچولۆچی پۆشیبوو، بێ کڵاو و مشکی و سەروڕیشهاتوو. دەستی لە یەک هەڵدەگلۆفین و ئۆقرەی لێ بڕابوو. لەگەڵ بینینی میرزا کەریمدا هەردوو دەستی بەرز کردنەوە و هاواری کرد: 'میرزا گیان ماڵم بە قوڕگیراوە، فریام کەوە!'

'بۆ، خواجە، چی قەوماوە؟'

'ئەو ناعینســـــانە، حاجی شـــێخ ئەحمەد پێنجوێنیی ناموبارەک هەرچییەکم هەبوو بردی، بێجگە لەوە ئەمانەتی ئەو فەقیر و هەژارەی لەگەڵ خۆی بردووە، میرزا گیان کەس نازانێت ئەو قوڕمســــاغە بۆ کوێ چووە، عەرش و قوورشم کرد بە دوایا.'

'ئەوە بە ڕاســتتە، ئەی ئەو پیاوە چەندین ســاڵە شــەریکەکاسـبیت نەبوو؟'

'بەڵێ بە ملی شـــــکاوم، چووزانم، میرزا گیان خۆ من ســــفرە و خوانچەم دایم ڕاخراو بوو.'

'چی لێ بردوویت؟'

'ئینجا چی نەبرد، هەرچییەکم هەبوو بردوویەتی، بێجگە لەوە پارە و زێڕی ئەو خەڵکەی بە ئەمانەت لای من دایاننابوو، هەمووی دزیوە.'

'ئێستا چی بکەین؟'

'ڕجات لێ ئەکەم میرزا گیان، برا من ئەوەی خۆمم لێی ناوێتەوە، بەس ئەمانەتی ئەو خەڵکە فەقیرەی، کە سیقەیان بە من کرد و لامیان دانا، برا با بەس ئەوە بهێنێتەوە. ئەوی تر بۆ خۆی، خۆتانواتەنی گەردنی ئازاد بێت.'

'با بچین شکاتی لێ بکەین.'

'ڕجات لێ ئەکەم میرزا گیان، شـــکاتی چی، ئەی تۆ ئەوە نازانیت، هاواری ئێمە تەنیا ســــەگلوورە و لەمڕۆ بە دواوە ئێمەی جوو هیچ

حەقێکمان پێ نابڕێ، شکاتی لێ بکەم و بیشیگرن، من هیچم دەست ناکەویتەوە.'

'بڵێی ئەو سەگە لە کوێ بێت؟'

'نازانم، باری شانم لارە و ئەمەویت هەر بە قسەی خۆش و بەڵکوو ڕجای لێ بکەین، بەس بەشــــی ئەو خەڵکە هەژارەمان بۆ بگێڕێتەوە. ئەمانەتی خەڵکی هەژاری شاری سنە و ئەو داماوانەی ئێرەیە.'

'دۆست و ناسراوی لێ تێگەیەنین، بەشکم زانیمان ئەو ڕێوییە لە کوێیە.'

'پێشـــتر عەرزم کردیت، بۆ ئەوەی بتوانین بمێنینەوە، بەڵکوو کچەکان بدەم بە شوو!'

'کەسێک هەبوو، ناوی ساڵحی سەعید دەلۆییە، با پرسیارێک بکەم و جوابت لێ ئەگێڕمەوە.'

هێشتا لە بەر دەرگەکە ڕاوەستابوون، میرزا کەریم دەستی خستە سەر شانی خواجە و گوتی: 'من هەرچی خەڵکی ئەو شارە هەیە لێی قاو ئەدەم، تا ئەیدۆزینەوە، خودا بکات لەم شارە مابێت.'

دوای ئەوەی میرزا کەریم ئەمەی گوت، خواجە گریا و باوەشی بە میرزا کەریمدا کرد. ئەویش قۆڵی گرت و لەگەڵ خۆی بردیە ژوورەوە و بانگی لە دەروێش عەزیز کرد.

دەروێش عەزیز پیاوێکی باریکەلەی باڵابەرز بوو، سەر و ڕیشسپی و پرچی لە ژێر مشکییەکەیەوە بە سەر شانیدا شۆڕ بووبووەوە، لە تەمەنی لاوێتییەوە لە بەر دەستی خواجە شەلەمۆدا کاری دەکرد و هەر لە ماڵی ئەوانیش دەمایەوە، کەمدوو بوو، خواجە دەیگوت، کاتی خۆی لە شاری بانەوە هاتووە، بەڵام هەر جارێک لێت دەپرسی، ناوی شوێنی وای دەبرد، کەس نەیبیستبوو.

دەروێش عەزیز هاتە بەردەم میرزا کەریم و بێدەنگ ڕاوەستا، پێی گوت: 'دەروێش ئاگات لە خواجە بێت و باش خزمەتی بکە.' میرزا کەریم دەستی کرد بە بەر باخەڵیدا و دینارێکی دەرهێنا و خستییە ناو دەستییەوە، درێژەی پێ دا، گوتی: 'ئەوە پارە، پێداویستیی بکڕە و نەهێڵیت بێ نان و ئاو بین.'

دەروێش عەزیز بێدەنگ پارەکەی خستە گیرفانی و سەری بۆ ڕاوەشاند.

خواجە شەلەمۆ بە تەنیشتیانەوە ڕاوەستابوو، پاشان میرزا کەریم بەجێی هێشتن. کاتێک بەرەو ماڵ گەڕایەوە، بینیی زۆربەی ماڵەکان دەرگەکانیان لە سەرپشتن، گەیشتە بەردەم ماڵی کۆهین بارۆخ، کە لە ڕیزی ماڵی خواجە شەلەمۆ بوو. کاتێک میرزا کەریم بە بەردەمیاندا تێپەڕی، خۆی و حەبێی ژنی بانگیان لێ کرد: 'بە هەرزان، بە هەرزان و تالان.'

لێی ڕوانین، بە چمکی جامانەکەی ئارەقی دەموچاوی سڕی، بێدەنگ دەستی بۆ هەڵبڕین، بێ ئەوەی هیچ بڵێ.

وەکوو بڵێی بینینی کۆهین بارۆخ و ژنەکەی کێشەکەی خواجە شەلەمۆیان لە بیر بردبێتەوە، بە کۆڵانەکانی گەڕەکی جوولەکاندا دەستی بە گەڕان کرد.

لەو کاتەدا میرزا کەریم بە خەیاڵ بۆ پازدە ساڵ پێش ئەو ڕۆژە گەڕایەوە:

'ساڵی ١٩٣٧ قۆجە شاوڵ لە دووکانی خەیاتییەکەی بەشیر موشیر ئەوەی بە میرزا کەریم گوتبوو، کە بە نیازە لەگەڵ ماڵ و منداڵی بە یەکجاری بۆ ئەمریکا بڕوات. ئەو ڕۆژە، بەشیر داوای لە میرزا کەریم و قۆجە شاوڵ کردبوو، کە لە هەڵبژاردنەکانی نوێنەرانی عێراقدا

پشتیوانیی بکەن. کە لە ناوچەی سلێمانی خۆی کاندید کردبوو. میرزا کەریم دەنگی خزمان و گەڕەکی سەرشەقام، قۆجە شاوڵیش دەنگی جووەکانی سلێمانی و دەوروبەری بۆ بەدەست بهێنێت. بەشیر موشیر بە قۆجە شاوڵی گوتبوو: 'ئەگەر تۆ دەنگی هەموو جووەکانی ناوچەی سلێمانیم بۆ بەدەست بهێنیت و من ببمە ئەندام پەرلەمان، ئەوا لە سلێمانی یەکێک لە مزگەوتەکانی خانەقا و کاک ئەحمەدی شێخ بۆ جووەکان ئەکەمە کنێسەت.'

میرزا کەریم تاوەکوو ئەو ساتەی گەیشتبووە کفری بیری لەو گفتەی بەشیر موشیر کردبووەوە، کە لە جێگەی خۆیدا و بەرەو ڕوو نەیتوانیبوو ئەوەی پێ بڵێت کە لە خەیاڵیدا بوو: 'بەشیر، خەیاڵپڵاو مەبە و ئەو گفتە بە قۆجە شاوڵ مەدە، ئەگەر ببیتە سەرۆکوەزیرانیش لە سلێمانی، ئەوەت پێ ناکرێت.'

پاشان بەشیر موشیر گوتبووی: 'من بۆیە دەنگی کوردە جووەکانم پێویستە، چونکە تەنیا عاقڵەکانی میللەتی کوردم لەگەڵە! ئەوانیش ژمارەیان لە پەنجەی قاچم تێپەڕ ناکات!'

دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەی میرزا کەریم دەگاتە شاری کفری، خۆپیشاندان دەبێت. لە دوورەوە لە خۆپیشاندەرەکانی دەڕوانی، کە زۆربەیان مەلا و شێخ، سۆفی، دەروێش و فەقێ بوون. دیار بوو دوای نوێژی هەینی ئەو خۆپیشاندانەیان ڕێک خستبوو. خەڵکی کاسب و جووتیار لە کەنارەوە وەستابوون و لێیان دەڕوانین. کاتێک هوتافی خۆپیشاندەرانی لە بەر خۆیەوە گوتەوە، پێکەنی.

ویستی دوای خۆپیشاندەرەکان بکەوێت و بۆ بەردەم شارەوانی بچێت، بەڵام لە چایخانەکەی شاکر لای دا و داوای ماست و نان و

پیاڵەیەک چایی کرد. تەنیا دووکان بوو کە لەو ڕاستە شەقامە کراوە بوو. لەو کاتەدا دوو پیاوی کەواوسەڵتەلەبەر کە بە پرچ و ڕیشیانەوە لەوە دەچوون دەروێش بن، لەگەڵ شاکری چایچیدا مشتومڕیان بوو، بە جۆرێک کە چایچییەکە نە گوێی لە سڵاوەکەی بوو، نە لە داواکارییەکەی. ئەوانەی لە چایخانەکە دانیشتبوون، هەموو بێدەنگ و بە سەرنجەوە گوێیان لە لێدوان یان باشترە بڵێین شەڕەقسەی نێوان چایچییەکە و ئەو دوو دەروێشە گرتبوو. دوو دەروێشەکە داوایان لە چایچییەکە دەکرد، کە ئیتر بۆی نییە گرامافۆنەکەی لە چایخانەکە دابنێت، کە ئەوان پێیان دەگوت؛ ئەو دەعبا شەیتانییە. شاکری چایچیش دەیگوت: 'کوڕە برا ئەوە قووانە قووان، لە بەغدا و ئیستەنبوڵ و تەنانەت حاجیی باوکم ئەیگوت بە چاوی خۆم لە مەکە و مەدینەش بینیومە.'

'قەسەم بە خودا لە ناو کەعبەش هەبێت، ئێمە لە کفری قبووڵی ناکەین!'

دوای ئەوەی یەکێک لە دەروێشەکان ئەمەی گوت، هەردووکیان لە چایخانەکە چوونەدەرەوە، یەکێکیان ئاوڕی دایەوە و گوتی: 'کافر مەلعوون، بە گیان شێخ گوێڕایەڵ نەویت، خوێنت ئەڕژم.'

شاکری چایچیی وەڵامی نەدایەوە. دوای ئەوەی بە پەڕۆیەک دەستیی سڕی، چاوی بە سەر مشتەریی نێو چایخانەکەیدا گێڕا، وەکوو بیەوێت پرسیاریان لێ بکات، یان ئەوان بۆچوونی خۆیان لەسەر هەڕەشەی دەروێشەکان بڵێن. بەڵام کەس هیچی نەگوت. میرزا کەریم ئەو بێدەنگییەی شکاند و گوتی: 'سڵاو برا، گوێ مەیەرێ، ئەوانە ئاگایان لە دونیا نییە، تۆ ڕاست ئەکەیت و خۆتواتەنی ئەو قووانە لە هەموو جێگەیەک هەیە، تەنانەت لە ماڵی شێخەکانیش،

تۆ چایەک و جامێ ماســـت و دوو نانم بۆ بێنە. من دەنگت ئەگەیەنمە شوێن خۆی.'

'باشـــە برا، دیارە تۆ غەریبیت و ئاگات لە وەزع خەڵک کفری نییە، ئەمانە کفرییان کردووە بە جەهەننەم.'

'ئەوە ســـەرای کفری و بچۆ شـــەکایەتیان لێ بکە، بۆ قبووڵی ئەکەیت؟'

میرزا کەریم ئەمەی گوت، شـــاکری چایچیی چایەک و جامێک ماســـت و دوو نانی لەســـەر تەپڵەکەکەی بەردەمی دانا، لە میرزا کەریمی ڕوانی و هیچی نەگوت.

کابرایەکی بەتەمەنی ڕیشسپیی کەواوسەڵتەلەبەر کە سێ کەسی لەگەڵدا بوو، لە سووچێکی چایخانەکەدا دانیشتبوون، بە دەنگی بەرز گوتی: 'ئینجا وا شـــکایەتیشـــی کرد، کێ قودرەتی هەس بە دەروێش شێخ کەسنەزان بێژێ پاتان خوار دانیاوە.'

'حکومەت.'

هەموو بێدەنگ بوون و بێجگە لە ملچەملچی دەمی میرزا کەریم، گوێت لە هیچ نەبوو.

دوای ئەوەی پۆلیســـەکان بڵاوەیان بە خۆپیشـــاندەران کرد، لە بەردەرگەی شارەوانی، میرزا کەریم بە پۆلیسێکی گوت، لە بەغداوە بۆ لای قۆجە شـــاوڵ هاتووە و دەیەوێت چاوی پێی بکەوێت. قۆجە شـــاوڵ لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە چاوی لێی دەبێت. ســـێ مانگێک بوو وەک خۆبەخش ڕاوێژکاری شـــارەوانیی کفری بوو. پێش ئەوەی پۆلیسەکە بچێتە ژوورەوە، قۆجە بۆ لای میرزا کەریم هات.

میرزا کەریم پێش چۆنی و چاکی لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەوساکە زانیم کفری کاولە، کە قۆجە شاوڵ حاکمی کولە.' هەردووکیان دەستیان کرد بە پێکەنین و ئەملاولای یەکیان ماچ کرد.

'بەڵێ میرزا، ئەوەش حاڵوگوزەران کفری. عالەم لە تەقەدومدایە و ئێمەش تازە بۆ دواوە دەگەڕێینو. سەد خۆزگەم بە سەردەم خەلیل منەوەر.'

دواتر هەردووکیان بە جیپێک کە پۆلیسێک لێیدەخوڕی، بۆ ماڵی قۆجە شاوڵ چوون. لە کفریی خواروو، گەڕەکی سەیدەکان و کۆڵانی جوومەکان. قۆجە بە گەڕەکی تەورات ناوی دەبرد. پێش چوونەژوورەوە قۆجە بە پۆلیسەکەی گوت، کە لێرە چاوەڕێیان بێ و ئێستا دەگەڕێنەوە.

پێڵدای خێزانی قۆجە و هەردوو کچەکەی، مریەم شانزە و مەندان هەژدە ساڵان بوو، پێشوازییان لە میوانەکە کرد.

میرزا کەریم و قۆجە شاوڵ تەنیا لە ڕێگەی کار و کاسبییەوە یەکیان نەدەناسی. بەڵکوو باوکیان وەستا ئەحمەدی ناڵبەند و شاوڵ ئەولێ دەیڤید دۆست و ناسراوی یەک بوون. هاوتەمەن بوون و لە تەمەنی دە ساڵییەوە هاوڕێ بوون، قۆجە وەکوو میرزا کەریم، خۆی و ژنەکەی لە سلێمانی لە دایک بووبوون. کە میرزا کەریم لە زەماوەندی ژنهێنانەکەیدا ئامادە بووبوو. هەروەها بۆ لەدایکبوونی کچەکانی لە بەغداوە بە تایبەتی دیاریی بۆ هێنابوون.

قۆجە شاوڵ دەوڵەمەند دەبێت و دەست دەگرێت بە سەر بازاڕی سلێمانیدا. چەند بەرژەوەندخوازێک هەڕەشەی کوشتنی لێ دەکەن. دوای ئەوە، بیست ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە بۆ شاری کفری

دەگوازێتەوە. کاتی خۆی میرزا کەریم هەوڵی لەگەڵ دەدات، بەلام پێی ناڵێت کێ هەڕەشەی لێ کردووە.

قۆجە و میرزا کەریم لە حەوشـــەکە نەچوونە ژوورەوە، پێڵـدا جانتایەکی دایە دەسـت قۆجە و هەواڵی ماڵ و منداڵی لە میرزا کەریم پرسی، لە وەلامدا ئەوەی پێ گوتن؛ کە حەلاو کوڕی پێنجەمی بووە و ناویان لێ ناوە جەمال. پاشان قۆجە لە میرزا کەریمی ڕوانی و گوتی: 'میرزا بۆنی ئـارەقەی ڕێگەت لێ دێـت، بـا بچین پێکەوە حەمـامێک بکەین. پاشان باسی سلێمانی و حەلاوەخان و منداڵەکانمان بۆ بکە.'

لە حەمامی پاشا، دوای ئەوەی خورشید فەیلیی ناتر شۆردنی، دوو چای بۆ هێنان. لەو کاتەدا حیکمەت زەهاویی قائیمەقام پەیدا بوو.

'ئەرێ خەڵک شار سلێمانی چۆن یەکتان دۆزیوەتۆ؟'

'بە سیلەی ڕەحم!' میرزا کەریم ئەمەی گوت و هەردووکیان لە بەر حیکمەت هەستان.

دوای تەوقەکردن و چۆنی و چاکی، حیکمەت گوتی: 'گوتیـان دوو دەروێش بە گوللەی پۆلیس بریندار بوون!'

'ئینجا ئەمڕۆ کوا پۆلیس تەقەیان کردبوو؟' قۆجە وای گوت.

'نەخێر، بێقەزا بیت، ئێســـتا چووم و خۆم بە چاوی خۆم بینیمن، جێگەی تیغەکانی خۆیان بووە، بە حیساب حاڵیان لێ نەهاتووە، باوەڕ ناکەم گیان دەرببەن.'

میرزا کەریم، لەژێر لێوە گوتی: 'دەی خوێنیـان بە ئەســـتۆی شێخەکەیان.'

'ئەوە لە حەوشـــەی مزگەوتی تەکیە دایانناون و کوڕی زیکریان بە سەردا بەستوون، هەرچەند داوام لێ کردن، ڕازی نەبوون برینەکانیان

بۆ تەداوی بکەن، ئەو دوو قوڕبەسەرە بەردەوام خوێنیان لە بەر ئەڕوات. لەوانەیە ئێستا مردبن.'

'مردن، ئەی مەگەر ئەوە خەون و تەمەنەی ئەو دوو دەروێشە نەبێت؟!'

قۆجە کاتێک ئەمەی گوت، هەستابووە سەر پێ و بەرەو ژووری خورشید فەیلیی ناتر چوو، کە وەجاخێک و مەرکانەیەک ئاوی لێ بوو. تاوەکوو بە سوراحییەک ئاو و پەرداخێکەوە گەڕایەوە، میرزا کەریم و حیکمەت بێدەنگ بوون. حیکمەت وەک بڵێی بیری لە قسەکەی قۆجە کردبێتەوە: 'ئێ برا خودا ئێمەی هەر بۆ مردن خولقاندووە!'

'ئاخر نەوەک بۆ مەرگدۆستی، قوربان!'

'ژیان دۆزەخێکە بۆ خۆی، ئەگەر بە ترسی پیری و مردنەوە بژیین.'

میرزا کەریم ئەمەی گوت و چەند هەناسەیەک بێدەنگ بوون، حیکمەت هەڵسایە سەر پێ، بانگی لە خورشیدی ناتر کرد و پاشان گوتی: 'زۆر هیلاکی ئەو شەڕەدەنووکەی ئەمڕۆم، ئەگەر چاوەڕێم بکەن، ئێستا دێمەوە خزمەتتان.'

میرزا کەریم بانگی لێ کرد: 'جەنابی قائیمەقام، ئەمڕۆ دووان لەو دەروێشانە لە چایخانەکەی شاکر بوون و شەڕیان بەو قوڕبەسەرە دەفرۆشت، لەسەر ئەوەی گوایە بۆی نییە گرامافۆنەکەی لێ بدات. وتم ئەگەر جەنابتان قسەیەکتان تێدا بکردایە.'

'بەڵێ جەنابی میرزا کەریم، ئاگادارم... حەتمەن!'

حیکمەت لە ســـارداوەکەوە چوو بۆ گەرماوی حەمامەکە. قۆجە بە میرزا کەریمی گوت: 'میرزا ئەوە خۆمانین، ئەگەر وەزع ئاوا بڕوات، پەزەکان گورگ ئەیانخوات!'

'پەزی چی؟ دیسان خەریکی چەرچێتی نەبیت؟!'

'کوڕەماڵتم ئاوەدان کرد، مەبەستم لە وەزعی ئێمەی جووە!'

'بۆ بێجگە لە شانامەکەی ئەوسای خەلیل منەوەر، هیچ بووە؟'

'ئاگات لە چییە، دژەجوو تا بێت لە زیادبووندایە و ئەم وڵاتە بۆنی خوێنی لێ دێ... کە دڵنیام بەڕێوەیە بڕژێت.'

'وام زانیی لە هاتوهاواری ئەو دەروێشە چڵکنانە ترساویت.'

'نەخێر میرزا گیان، ئەوە بۆ هەزار ســاڵ ئەچێت شــێخ و دەروێش بۆڵەبۆڵیانە و کەس گوێشــیان لێ ناگرێت، ئەم جارە ترســەکە لەوە گەورەترە.'

'ئەی چار؟'

'دەستی ماڵ و منداڵ بگرم و بڕۆم بۆ جێیەک کە کچەکانم بێ خەم بخوێنن و ســبەی ببنە دایک و ئەوانیش لە پاشــەڕۆژدا لەبەر ئەوەی جوون، خەمی منداڵەکانیان نەبێت.'

'وەکی ئەوســا چۆن لە سلێمانی کوونییەک هەڕەشــەی لێ کردیت شارت بۆ بەجێ هێشت. هەی جەبان!'

'میرزا گیان، ئەمەی پێت ئەڵێم هەڕەشەی شەخسی نییە و پلانێکی گەورەی ئیقلیمی و بگرە نێونەتەوەییە، لە خۆمەوە قســـە ناکەم و مەعلوماتم لە شـوێنی مەوسوقەوە پێ گەیشـتووە. ئەوەتا هەر دوێنێ دوو کەس بە ناوەکانی... پێم وا بێت؛ ڕەمزی نافیع خەڵکی هەولێر و جەمیل ســـابیر خەڵکی کەرکووک گیراون، کە بە نیازی دامەزراندنی پارتێکی نازی بوون، ئەڵێن ئەو دوو کەســە خۆیان چاویان بە هیتلەر

کەوتووە، تەنانەت بە نهێنییش ڕاوێژکاری تایبەتیی لەگەڵ ناردوون، کە ئەویش گیراوە، بە ناوی یۆهانس مولەر. ئیتر مەگەر بەس من بزانم لە چەند وڵاتێکی ئەورووپا چی دەرحەق بە جووەکان کراوە.'

'ئێستا من بۆچی هاتووم و تۆ باسی چیم بۆ ئەکەیت، ئێ دە وەرە با بە هەموومان دژی ئەو زوڵم زۆردارییە بوەستینەوە.'

'قسەکەت جوانە میرزا گیان، بەڵام پێم وا بێت بیست ساڵێک تاخیر بوویت.'

'ئەی ئێستا چار چییە؟ خۆ من بە نیازی تۆ بووم و جەنابت وەعدد بە بەشیر موشیر دا، کە لەگەڵم بێیت بۆ سلێمانی.'

'نایەم، میرزا لەگەڵت نایەم، بەڵام هەواڵم بۆ هەموو خزمان ناردووە، کە ناوی جەنابی سەرۆکی کول، بەشیر موشیریان لە بیر نەچێت.'

بەم قسەیە حەمامەکە بە پێکەنینی هەردووکیان دەنگی دایەوە.

خورشیدی ناتر بە پەلە هاتە ساردادوەکە و پرسیی: 'بانگ منتان کرد؟'

میرزا کەریم بە دەم پێکەنینەوە: 'بەڵێ خورشید، ئەوە تۆ لە کوێیت؟ چاییمان بۆ بێنە، چایی.'

'ئەرێ کاکە تۆ لە کوێ بوویت؟ لە دووکانەکەتەوە ناردبوویان بە دواتدا.' کاتێک مام مستەفا ئەمەی بە میرزا کەریم گوت، لەو خەیاڵەی دایبڕی. گەیشتبووە حەوشەکەی ماڵی خۆیان، وەڵامی مستەفای برای نەدایەوە و تەنانەت لێشی نەڕوانی.

ناو حەوشەکەیان ئەوەندە خەڵکی لێ بوو، بە ئاستەم ڕێگە هەبوو بچێتە ژوورەوە، کڵاو و جامانەکەی بە دەستییەوە بوو، ئارەق لە

ڕووی دەچۆڕا، سەری داخست و بێ ئەوەی سڵاو لە کەس بکات بۆ ژوورەوە چوو، دەرگەکەی حەلاوەخانی کردەوە و گوتی: 'حەلاو، ئەو منداڵانەی خواجە شەلەمۆ با چەند ڕۆژێک لێرە بن.'

حەلاوەخان و پیرۆزە خێرا خۆیان کۆ کردەوە و لە بەری هەستانە سەر پێ، حەلاوەخان پرسیی: 'بۆ میرزا گیان، هیچ بووە؟'

'نەخێر، شتێکی وا نەبووە، دوایی بۆت باس ئەکەم.'

پێش ئەوەی ئەوان فریای وەڵامدانەوە بکەون، ئەو دەرگەکەی داخست و بە پەلە لە ماڵ چووەدەر و بەرەو بازاڕ چوو.

* * *

'ئەرێ ساڵح، پێم ناڵێیت، تۆ بۆ ئەوەندە دڵت لە دوای ڕۆیشتنی ئەو جووانەی گەڕەکی جوولەکانە؟'

کاتێک عەبدوڵڵا گۆران ئەمەی بە ساڵح شارەزووری گوت، لە ماڵی میرزا کەریم بوون، خۆیانیان بۆ چالاکییەک ئامادە دەکرد.

ساڵح شارەزووری هەناسەی هەڵکێشا: 'ئەی مەگەر باوک و باپیری منیش جوو نەبووبن!'

'چۆن، کاک عەلیی برات قەت لەو بارەوە هیچی نەگوتووە؟'

'ئەوە بۆ یەکەم جارمە لای کەسێک باسی ئەکەم، لەوانەیە ئەوەش تەئسیری ئەوە بێت، کە ئەمڕۆ ڕۆیشتنی ئەو جووانەی گەڕەکی جوولەکانم بینی!'

'چۆن؟'

‘لەگەڵ جەنابی میرزا کەریم بە دیاریانەوە بووین، خەڵکی ئەو گەڕەکە هەموو بە سەڵتی ڕۆیشتن، ئەوە لە هەڵەبجەش بە هەمان شێوە، یەک ماڵی جووی تێدا نەما.’

‘تۆ گوتت، باوک و باپیرتان جوو بوون؟’

‘بەڵێ قوربان، ئێمە چوار خوشک و دوو براین، باوکمان ئێستا لە سجیلا ناوی عەبدوڵلایە، کە دوو برای تریشی هەیە بە ناوەکانی ڕەشید و عوسمان. خۆی باوکم ناوی ئیسحاقە و مامە ڕەشید ناوی داود و عوسمانیش ناوی ڕاستیی شەلەمۆیە، کە ناوی ڕاستیی باوکیشیان ئیسحاقی ئەولێ دانیال بەهنام بووە و گۆڕاوە بە سۆفی محەممەد. ناوی پوورەکانیشم بێجگە لە مەهتاب، ئەوانی تر ناویان گۆڕدراوە.’

عەبدوڵلا گۆران سەری دانەواند و لێی ڕوانی: ‘کە واتە عەلی عەبدوڵلا شەونمی برات، ناوی باوکی ئیسحاق بووە؟ ئەی بۆچی قەت باسی نەکردووە؟’

‘بەڵێ، ئەوە حەقیقەتە، ئیتر کاکم ڕای لەگەڵ من جیاوازە و نایەوێت لەو بارەوە لەگەڵ خۆشمان بدوێت.’

‘ئەی دایکتان جوو بووە؟’

حەمەساڵح دیلان ئەمەی پرسی و پاشان لە تەنیشتی ساڵح شارەزوورییەوە دانیشت.

‘نەخێر، فاتمەی دایکم کچی حاجی حوسێنی غولامە، کە ئەکاتە خاڵی مستەفا پاشای یامولکی، واتە فاتمەی دایکم و مستەفا پاشای یامولکی خاڵۆزا و پوورزان.’

‘ئاوا، بە گوێرەی ئەو مێژووە بێت، ناحەقت نییە دڵت بە ڕۆیشتنی ئەو جووانە ئەسووتێت!’ گۆران ئەمەی گوت.

'ئێ مامۆستا، خەمی من تەنیا بۆ ڕۆیشتنی ئەو جووانە نییە. پاشان سەرەی ئێمە و ئەوانی تریشە، ئەگەر سبەینێ، ئەو ماڵە عەرەبانەی شارەزوور کە لە گامێش تەپەی شارۆچکەی سەیدسادق نیشتەجێ بوون، ناچار بکرێن بڕۆن، من هەمان هەستم بۆیان ئەبێت، چونکە وەکوو خەڵکی ناوچەکەیان لێ هاتووە و هیچ فەرقێکیان لەگەڵ من و تۆ نییە، ئێ ئەوەتانێ پیرەکانیان هەموو پەکییان کەوتووە و منداڵەکانیان... کە لە شارەزوور لەدایک بوون، هەر ناشزانن بابیان لە کوێوە هاتووە. ئەی تۆ دێیت ئەو منداڵانە بۆ کوێ دەرئەکەیت، کە باش عەرەبییش نازانن؟'

'ئا لەوەیاندا من تەواو لەگەڵتدا هاوڕام، بەڵام کاتێک داگیرکەری خۆسەپێن ئەبێتە بڕیاردەر، ئیتر ئێمە ئەبینە تەماشاکەرێکی بێدەسەڵات، ئەگەر وەکوو ئێستامان بمێنینەوە، ئەبێت چاوەڕوانی خراپتریش بکەین.'

لەو کاتەدا غەفووری میرزا کەریم هات و پێی گوتن: 'ئەمڕۆ چی بکەین و چۆن خۆمان ڕێک بخەین؟'

محەممەد موسەدەقی چەپڕەو لە ئێران بە پشتگیری زۆرینەی دەنگی پەرلەمانتاران و لێپرسراوانی دەزگە حکوومییەکان نەوت خۆماڵی دەکات و ڕەزا شا بۆ بەغدا هەڵدێت، کە چەند ڕۆژێک پێش ئەو ڕۆژە ڕووی دابوو.

لە تەواوی شارەکانی عێراق شیوعییەکان ئاهەنگی خۆشی دەگێڕن، لە سلێمانییش بە نیازن بەو بۆنەیەوە ڕێپێوانێک ڕێک بخەن، بۆ ئەوەی دەسەڵاتداران بزانن، کە پەیوەندی بە هەڵاتنی ڕەزا شاوە هەیە، تاوەکوو نیشانی بدەن کە خەڵکی سلێمانییش بە گۆڕینی دەسەلات لە ئێران، خۆشحاڵن.

زیاتر له بیست منداڵیان له کۆلانەکانی سەرشەقام کۆ کردبوونەوە، کیسـەیەک نوقڵی ترش و شـیرینیان بە سـەردا دابەش کردبوون، هەموویـان ملچەملچ دەوریـان لە عەبدوڵڵا گۆران و ئـەحمـەد هـەردی دابوو.

گۆران پارچەیەک کاغەزی بە دەسـتەوە بوو، دوو کۆپلەشـیعری منداڵانیـان بۆ ئەو ڕۆژە لـەگـەڵ ئـەحمـەد هـەردی هۆنیبووەوە، بەڵام منداڵەکانیان بۆ بێدەنگ نەدەکرا، تاوەکوو لە مەبەسـتی خۆیان تێیان بگەیەنن. زووزوو نوقڵەکانیان لە دەمیان دەردەهێنا و لێیان دەڕوانی و نیشـانی یەکیان دەدا. خەیاڵیان تەنیا لای لەزەتی نوقڵەکە بوو. منداڵێک بە ناوی فازیلی حاجی عەبدوڵڵا پرسـی: 'مامۆسـتا ئەمڕۆ جەژنی چییە و بۆچی ئاهەنگ ئەگێڕین؟'

پێش ئەوەی گۆران فریـا بکەوێـت و وەڵامی بـداتەوە، ڕوونـاکی میرزا کەریم گوتی: 'هەر بۆ خۆشـی ئـاهەنـگ ئەگێڕین، وا نییە مامۆستا؟'

'منداڵینە، ئەمڕۆ لە وڵاتێک و جێگەیەکی دوور لێرە، زاڵمێک لەسـەر حوکم لا براوە، کە زوڵمی لە خەڵکی هەژار ئەکرد. ئێمەش بەو بۆنەیەوە ئاهەنگ و خۆشی ئەگێڕین.'

گۆران ئەمـەی گوت و بانگیان لێ کردن، کە عەرەبانە یایلییەکان ئامادەن. هەموو چاوەڕوانی گۆران و ئـەحمـەد هـەردی و منداڵەکان بوون، دەورەیان لە گۆران و هـەردی دابوو، پرسـیاریان زۆر بوو. هەوڵیان دەدا ئاسان وەڵامیان بدەنەوە، هەروەها دوودڵ بوون لەوەی ڕاسـتیی مەبەسـتی ئاهەنگەکەی ئەو ڕۆژەیان پێ بڵێن، نەوەک ئەو ڕۆژە، یان لە قوتابخانە لە دەمیان دەربچێت و ئەو نهێنییە بدرکێنن.

جەلال چوو خۆی تێکەڵی منداڵەکان کرد و لە شـــانی گۆرانەوە ڕاوەســـتا، گۆران لە جەلالی ڕوانی و لە ژێر لێوەوە، وەکوو نەیەوێت منـداڵەکـان گوێیـان لە دەنگی بێـت: 'ڕێگەیـان نەداین ئەو دوو کۆپلەشـــیعرەیان پێ لە بەر بکەین، ماڵی تۆ ئاوەدان بێت، خەتای ئەو نوقڵە ترش و شیرینەی تۆ بوو!'

'ئوستاز، سیحری تامی نوقڵەکە بوو!'

'ناحەقیان نییە، یەک دەنگی تریان بدەینێ، باڵیان لێ ئەڕوێت و بە ئاســـمانی ئەو شـــارەیدا ئەفڕن.' گۆران وای گوت و هەردی لە ژێر لێوەوە: 'حەتمەن ئەوە سیحری ئەو نوقڵە بووە!' هەرسێکیان پێکەنین.

قادری میرزا کەریم و حەمەسالّح دیلان لەگەڵ سالّح شارەزووری بە گوڵ و قومـاشـــــی ڕەنگاوڕەنگ خەریکی ڕازاندنەوەی عەرەبانە یایلییەکان بوون.

پێشـــتر هەموو ئەندامان و دۆســـتانیان ئاگادار کردبوو، کە دەبێت ئەو ڕۆژە ئاهەنگ بگێڕن، بێ ئەوەی حکومەت هەســـتی پێ بکات و تووشی گرتن و ڕاونان ببنەوە.

بڕیاریان دابوو، لە ماڵی میرزا کەریمەوە دەست پێ بکەن و بۆ بەر دەرکی ســـەرا بڕۆن و بگەڕێنەوە، هەروەها بە درێژاییی ئەو ڕێگەیە ئەندام و لایەنگرانی خۆیان دانابوو، تاوەکوو چەپڵەیان بۆ لێبدەن و پێشوازییان لێ بکەن.

منداڵەکانیـان بە ســـەر عەرەبانەکاندا دابەش کردبوو، گۆران و هەردی پێکەوە، ســـالّح شـــارەزووری و حەمەســـالّح دیلان، قادر و مـالیک. ئەوانی تر بۆ بەر خانەقا و جادەی کاوە چووبوون. کاتێک ویستیان بڕۆن حوسێن عارف و کامەران موکری پەیدا بوون، جەلال لە عارەبانەکە دابەزی، لەگەڵ ئەوان دوای عارەبانەکان کەوتن.

لەسەر جادەکان دەستیان کرد بە گۆرانیگوتن و نوقڵبەخشینەوە، ئەوەندە خەڵک دوایان کەوتبوون، بە تایبەتی منداڵان ڕێگەی هاتوچۆیان بڕیبوو. کاتێک گەیشتنە بەر دەرکی سەرا، پۆلیسەکان لە بێئاگاییدا، تێکەڵی منداڵان دەبوون و دەستیان بۆ نوقڵی ترش و شیرین پان دەکردەوە.

شەوی دوای ئەو ڕۆژە خواجە شەلەمۆ بە نەخۆشیی دڵ مردبوو، کاتێک دەرویش عەزیز ئەو هەواڵەی بۆ میرزا کەریم هێنا، هێشتا پیرۆزەی خێزانی و کچەکانی لەماڵی ئەوان بوون.

لە دوای ئەو ڕۆژەوە میرزا کەریم ناچار بوو، بۆ مانەوەیان بیر لە بەشوودانی هەرسێکیان، پیرۆزە بنیامین و دوو کچەکەی خواجە شەلەمۆ، گەلاوێژ و پەخشان، بکاتەوە.

# ١٤

سالّی ١٩٥٤

نۆی مانگی چوار بڕیار درا هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق ئەنجام بدرێت، لە تەواوی عێراق بەرەی نیشتمانی دروست کران، لە سلێمانییش پارتی و شیوعی بە یەکگرتوویی و لە یەک بەرەدا ڕێک کەوتن و بەیاننامەیان بڵاو کردەوە، نووری ئەحمەدی تەها و حیلمی عەلی شەریف، لەگەڵ حەمەی حاجی تایەر نوێنەری پارتییەکان بوون، لە شیوعییەکانیش ئەحمەد دلّزار و وەستا عەبدول دەستنیشان کرابوون، بۆ نوێنەرایەتیکردنی ئەم بەرە هاوبەشەی پارتی و شیوعی لە پەرلەمانی عێراق، ئیبراهیم ئەحمەد و مارف بەرزنجی هەڵبژێررابوون.

ڕۆژی یەکشەممەی چواری مانگ بوو، کە هێشتا پێنج ڕۆژی مابوو بۆ دەنگدان.

[1]جەلال خالیدی پارێزگار و عەبدوڵڵا محەممەد عەلی جێگری پارێزگار، لەگەڵ عەقید مەجید عەلی بەرپرسی حامییە و مستەفا حەبیب بەڕێوەبەری پۆلیسی سلێمانی، لەوێ بوون. عەلی کەمال و ماجید مستەفا مورادیان لەگەڵ بوو، بەو خەڵکەیان دەناساندن. مستەفا حەبیب دەیگوت؛ نوێنەرانی پارتی و شیوعییەکان پاشەکشەیان کردووە، چونکە ئەمری گرتنیان دەرچووە![1] جەلالی میرزا کەریم لە گەڕانەوەیدا بۆ ماڵەوە ئەمەی بە غەفووری برای گوت.

غەفوور لە وەڵامدا پرسی: 'ئەی کەسێک نەبوو هاواریان لێ بکات و پێیان بڵێت؛ هەی خۆفرۆشی بەکرێگیراوانە، سەهووتان فەرموو!'

'ئەی بێقەزا بیت کاکە، قابیلە ئێمە لەوێ بێدەنگ بووبین، هاوارمان کرد؛ درۆ ئەکەن کەس باوەڕیان پێ نەکات. خۆفرۆشن!'

'ئەی دوایی؟'

'دوایی ڕامان کرد، تاوەکوو بەر خانەقا پۆلیس بە دوامانەوە بوون.'

'کێت لەگەڵ بوو؟'

'لەگەڵ کامەران موکری و سەلاحی عەلیی عائیشە خان. هەروەها حوسامەدین عەلی غالب، کەمال مەزهەر ئەحمەد، جەلال مەعرووف، شەهاب ڕەمزی، ئەسفەندیار ئەحمەد شوکری. ئیتر دوای ئێمە بوو بە هەرا و هووهاکێشان.'

'ئەم ڕووداوانە پێویستە هەمووی بە وردی بنووسرێنەوە!'

'بە نیازم.'

ئەو ڕۆژانە غەفوور چەند مانگێک بوو لە سەفەر گەڕابووەوە، کە بەردەوام جەلال داوای لێ دەکرد باسی ئەو سەفەرەی بۆ بکات، چوونی بۆ لوبنان و ئیتاڵیا و هەنگاریا و لەوێوە بۆ مۆسکۆ، کە جەلال لە باسی دیمەن و شێوازی ژیانی خەڵکەیان تێر نەدەبوو، بە تایبەتی کە غەفوور پێی گوتبوو، بە چاوی خۆی لە هەنگاریا چاوی بە شاعیران نازم حیکمەت و پاپلۆ نیرۆدا کەوتبوو. دوو شاعیر کە جەلال ئەو ڕۆژانە زۆر پێیان سەرسام بوو.

* * *

لە دەفتەری یادەوەرییەکانی جەلالی میرزا کەریمەوە:

بۆ مێژوو، ســــلێمانی حەوتی مانگی چواری ١٩٥٤ بوو. خاوەن بەرژەوەندییەکانی ناوچەی سلێمانی، شێخ و دەرەبەگەکان لە بەرەی دژ بە گەلدا بوون. دوو ڕۆژ پێش هەڵبژاردن، پۆلیس و ســــەرباز خەڵکی شــاریان بە زۆر بۆ بەر دەرکی ســەرا ڕاپێچا. لەوێ جەلال خالیدی پارێزگار، محەممەد سەعید قەزاز، باباعەلی شێخ مەحموودی حەفید، مەســعوود مەلا محەممەد ئەفەندی، بەهائەدینی شــێخ نووری بەگی شــێروانە، جەمال ڕەشــید عەبدوڵڵا بەگی بابان و عیزەدین مەلا ئەبووبەکر ئەفەندیی هەولێری ئامادە بوون.

هەروەها ئەم کەســـایەتییانە، عەلی حاجی ئەحمەد ئاغای عوزێری، حەبیب عەبدولقادر، وەهاب تاڵەبانی و حوســــێنی ســــەید ئەحمەدی خانەقا؛ وەکوو نوێنەری پارتی یەکێتیی دەســــتوور، کە ڕۆژانی پێش هەڵبژاردن بۆ بانگەشە بە تەواوی کوردستاندا گەڕان.

ئەو ڕۆژە ئەوانەی بە جیا لە کەنارەوە ڕاوەســــتابوون، محەممەد ســــەیــد عەبــدوڵڵا نەقیــب هەولێری؛ نوێنەری پــارتی نەتەوەی سۆسیالیستی عەرەبی، کە خۆشی یەکێک بوو لە دامەزرێنەرانی ئەو پارتە نەتەوەپەرستە، لەوێ بوو.

خەڵکی بەچەپڵەڕێزان پێشــــوازییان لێ کردن، لە پشــــتی ئەوانەوە کاندیدە بەرژەوەندیخوازەکان ڕاوەستابوون، کە لە بەرەی نیشتمانیدا نەبوون. نــاومــان لێ نــابوون کــاندیــدە جنۆکەکــان، کە ئەمــانە بوون؛ ئەحمەد محەممەد ســاڵح بەگی جاف، بابەکر حەســەن ئاغای قندۆڵ، جەلال عەبدولحەمید بەگی جاف، حەســەن فەهمی مەحموود پاشــای جاف، عەلی کەمال عەبدولڕەحمان، ماجید مســتەفا موراد لەلە. ســەید ئیبراهیمی شــێخ ســەعیدی حەفید. حەســەن فەهمی عەلی مەحموود

پاشـــای جاف، که هەموویان ئەندامی حیزبەکەی نووری ســـەعید، یەکێتیی دەســتوور، حیزبەکەی ســالّح جەبر، نەتەوەیی ئیشــتراکی بوون. ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکاندا وێنەیان بڵاو دەکرایەوە و باســـی پیاوچاکییان دەکرا. حکومەت پارەیەکی زۆری بەم کاندیدانەی سلێمانی دابوو. ئەوانیش دەنگی خەڵکی هەژاریان پێ دەکڕی. مالیکی ئامۆزام یەکێک بوو لەوانەی بە ڕێکەوت یەک دیناری وەرگرتبوو.

ئەو ڕۆژە لە لایەن جەلال خالیدی پارێزگار و ســـەعید قەزازەوە ئەوە گوترا؛ هەرچی کەســێک دەنگ بە نوێنەرانی بەرەی نیشــتمانی بدات لەســـەر کار دەردەکرێت یان تووشـــی ســـزا دەبێت، ئەو هەڕەشەکردنە لە ناو خەڵکیدا دوودڵی دروست کرد.

* * *

ڕۆژێک پێش هەڵبژاردن، لە بەردەم قەســـرەکەی تۆفیق قەزازدا و لەســـەر شـــەقامی مەولەوی، بە پاڵپشــتیی پۆلیس و ســـەرباز. ئەم کەســـایەتییانە کۆ بووبوونەوە و یەک‌یەک قســـەیان بۆ خەڵکی کرد، باســـیان لەوە دەکرد، حیزبی پارتی و تەحەڕوڕ، بە کرێگیراون و بە نیازی تێکدان و دزینی موڵکی حکوومەتن.

ئەوانەی دیار بوون و ئەو ڕۆژە قســـەیان بۆ خەڵکی کرد ئەمانە بوون: عەبدوڵلا محەممەد عەلی؛ جێگری پارێزگار، تایەر ئەفەندی، لیوا مەجید عەلی، حاجی حەمەســـالّح بەگ، حەمە پاشـــای عەبدولڕەحمان پاشـــا، لیوا مەحموود خەفاف، عەقید مەجید عەلی بەرپرســی حامییە، عەقید محەممەدی عەونی گورون ئەفەندی، شـێخ جەعفەری شـــێخ عەبدولعەزیزی کانیی کەوە، هەروەها چەند

مەلایەکیشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو، تاوەکوو فەتوای ئەوە بدەن کە ئەوەی دەنگ بە بەرەی نیشـــتمانی بدات، بێڕێزی دەکات بە خودا و دینی ئیسلام.

لە ناو شـــاردا بەردەوام لە لایەن لایەنگرانی حکوومەتەوە هەواڵی گرتن یـــان دۆڕانی بەرەی نیشـــتمـــانی بڵاو دەکرایەوە، بێجگە لە ڕۆژنامەی ئەو ڕۆژە، کە لە ســـەرەتاوە تا کۆتاییی شـــانامە بوو بە ســـەر ئەندام و لایەنگری دوو حیزبی حاکمدا، لە هەندێک بابەتیشـــدا هەڕەشـــە و ناشـــیرینکردنی کاندیدەکانی بەرەی نیشـــتمانی بوو. لە هەموو بنکەیەکی دەنگدان بێجگە لە پۆلیس، چەندین کەســـیان بۆ چـــاودێریی خەڵکی دەنگـدەر دانـــابوو. لە گەلێـک شـــوێن لەگەڵ دەنگدەراندا دەچوونە ســـەر ســـندووقەکان و چاودێرییان دەکردن. لە زۆربەی بنکەکاندا خەڵکی ئاســـاییان دەســـتگیر کردبوو، بێجگە لە هەڕەشەکردن. پاشان دواساتی هەڵبژاردن نوێنەرانی بەرژەوەندیخواز لە بنکەی دەنگدانەکان بە پارە دەنگی خەڵکیان دەکڕی.

لە دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەوە چاودێرانی بەرەی نیشـــتمانییان لە هەموو بنکەکان گرتن، یان کردنیانە دەرەوە و تـەنانـەت ڕێگەیان پێ نەدان دەنگ بدەن.

چەند ڕۆژێک بوو بە نـاوێکی خوازراوەوە شـــیعرێکم بۆ گۆڤاری گەلاوێژ نووســـیبوو، زیاتر لە دە جار نووســـیبوومەوە، هەر جارە و ناوێکم لە ژێریدا دەنووســـــی، کە بڕیار بوو ئەو ڕۆژە بڵاو ببێتەوە، ئەوە یەکەم جارم بوو شـــیعر بڵاو بکەمەوە. هەرچەندە نیشـــانی عەبدوڵڵا گۆران و ئـەحمەد هـەردیشـــم دابوو، بەڵام شــــەو خـەو نەدەچووە چاوم.

ئەوەم بە بەهار گوت، ئەویش پێی گوتم: 'ئەگەر بڵاو کرایەوە، من ماچێکی تۆ قەرزارم!'

بە بیرم دێت لە دوای ئەمەوە، بۆ ڕازیکردنی دڵی بەهار، یان باشترە بڵێم لەپێناوی ماچێکدا، ناوی هەموو گۆڤار و ڕۆژنامە کوردی و تەنانەت عەرەبییەکانیشم نووسیبوو، بە مەبەستی ئەوەی ڕۆژانە یان هەفتانە هەرچ شیعرێکم نووسی بۆیان بنێرم، بەڵکو بۆم بڵاو بکەنەوە.

* * *

سەعات نۆی سەرلەبەیانی ڕۆژی دوای هەڵبژاردن، ئەنجامەکان بڵاو کرانەوە. بەرەی نیشتمانی لە سەرانسەری عێراقدا لە کۆی سەد و سی و پێنج کورسیی پەرلەمان، دە کورسییان بەدەست هێنابوو، کە هەموویان عەرەب بوون. یەکێتیی دەستوور پەنجا و یەک کورسی و نەتەوەی ئیشتراکییش بیست و یەک کورسی، هەروەها لە لایەن دیوانی پادشایەتییەوە بە تەسکییە، سی و هەشت کورسی بۆ کەسانی تایبەت تەرخان کرابوون، ئەوانەی دڵسۆز بوون و پشتیوانیی بنەماڵەی پادشایەتییان دەکرد، لەوانە چواردەیان کورد بوون و لە شێخ و دەرەبەگەکان پێک هاتبوون. هەروەها پازدە کورسی تاوەکوو یەکەم دانیشتنی نوێنەران ئاشکرا نەکرابوو.

نووری سەعید حکوومەتی پێک هێنا و گوێ لە ناڕەزاییی خەڵک نەگیرا، لە خۆپیشاندانەکاندا لە تەواوی عێراق شەست و دوو کەس کوژران. یەکەمین دانیشتنی نوێنەران بە ئامادەبوونی نووری سەعید خۆی بەڕێوە چوو، کە ئەندامانی بەرەی نیشتمانی ڕاستەوخۆ

ڕەخنەیان لە مەلیک و سیاسەتی نووری سەعید گرتبوو. پاشان بۆ نەهێشتنی ئەو دە دەنگە ناڕازییەی بەرەی نیشتمانی لە ناو دەستەی نوێنەرانی عێراقدا، بڕیار درا هەڵبژاردن دووبارە بکرێتەوە. گوتیان، لەبەر ئەوەی لە لایەن بەرەی نیشتمانییەوە ساختە کراوە.

نووری سەعید بڕیاری سەرکردنی ئەنجوومەنی نوێنەرانی دەرکرد. پاشان لە مانگی هەشتی هەمان ساڵدا بڕیاری هەڵبژاردنی نوێ درا، لە کۆی سەد و سی و پێنج ئەندام سەد و بیست و یەک ئەندام بە تەسکییە بوونە پەرلەمانتار و لە سەرانسەری عێراقدا هەڵبژاردن تەنیا بۆ چواردە پەرلەمانتار کرا، ئەوانیش سەر بە دوو حیزبە دەسەلاتدارەکە بوون. لە ڕۆژی سێی ئابی هەمان ساڵدا نووری سەعید حکومەتی نوێی پێک هێنا و کۆمەڵێک بڕیاری نوێی دەرکرد. بە تایبەتی بڕگەی دەستووری شازدە و حەڤدە، هەروەها هەژدە، کە تایبەت بوون بە هەڵوەشاندنەوەی پەرلەمان و حیزبەکان، داخستنی ڕۆژنامە و سەندیکا و ڕێکخراوەکان، وەرگرتنەوەی ڕەگەزنامە لەو کەسانەی جوون یان بیروباوەڕی شیوعییان هەیە، ژمارەیەکی زۆر فەرمانبەر و مامۆستای قوتابخانەکان و مامۆستایانی زانکۆ لە کارەکانیان دوور خرانەوە. هەروەها ژمارەیەک ڕێککەوتننامە و هاوپەیمانێتی مۆر کران، کە لە ناوخۆ و ئاستی وڵاتانی عەرەبیدا پەسەندکراو نەبوون. نووری سەعید عێراقی لە دژی ڕووسیا کردە ئەندام لە هاوپەیمانێتییەکی سەربازیی لەگەڵ بەریتانیا و تورکیا و ئێران و پاکستان، کە ئەمە دواتر بە هاوپەیمانیی بەغدا ناسرا.

* * *

بۆ جاری دووەم و دوای سێ مانگ هەڵبژاردن کرایەوە. لە سلێمانی، پارتی و شیوعی خۆمان باش بۆ ئەم پێشهاتە ئامادە کردبوو، کۆڕ و کۆبوونەوە و بەیاننامەمان پێکەوە دەرکرد، چونکە هەواڵی ئەوە گەیشتبوو، کە هەڵبژاردنەکە تەنیا بۆ دامرکاندنەوەی دەنگی بەرەی نیشتمانییە. وەک حیزبی شیوعی هاوڕێ ئەحمەد دڵزار لە سلێمانی نەما و گەڕایەوە هەولێر، عوسمان خۆشناو و عومەر دیلان لێپرسراو بوون. لە هەموو گەڕەکەکاندا بنکەی کۆبوونەوە و ڕێنمایی دانران و خواردن و جێگەی خەویان تێدا بوو. تەنانەت چەکیشمان لێ دانابوون، بەو مەبەستەی ئەگەر لە شارەکانی تری عێراق دەست بە سەر دامودەزگاکانی میریدا گیرا، ئێمەش لە سلێمانی پەلاماری سەرا و پاشان حامییە بدەین. بێجگە لە پۆلیس و سەربازی لایەنگری پارتی و شیوعی زیاتر لە دوو سەد کەس بۆ ئەو مەبەستە ئامادە کرابوون، هەروەها لە هەموو بنکەیەک برینپێچ دانرابوون. بڕیار درابوو سەرهەڵدانەکان لە گەڕەکەکانی سەرشەقام، چوارباخ، دەرگەزێن و گوزەری قەسابەکانەوە دەست پێ بکەین، کە زیاتر بۆ ئەو مەبەستە گونجاو بوون و پۆلیس و بەکرێگیراوی میری کەمی لێ بوو.

ئێمە وەک قوتابییانی شیوعی و پارتی؛ ماڵی سەعیدی برای حەمەکاکەمان هەڵبژارد و کردمانە بنکەی خۆمان، کە لە گوزەری قەسابەکان و نزیک بازاڕ بوو. دوو دەرگەی هەبوو، یەکێکیان لەسەر گوزەری قەسابەکان و بەرەو شەقامی مەولەوی و کانیی ئاسکان بوو. ئەوی تریان لەسەر کۆڵانی حەمامی سوورەت بوو، کە لەوێوە دەمانتوانی بەرەو گەڕەکانی سەرشەقام و چوارباخ بڕۆین، کە ئەو

ناوە چەندین کۆڵانی باریک و بێچاوپێچی هەبوون. بەو جۆرە نەخشەی دەربازبوونمان دانابوو.

* * *

لەگەڵ حسێن عارفی هاوڕێم ئەو ڕۆژانە لێپرسراوی قوتابییان بووین، هەروەها دوو ڕۆژ لە هەفتەیەکدا نابیناکانمان لە ژوورەکەی میرزا کەریمی باوکم کۆ دەکردنەوە، بە مەلا تۆفیقە بێچاوی خاڵمەوە چواردە کەس بوون. لە بەغداوە ئامێری برادیلم بۆ هێنابوون، کە بە سەری پەنجەکانیان دەیانتوانی پیتەکان بناسن و فێری خوێندنەوە ببن.

بۆ ئەوەی نابیناکانی هەولێریش لە کۆمەڵەیەکدا کۆ بکەینەوە، پێکەوە بۆ هەولێر چووین، ئەحمەد دڵزار لەوێ نەبوو، کە ئێمە بۆ لای ئەو چووبووین، ڕەحمانە شەل پێشوازیی لێ کردین و بۆماڵی خۆیی بردین، دوای نانی شێو، دوو کەسی تر بە ناوەکانی مەلا نەفتە و شێخە شەل هاتن، دوو سەعاتێک دواتر ئەحمەد دڵزار لەگەڵ تەها خارۆ خۆیان بە ژووردا کرد. دڵزار گوتی: 'لە شەقڵاوە بووم. لە ماڵی ئەم پیاوەی.'

کاتێک باسی دامەزراندنی کۆمەڵەی نابیناکانمان بۆ کردن، پێکەنینیان پێمان دەهات. پاشان مەلا نەفتە پێی گوتین: 'ئێمە کۆمەڵەی چاوساغانمان لۆ پێک نایێت، ئێستای نۆبەی کوێرانە!' بەو قسەیە پێکەنین.

ئەو ڕۆژە کامێراکەم پێ بوو، داوام لێ کردن کە پێکەوە ڕەسمێک بگرین. بێجگە لە دڵزار و حوسێن عارف هەموو شلەژان و هەڵسانە

ســـەر پێ، لێم تووڕە بوون. هەرچەند ویســـتم تێیان بگەیەنم کە ئەو وێنەیە لە لای خۆم دەپارێزم، هیچ سـوودی نەبوو، تاوەکوو گەیشـتە ئەوەی ڕەحمانە شــــەل لە من و حوســــێن عارف دوودڵ بوو، لە ماڵەکەی کردینییە دەرەوە. ئەو شەوە چووین بۆ ماڵی دڵزار و ڕۆژی دوایی بۆ سلێمانی گەڕاینەوە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە، باسـی سـەفەرەکەم بۆ کاکە غەفوورم گێڕایەوە، دەیناسین و زۆر سەرسام بوو بە کەسایەتیی شێخە شەل و ڕەحمانە شــــەل، بە کاکە غەفوورمم گوت: 'ئەی مەلا نەفتە و تەها خارق، نموونەی مرۆڤی شــــۆڕشــــگێڕ و چینی هەژارن، بێ ئەوەی کتێبیان خوێندبێتەوە بە ســـروشـــتیان بەخشــندەن و چەپگەران و شـــەڕی چینایەتی ئەکەن!'

'ئێ، مەگەر مرۆڤی کورد خۆی بە سروشتی بەخشندە و خاوەنی ڕۆحێکی چەپڕەو نەبێت!'

لەگەڵ کاکە غەفوورم لە ژێرزەمینەکەدا پێکەوە دانیشـــتبووین، حەلاوەخانی دایکم دوو چاییی بۆ هێناین و پرســــی: 'غەفوور گیان، ئەو هەموو خەڵکە بۆچی هاتوون؟ دیسان بە نیازن لەم ماڵەوە دەست بە خۆپیشاندان بکەن؟'

'بەڵێ، بۆچی؟'

'ڕۆڵە گیان نازانم، زۆر خەممە!'

'هیچ خەمت نەبێت و هەموو بە ســـکی تێرەوە هـاتوون و تۆ پێویست ناکات هیچ ئەزیەتێک بکێشیت، تەنانەت چاشیان بۆ لێمەنێ!'

'کوڕە خەمی ئەوەم نییە، بە تەنیا ڕۆژی سەد میوان ڕایی ئەکەم.'

'لەوە دڵنیام، تۆ چەندە کارامەیت. ئەی خەمی چیتە؟'

'ئەمشەو خەونێکی سەیرم بینی!'

'خەون، وام زانی ئاخۆ شتێکت بیستووە، یان...'

'یان چی؟ لەو خەونەمدا هەمووتانم لەدەســـت دابوو، بە تەنیا لە شـــاری غەریبان بووم، وەک ســـواڵکەر بۆ نانێک لە دەرگەی ماڵانم ئەدا.'

'ئەوەندە بیری لێ مەکەرەوە، ئەوە هەمووی ترســـە. ئەم جارەیان هەموو خەڵکی ســلێمانی تێیدا بەشــدارن، ئەگەر شــتێکیش ڕوو بدات، ئێمەش وەک ئەو خەڵکە.'

'ئەی باشە بەڵکوو بەس ترس بێت، ئاگاتان لە خۆتان بێت.'

'هیچ خەمت نەبێت!'

'بەڵام غەفوور گیان، عەزیز و ئەو کوڕانەم بینی تفەنگیان پێ بوو؟'

'ئەوە بەس بۆ ترساندنی پۆلیس و پارێزگاریکردنە لە ئێمە.'

'ئێ... ئێ.'

ئەوە بۆ یەکەم جار بوو دایکم دوودڵ بێت و ئەو پرسیارە لە کاکە غەفوورم بکات.

* * *

ڕقی دەسەڵاتی پادشایەتی لە گەڕەکی سەرشەقام و بە تایبەتی ماڵی میرزا کەریم هۆکارەکەی ئەوە بوو؛ هەرچی لە سلێمانی ڕووی بدایە لەو گەڕەک و ماڵەوە دەستی پێ دەکرد. وەکوو هەموو جارەکانی تر، لە گەڕەکی سەرشەقام و ماڵی ئێمەوە... خۆپیشاندان دەستی پێ کرد. ســـەرلەبەیانی پۆلیس بە گەڕەکی ســـەرشـــەقامدا بڵاو بووبوونەوە، تاوەکوو ڕێگە لە خەڵک بگرن.

له پێش ماڵی ئێمه ئۆتۆمبێلێکی بێژمارەی پیکاب، کۆمەڵێک بە تفەنگەوە لە دەوری بوون. ئەوانیش عەزیزی برام و حەمەڕەشیدی حەمەشانە، مەلا عەبدولی خەیات لەگەڵ کەریم پاڵەوان و عەبدولی سووران بوون. ئەوەیان پێ وترابوو... بە مەرجێک بێ پرس هیچ کارێک نەکەن و بۆ لای فوئاد مەجید و عومەر دیلان بگەڕێنەوە. هەروەها کەمالی حاجی مستەفا و شێخ سدیقی مەحموود وەک چاودێر لەگەڵیان بوون.

خۆپیشاندان دەستی پێ کرد و لە بەر ماڵی ئێمەوە بۆ بەردەم گۆڕەپانی گومرگە سووتاوەکە، تاوەکوو بەر خانەقای مەولانا و بە درێژاییی ڕاستە شەقامەکانی سەرشەقام خەڵک جمەی دەهات. لەوێ نوێنەری پارتی و شیوعی گوتاریان خوێندەوە. بڕیار درا بە شەقامی کاوەدا بەرەو بەر دەرکی سەرا بڕۆین. لە شەقامی کاوە پۆلیس و سەرباز هێرشیان کردە سەرمان و بوو بە تەقەکردن. بەرامبەر یەک ڕاوەستابووین، یەکەم کەس سەعید ساقی بریندار بوو، لە شانی من و کامەران موکرییەوە بوو، لەو کاتەدا پۆلیسەکان هێرشیان هێنا و بە برینداری کەوتە دەستیان، کاتێک کاکە عەزیز و عەبدولی سووران بە چەکەوە بەرەو پۆلیسەکان چوون، خەڵکەکە گەڕانەوە و هەموو پەلاماری پۆلیس و سەربازەکانیان دا. لەوێدا بوو بە شەڕی دەستەویەخە و سەعید ساقیمان بە برینداری لێ سەندنەوە و گەیاندمانەوە بنکەیەکمان لە سەرشەقام.

پۆلیسەکان پاشەکشەیان پێ کرا، بەڵام ژمارەی سەربازەکان لەوەدا نەبوو، کە ئێمە بێ چەک بتوانین بەرەو ڕوویان ببینەوە. ناچاریان کردین ببین بە سێ بەشەوە و لێک دابڕێین، بەرەو سەرشەقام و گەڕەکی گۆیژە و کۆڵانەکانی دەوروبەری حەمامی

سـوورەت بڕۆین. بە دەم ڕێگەوە تەقەکردن و هوتافکێشـان و شـەڕ لەگەڵ سـەرباز و پۆلیس بەردەوام بوو. من لەو گرووپە بووم کە بەرەو حەمامی سـوورەت چووین، لە دواوە تەقەیان لێ دەکردین، حەمەی حاجی غەفووری باخەوان لە دوامانەوە پێوە بوو. ئەوە بوو لە جێگەدا مرد. برینـدارەکـان ژمـارەیـان لە دە کەس زیـاتر بوون، هەندێکیش دەسـتگیر کران. بە تایبەتی ئەوانە، کە بۆ هەڵگرتنەوەی بریندارەکان گەڕابوونەوە.

بۆ ئەوەی بتوانین برینـدارەکـانمـان ڕزگـار بکەین و نەگیرێن، بڕیارمان دا بەو کۆڵانانەدا خۆمان بگەیەنینە ئەسـحابەسـپی و لە دواوە پەلاماری پۆلیس و سەربازەکان بدەین. ئەگەر توانراش تەقەیان لێ بکرێت. کاتێک گەیشـتین، بینیمان هەندێک لە هاوڕێکانی ترمان هەمان ئیشیان کردبووە. پێکەوە چووینە سـەر شـەقامەکە و دەستمان کرد بە بانگکردن و هوتافکێشـان. بە جۆرێک پۆلیسـەکانی شـەقامی کـاوە گەڕانەوە و بەرەو ڕوومـان هـاتن. کـاتێـک بەرامبەر یەک ڕاوەستاین، لە پێشدا هێرشیان نەکردە سـەرمان. شێخ ڕەزای گوڵانی و تۆفیقە ڕەشی ئەفسـەر سـەرپەرشتیی پۆلیسـەکانیان دەکرد. ئێمەش بەردەوام بە نـاوی خۆیـانەوە بـانگمـان دەکردن و بە بەکرێگیراو و خیانەتکـار نـاومـان دەبردن. زۆری نەبرد وەک جـاری یەکەم هەموو لەوێ کۆ بووینەوە.

ئەوانەی لەوێ نزیکم بوون و دەمناسینەوە؛ من و مالیک و کامەران موکری و فوئاد مەجید و کەمال مسـتەفا و حیلمی عەلی شـەریف و حسە ڕەش و عەبدولی سووران بووین. پاشان کورسییەکیان هێنا و کامەران موکری چووە سـەری و دەسـتی کرد بە قسـەکردن و شـیعرخوێندنەوە. ڕووی کردبووە شـێخ ڕەزای گوڵانی و تۆفیقە

ڕەشـــــی ئەفســـــەر و هـــاواری دەکـرد: "هەی پـیـاوی مـیـری، چاومۆرکردنەوەت ئێمە ناترســـێنێت و دامودەزگە شـــڕەکەت ئێمە نالەرزێنێت، ئێمە میللەتمان لەگەڵە و ئێوەش ئەو پۆلیســـە ترســـنۆکە هەڵخەڵەتاوانە." شـێخ ڕەزای گولانی خۆی لە ڕێکخسـتنەکانی پارتیدا بوو! باش هەمووماني دەناسـی و بە تایبەتی کامەران موکری، سـێخ ڕەزا ئەو ڕۆژە ڕێگەی لە پۆلیســـەکـان گرت و ئەمری پێ نەکردن هێرش بکەنە سـەرمان. ڕێگەی بەرەو سـەرا بە ئۆتۆمبێلی سـەربازی گیرابوو، دەمانزانی ئەگەر بەرەو ســـەرا بڕۆین کوشـــتارێکی زۆر دەدەین، پاشـان شـێخ ڕەزا ڕێگەی بۆ چۆڵ کردین و بە هوتافکێشـان بە شەقامی کاوەدا داگەڕاین.

کاتێک ئێمە گەیشـتینە بەر خانەقای مەولانا، لە شـەقامی مەولەوی بوو بە دەســـترێژی گوللە، دوای ئەوە زانیمان پۆلیس و ســـەرباز پەلاماری گەڕەکی سـەرشـەقامیان داوە و خەڵکێکی زۆریان گرتووە. یەکێک لەوانەی، کە بە برینداری دەســـتگیر کرابوو، مەلا عەبدولی خەیات بوو، بەڵام لە شـەقامی مەولەوی پەلاماری سـەیارەی پۆلیس دەدرێت و مەلا عەبدول بە برینداری ڕا دەکات. کاتێک شـــوێنیان پێ گوتین، من و محەممەدی مام مســـتەفام، بەدیعەی مام مســـتەفا و موعەزەزی هاوڕێیمان برد و گەیشـتینە ئەو ماڵە، کە لەو کاتەدا چوار برینـداری لێ بوو، بەدیعەی ئـامۆزام و موعەزەز ئەو کـاتە لە نەخۆشخانە برینپێچ بوون.

ئێمە لە ماڵی حەمەسـەعیدی برای حەمەکاکەی هاوڕێی قادری برام خۆمانمان شـــاردەوە، چونکە پۆلیس و ســـەرباز پێکەوە ماڵ بە ماڵ دەگەڕان. من و مالیک و حەمەی مام مســـتەفام و قادری برام، فوئاد

مەجید و نائیب عەبدوڵڵا، هۆگر گۆران و حەمەکاکە، دواتر کامەران موکرییش هات بۆ لامان.

خەڵکێکی زۆریان گرتبوو، تەنانەت نەخۆش و بریندارەکانیشیان بۆ بەندیخانە دەبرد، بێئاگا بووین لەوەی لە گەڕەکی سەرشەقام ڕەشبگیر کرابوو، چووبوونە سەر ماڵی ئێمە. دواتر ئەوەمان بیست؛ کە لە بەغداوە فەرمان بۆ حامییە و پۆلیسی سلێمانی هاتبوو، کە پەلاماری گەڕەکی سەرشەقام بدرێت. بە تایبەتی ماڵی میرزا کەریم. باوکمیان گرت و دایکم و کچەکانیان دەرکردبووە سەر جادە، ئیتر هەرچییەک لە ماڵەکەدا بووبوو، بە ئۆتۆمبێلی سەربازی بردبوویان بۆ حامییە. تەنانەت ئەو دوو ماڵەی کرێچیمان بوون، حەسەنی حەماڵ و حەمەکەریمی سالحی قەپانچی، دەریانکردبوون و ماڵی ئەوانیشیان تالان کردبوو، خانی ولاخەکان و دووکانەکانیشیان ڕووخاندبوو، گوایە هەموو سەرهەڵدان و چالاکییەکانی ناو شاری سلێمانی لەو ماڵەوە دەست پێ دەکەن. ئەو ڕۆژە، بە هەمان شێوەی ماڵی ئێمە، لە تەنیشتی باخی گشتی ماڵی قادر ئاغایان تالان و داگیر کرد، کە میری بە بنکەی پارتییەکانی دەزانی.

کاتێک باوکمیان گرتبوو، لە بەرچاوی خەڵکی سەرشەقام ئەوەندەیان لێ دابوو، نەیتوانیبوو بە پێی خۆی بڕوات. لە سەراش لە ژوورێکی تاکەکەسیدا دایاننابوو. هەرچەندە دوای دوو ڕۆژ، موعەزەزی برینپێچ چووبوو بۆ لای باوکم و برینەکانی بۆ تەداوی کردبوو، پاشان هەواڵی ئەوەی بە موعەزەزدا بۆ ئێمە ناردبوو، کە خۆمان نەدەین بەدەستەوە، چونکە گوتوویانە ئەگەر کوڕەکانت خۆیان بدەن بە دەستەوە، تۆ بەر دەدەین.

لەســـــەر ئەو هەڵوێســـــتەی باوکم، بڕیاری کۆتاییی داگیرکردنی هەموو ماڵ و دووکان و موڵکی درا، خۆیشی بە شەش مانگ زیندانی حوکم درا. باش بە بیرم دێت، دایکم پێشـــتر دڵی خەبەری دابوو، یان باشـــترە بڵێم خەونی پێوە بینیبوو! بەڵام کەســــمان گوێمان لە حەلاوەخان نەگرت.

## ١٥

بە بیرم دێت هەفتەیەک پێش مردنی عەبدوڵا گۆران، لە لای بووم، بە نیاز بووم قسەکانی بنووسمەوە، بەڵام زۆر دەکۆکی و پچڕ پچڕ قسەی دەکرد، لە پێشدا زۆر سوپاسی کردم، بۆ هێنانی ئەو بیست و پێنج دینارەی، حیزبی شیوعی، مانگانە بۆیان بڕیبووەوە، خۆی لە ڕاستیدا بیست دینار بوو، بەڵام کاتێک زانیم بەشی کرێی خانووەکەی و پێداویستیی ناکات، بڕیارم دا لە گیرفانی خۆم پێنج دیناری بخەمە سەر و پێیشی نەڵێم.

کاتێک بۆ ماڵی عەبدوڵڵا گۆران بەڕێوە بووم، لە گەڕەکی قەزازەکانەوە دوو کەس بە دوامەوە بوون، هەردووکیانم ناسییەوە، کەمالی حازم بەگ و فەریدە ڕەش بوون. وام زانی خۆمم لێ ون کردوون، بەڵام لە گەڕەکی سابوونکەران کەمال لە بەردەممدا پەیدا بوو. دەستی لە بەر باخەڵیدا بوو، بێ ئەوەی چۆنی و چاکیم لەگەڵدا بکات. پێی گوتم: 'واز لە بەهاری غالب عەربەتی بێنە، بۆ خوا پێت ئەڵێم!' تەنیا ئەوەندە و بەس. دیار بوو کەمالی حازم بەگ قسەکەی خۆی بردبووە سەر، چونکە دوو هەفتە دواتر، لەگەڵ کاکە غەفوورم گیراین و بێ لێپرسینەوە ڕەوانەی بەغدایان کردین.

هەفتەیەک پێش ئەو ڕۆژە لای بەهار بووم، چاوی پڕ بوون لە ترس و تەنانەت کاتێک ماچم کرد، هەستم بە ساردیی لێوەکانی کرد، تەنانەت بۆن و تامی دەمیشی گۆڕابوو. لە کاتێکدا خۆی فێری ئەوەی

کردبووم، پێش سڵاو، بە ماچێک پێشوازیی لە یەک بکەین، بەڵام ئەوە بۆ جاری یەکەممان بوو، کە ئەوە ڕووی نەدا و پێی گوتم کە ئەوە بۆ جاری چوارەمە کەماڵی حازم بەگ چۆتەوە داوای، هەروەها بەهار ئەوەشـــی گوت؛ کە وا بزانم ئەم جارەیان هەڕەشـــەیان لە باوکم کردووە.

بیرم لەوە کردەوە باســـی ئەوە لەگەڵ باوکمدا بکەم، بچێت داوای بەهارم بۆ بکات، ئەوەم بە بەهار نەگوت؛ کاتێک لای باوکم باســـم کرد. خۆی کۆ کردەوە و لەگەڵ مام مستەفام گوتیان پێشمان کەوە با بچین بۆت داوا بکەین. پێشتر ئەوەم لەگەڵ مام زامن باسم کردبوو... لە وەڵامدا پێی گوتم: 'ئەوە لە چارەی هیچتاندا نەنووســـراوە. جەلال ئەگەر تۆ ئەوە بکەیت، هەموو گەنجانی ئەم شارە لە خۆت ئەکەیت بە دوژمن، ئەوەش بزانە ئافرەتێکی جوانخاســـی وەک بەهار ئەبەد بە تەنیا نابێت بە موڵکی تۆ، ئەو هەڵگری نووری ما خودایە و تۆی هەڵبژاردووە، لە خۆتی تێک مەدە!'

لەگەڵ باوکم و مام مســـتەفام بۆ داخوازیی بەهار چووین، باوکی لە ماڵ نەبوو، بەڵام نازانم بەهار بۆچی ئاوا خۆی گۆڕیبوو، بە مینی جۆبێکی کورت و ســـەر شـــان و ســـینگی ڕووت، هاتە بەرامبەرمان دانیشـــت، شـــێوازی قســـەکردنیشـــی گۆڕابوو. کاتێک لە ماڵیان هاتینە دەرەوە، باوکم و مام مســـتەفام پێیان گوتم، ئەگەر ئەو کچە ببێتە خێزانت ئێمە کەسوکارت نیین. دواتر بۆم ڕێک نەکەوت پرسیاری ئەو ڕۆژە لە بەهار بکەم.

گەیشتمە لای گۆران؛ لە سەرەتاوە زۆر ماندوو دیار بوو، هەستم دەکرد هۆکاری ئەوەیە، کە تازە لەخەو هەستابوو، پێ دەچوو خەونێکی ناخۆشی دیبێت، چەند جارێک بە دەم باوێشکدانەوە گوتی: 'جەلال تۆ لە هەموو هاورێکانم بۆ من بە ئەمەگتریت.'

'ئەوە بە ڕاستتە ئوستاز، بە ئەرکی سەرشانمی ئەزانم.'

کاتێک ئەمەم پێ گوت، ئەو دەستی بە کۆکە کۆک کردبوو، ئیتر نازانم گوێی لێم بوو یان نا، پاشان گوتی: 'ئەوە ئەڵێن دەیان کەسیان لە مەعمەلی چیمەنتۆکە لەسەر کار دەرکردووە. ئەمشەو خەو نەچۆتە چاوم، تێ ناگەم بۆچی ئەو هەواڵە ئەوەندە لەسەر ڕۆحم گرانە!'

'بەڵێ، کەسێکیش نییە داکۆکی لەو کرێکارانە بکات!'

لێی نەڕوانیم، وەکوو گوێی لێم نەبووبێت، قسەکەی گۆڕی: 'ویستم شیعرێک بنووسم بەڵام... ئەوە تۆ لە دەرگەت دا و خەیاڵت شێواندم!'

'دەڕۆم و ئیسراحەتی خۆت وەرگرە.'

'نەخێر، جەلال گیان ڕۆیشتنی چی، ئەی با ئەو شیعرەم بە قوربانی تۆ بێت، پێ ئەچێت بەم حاڵ و گوزەرانەی خۆمەوە زۆر خەمی پاشەڕۆژی ئەو میللەتەم بێت، کە دیسان ئاغا و دەرەبەگ ئەبێتەوە بە کەڵەگا بەسەر گیانی ئەو فەقیر و هەژارەوە، ئیتر پاشەڕۆژی شۆڕشی ئەو نەتەوەییانە خێر بێت!'

'ئوستاز گیان، تۆ ئاگات لە تەندرووستیی خۆت بێت!'

'ناتوانم جەلال، تۆ ئەوە بێنە پێش چاوی خۆت، ئەگەر لە هەموو شارێک یان شارۆچکە و گوندێکدا کەسێکی بەخشندەی وەک مام زامن بوونی هەبێت.'

'کێ؟ کام مام زامن؟'

'مام زامنی نوقڵفرۆش!'

'بۆ مامۆستا تۆش، مام زامن ئەناسیت؟'

'ئەی جەلال گیان بێقەزا بیت.'

'مەقســــەدم، چوویتە دووکانەکەی و تامی نوقڵی مام زامنت کردووە؟'

'هەر لە یەکەم ڕۆژەوە... پێم ناوەتە ئەم شــارە، بە ڕێکەوت ڕێگەم کەوتە لای ئەو زاتە.'

'بە ڕێکەوت؟!'

'ئەی تۆ پێت وایە لە قەدەرمدا نووسرابێت؟ ئەو ڕۆژەی لە مۆسکۆ هاوڕێکانم لەســەر نووســینی شــیعرێک لێیان کردمە هەرا و بەگرتیان دام، ئەوە بوو بەو نەخۆشــــییە باڵبەســــتیان کردم و بۆ بەغدایان ناردمەوە، مام زامن هاوەڵم بوو.'

'کانییەکی ڕوونی بەر تریفەی مانگەشەو:
لە بنیا بلەرزێ مرواریی زیخ و چەو،
جوانترە لە لای من لە دەریای بێ سنوور.'

'بەڵێ، ئەو دێڕەیان گۆڕیبوو بە؛ جوانترە لە لای من لە مۆســـکۆ. هەر ئەوە نەبوو، بەڵکوو زۆربەی شـــیعرەکانمیان شـــەن و کەو کردبوو!'

'لەســــەر ناوهێنانی کوردســــتان لە شــــیعرەکانماندا، لە لایەن سەرکردایەتیی حیزبی شیوعییەوە سزامان ئەخوارد، تەنانەت ئەوەندە بێویژدان بوون بەگرتیشیان ئەداین.'

'زۆر بە داخەوەم، کە هەمووی بە فیتی هاوڕێکانی خۆمان بوون. دونیایەکی ســەیرە، ئەو ڕۆژانە، عیزەدین مســتەفا، کەمال مەزهەر و مارف خەزنەدار، لە مۆســـکۆ بوون و نزیکم بوون، بەڵام هەرچەند

بیری لێ ئەکەمەوە، نـاچێتە عەقڵمەوە، ئـەو زاتـان، ئەوەیـان لێ بوەشێتەوە!'

'منیش باوەڕ ناکەم، بەڵام... ئەی ئەو تەقریرنووسانە کێ بوون؟'

'نازانم!'

'ئوستاز تۆش دووکانی مام زامن پێ ئەزانیت؟'

'تەمەنێک دووکانەکەی مام زامن جێگەی حەوانەوەم بووە، لە ڕاســـتیدا جەلال ئەوە چەند ڕۆژێکە چاوەڕێی ئەوم، مام زامن لە هەموو جێگەیەک و لە ڕۆژانی تەنگانەدا وەک بڵێی لە غەیبەوە بێت و لێم قوت بووەتەوە، ئیتر جار هەبووە لە سجن بووم.'

'بەڵێ، بەڵێ.'

'ئەی تۆ مام زامن چۆن ئەناسیت؟'

'وەک تۆ، چۆن باسی لێوە ئەکەیت!'

'ئینجـا، جـەلال گیـان تۆش وەک من بێبـەخـت بوویت، بـەڵام خوا خۆشی ویستوویت!'

'بەڵێ ئوستاز، مام زامن قەدری منی زۆر ئەگرت.'

'بۆ تۆش لەو باوەڕەدایت کە ئەو زاتە...'

'ئەبەد گومانم لێی نەبووە.'

'ئەزانی جەلال، زۆر جار بیرم لەوە کردۆتەوە، ئەگەر لە هەموو شـــار یان شـــارۆچکە و گوندێکدا کەســـێکی وەک مام زامن بوونی هەبووایە، ئەگەر لە هەموو شار یان شارۆچکە و گوندێکدا... شوێنێکی وەک مـاڵـەکـەی جـارانی میرزا کـەریم بوونی هـەبووایـە، ئـەوکـات منداڵـەکانمـان خوێندەوار و بێوێنـە دەرئەچوون، بێگومـان نـەوەیـەک پەروەردە ئەبوو شۆڕشگێڕ، کە بێوچان هەوڵی ئەدا بۆ بەدەستهێنانی

ئازادیی خۆی و ئەوانی تر، بێ ئەوەی چاوەڕوانی یەک مسقاڵە زەڕە پاداشت بێت.'

'ماڵی میرزا کەریم؟ ئوستاز مەبەستت لەو ماڵەیە کە ئێستا پۆلیسخانەیە؟'

'بەڵێ، بە داخەوەم و چاک لێمان تێک چوو. ئەی مەگەر هەموو ڕۆشنفکرانی کورد نانی ئەو ماڵەیان نەخواردبێت و لە کتێبخانەکەی ئەو ماڵەوە پێ نەگەیشتبن!'

'ئوستاز، تۆ ناوت لێ نا، کتێبخانەی بیری نوێ!'

'وا بزانم، لە بیرم نەماوە.'

'هەست ئەکەم شتێکی من لەو ماڵەدا بەجێ ماوە، بەڵام هەرچەند بیری لێ ئەکەمەوە، نازانم چییە.'

'پێ ئەچێت بە ڕۆح زۆر هۆگری بووبیت! بۆ، تۆ پێت وایە داگیرکەران تەنیا ماڵیان لێمان داگیر کردووە؟'

'نەخێر ئوستاز گیان، بێقەزا بێت.'

'لە ڕابردوومانداد ئەوەی ئێمە چاوەڕوانمان نەکرد ڕووی دا، ئەوەی ڕووی دا لە دەرەنجامی بیرکردنەوە و کردەوەکانی خۆمانەوە بوو، کەواتە ئەو بەشەی ئێمە ئێستا لە ژیاندا پێمان براوە بەرهەمی ئەرک و ماندووبوونی خۆمانە، ئیتر کەم بێت یان زۆر ئێستا ئێمە لێرەداین.'

'ئەی مەگەر خەڵکی ناکرووزێنەوە و ناڵێن: ئیتر ئەوە بەش و قەدەری ئێمەیە!'

'ئەوە قسەی زەلیل و بێدەسەڵاتەکانە، هەموومان ئاگاداری ڕووداوەکانی مێژووی خۆمانین، ڕەش بن یان سپی، مێژووی ئێمەن و بەشێکن لە ئێمە، ئەوەی ئێستا... مەبەستم لەم ڕۆژەیە، کە ئێمە نیمانە، مێژوو نییە، نان نییە، شوێن نییە، بوون و نەبوونمان نییە،

بەڵکوو تەنیا ئازادییە! بەو جۆرەیش سۆشیالیزم لە کوردستاندا پێی لە زەوی گیر نابێت!'

'کەواتە جووتیار و کرێکاری کورد تەنیا نان و کار دادیان نادات؟'

'بەدەستهێنانی نان و کار تەنیا ڕزگاربوونیانە لە دەست زوڵمی سەرکار، ئەی دوای ئەوە؟ جەلال تۆ لە کۆنگرەی قوتابیان گوتبووت؛ سبەینێ کرێکاری عەرەب سەرکارە و کورد دەبێتە حەماڵی!'

'مەگەر لەسەر ئەوە تەجمیدیان نەکردم.'

'بەڵێ، بە ڕای من ئازادی لە نان گرنگترە، میللەتانی ژێردەستە، کە زمان و فەرهەنگیان لەژێر هەڕەشەی سڕینەوەدایە، ئەستەمە لە واتای سۆشیالیزم بگەن. من هەندێک جار بەند بووم و نانیان ئەدامێ و لە بەرامبەر دا کاریشیان پێ ئەکردم، بەڵام دیل بووم، مەبەستم لە ژێردەستەییە!'

'ئوستاز، قسەکانمان تۆزێک بۆنی نەتەوەچێتییان لێ دێت.'

'ئەگەر بڵێین ئێمە چەپێکی کوردین و شۆڕش بۆ ئازادی و نەمانی چینایەتی ئەکەین لە نێو خەڵکی خۆماندا، پێم وا بێت حەقی خۆمانە!'

'ئوستاز، جاران ڕات جیاواز بوو.'

'هەموومان ڕامان وا بوو، جەلال ئەوە تەنیا تۆ بوویت، ئەو قسەیەی ئێستای منت دەکرد.'

'هەر بۆیە پێتان دەگوتم؛ بزنە ڕەشەکە.'

'ئەوە قسەی غەفووری برات بوو!'

'با واز لەو باسانە بێنین، ئەڵێم، ئوستاز هیچی تازەت نووسیوە؟'

'نووسینی چی جەلال گیان، دەی مەگەر پێم نەگوتیت چاوەڕوانی مام زامنم!'

'ئەگەر دواڕۆژەکانی ژیانتی ژماردبێت، ئەوا پەیدا ئەبێت!'

'هەست ئەکەم ناوسکم پڕە لە ژەهر، ئیتر، دەوری من تەواو!'
ئەوە دواجارم بوو لەگەڵ عەبدوڵا گۆران.

ئەو ڕۆژەی گۆران کۆچی دوایی کرد، حوسێن عارف هات بۆ ماڵمان و بە چاوی پڕ لە فرمێسکەوە گوتی: 'جەلال، عەبدوڵا گۆران مرد.'

دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، هەشــــتی یانزەی ١٩٦٢ بوو، لەگەڵ چەند هاوڕێیەک لە گۆڕســـــتانی گردی ســـــەیوان بووین. شـــێرکۆی فایەق بێکەســـــیش هاتبوو، کە تازە بووبووە ئەندامی یەکێتیی قوتابییان و ئەوە دووەم جارم بوو ببینم، حوسێن عارف گوتی شێرکۆی کوڕی فایەق بێکەس شیعر دەنووسێت، بە بیرم دێت بە حوسێنم گوت: 'تۆ بڵێی شـــیعرنووســـینیش ویراســـی بێت؟' کاتێک بینیم، ئەو قســـەیەی خۆمم بیر کەوتەوە، بە تایبەتی کە خەریکی هەڵکەندنی گۆڕەکەی گۆران بوون، ئێمە لەژێر دارئەرخەوانێکدا دانیشـــــتبووین، شـــــێرکۆ پارچەیەک کاغەزی دەرهێنا و گوتی: 'کاک جەلال ئەوە شـــــیعری هاوڕێیەکمە و لێی بڕوانە، بزانە تامی شیعری تێدایە.' لە چاویم ڕوانی و بینیم بە زوبانی، لێوە وشـــــەکانی تەڕ کردنەوە، زانیم شـــــیعری خۆیەتی، کاتێک خوێندمەوە، کە مردنی گۆران هەناســـــەی لەبەر بڕیبووم، بە شـــــێرکۆم گوت، ئەگەر بەو هاوڕێیەت بڵێیت، با بچێت بخوێنێتەوە، هەموو خوێندەوارێکی کورد ئەتوانێت شیعری لەم جۆرە بنووسێت.

نازانم بۆچی ئاوا وەڵامی شـــێرکۆم دایەوە، هەرچەند شـــیعرەکەیم زۆر بەدڵ بوو، دیـــار بوو، کـــاریگەریی مردنی عەبـــدوڵلا گۆرانم بە ســـەرەوە بوو. پاشـــان محەمەد ئەمین پێنجوێنییش کاغەزێکی بەرەو

ڕووم ڕاگرت و گوتی: 'دەی کاک جەلال لەو شیعرەی منیش بڕوانە.' لەو کاتەدا کامەران موکری بانگی کردین کە گۆڕەکە هەڵکەنراوە و وەرن گۆران دەنێژن.

دوای سەرقەبران و ناشتنی تەرمی عەبدوڵا گۆران، لەگەڵ هاوڕێیان، حوسێن عارف، شێرکۆ بێکەس، کامەران موکری، لە پێش مزگەوت خۆمان لە خەڵکەکە دزییەوە. باشترە بڵێم، خۆمان لەوە دزییەوە، چونکە گۆران وەسیەتی کردبوو، تەڵقین لەسەر گۆڕی دانەدەن و فاتیحەی بۆ نەخوێنن. پێش مردنی ئەوەی بە خۆم گوتبوو؛ حەمەساڵح دیلان بە مەقامێک لەگەڵ نەغمەی ئۆکۆردیۆنەکەی فەرید عیسای هاوڕێماندا و بەس، بەڵام کەس ڕەچاوی ئەو وەسیەتەی گۆرانی نەکرد.
پێکەوە چووین بۆ ماڵی ئێمە، ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام ئەمە بوو: دایکم لەبەر دەرگەوە و دوای ئەوەی میوانەکانی بە خێر هێنان، کە هاوڕێکانم بوون، لە چوونەژوورەوەماندا بۆ ژووری میوان چپاندی بە گوێمدا و گوتی: 'میوانمان هاتووە.' لە یەکەم نیگادا، پیرۆزە و دوو کچەکەی خواجە شەلەمۆم ناسییەوە، گەلاوێژ و پەخشان. گەورە بووبوون و هەردووکیان شوویان کردبوو، گەلاوێژ شووی کردبوو بە ساڵح دەلۆیی، کە لە سلێمانی ساڵح فەنیان پێ دەگوت، ئەو ڕۆژەی لە ماڵی ئێمە بوون سێ منداڵیان هەبوو. ئەوەی ئەو ڕۆژە بیستم، دوای مردنی خواجە شەلەمۆ؛ پیرۆزە شووی بە شێخ ئەحمەد پێنجوێنی کردبوو. زۆر بە لامەوە سەیر بوو، بەڵام ئەو ڕۆژە گوتی، کە ئەوە بۆ پێنج ساڵ دەبێت بێوەژنە.

'بژی کوردستان!'

مامۆستا یاسین حەمەسالح و حەمید سالح، کە بە حەمەبۆر ناسراو بوو، بە بۆیاخێکی سوور ئاوایان لەسەر دیواری قوتابخانەی جمهووری نووسیبوو.

سەعات سێی شەوێکی هەینیی مانگی پێنجی ساڵی ١٩٦٣ بوو، کە ڕۆژ دەبێتەوە ئەو نووسینە لە گەڕەکەکانی سەرشەقام و چوارباخ و جوولەکانەوە دیار دەبێت، هەروەها سایەق و سەکن و ئەوانەی بەو بەیانییە بۆ ئەو گەراجەی بەرامبەر مەکتەبی جمهووری دێن، دەیبینن.

ڕۆژی پێشوو پێکەوە هاتبوون و ئەو دیوارەیان دەستنیشان کردبوو، بڕیاریان دابوو سەعات سێی شەو بگەڕێنەوە، کەمالی حازم بەگ لە ڕێگەی ئەنوەر دارتاشەوە، کە لێپرسراوی شانەکەیان بوو پارچەیەک کاغەری پێ دابوون، کە لەسەر یەکێک لە دیوارەکانی قوتابخانەکانی چوارباخ یان سەرشەقام بینووسن، گوایە نووری ئەحمەدی تەها ئەو داواکارییەی لە کەمالی حازم بەگ کردبوو، نووری لەو ساڵانەدا وەک ئەفسەرێک خانەنشین کرابوو، لە ناوچەی سلێمانی لێپرسراوی ڕێکخستنەکانی پارتی بوو، دوای ئەوە ئاشکرا بوو، کە تەنیا بە پلانی کەمال بووبوو.

ئەو شەوەی گەیشتنە ئەو جێگەیە، لە ناو توورەکەیەکی بۆردا قوتوویەک بۆیاخیان هەڵگرتبوو، فڵچەیەک لە گیرفانی شەرواڵەکەی

مامۆستا یاسیندا بوو، زیاتر لە سەعاتێک لەسەر دیوارەکە و لە ژێر ڕووناکی دارگڵۆپەکەی بەردەم مەکتەبی جمهووری دانیشتبوون، قاچیان شۆڕ کردبووەوە و باسی ئەوەیان دەکرد، ئاخۆ کێ باشترین یاریزانی تۆپی پێی سلێمانییە، حەمەبۆر زووزوو دەچووە سەر باس و خواستی یاریی باسکە، بەڵام مامۆستا یاسین لەو وەرزشەشدا نەک هەر شارەزا بوو، بەڵکوو یەکێک بوو لە یاریزانە باشەکانی یاریی باسکەی یانەی سلێمانی، دوای ئەوەی لە یاریی تۆپی پێدا کەسێکیان بە ناوی ئەحمەد شوتپان ناو برد و لەسەری ڕێک کەوتن، کە ئەو باشترین یاریزانە، بەڵام بۆ باشترین یاریزانی باسکە خۆیان بۆ یەکلا نەکرایەوە، حەمەبۆر بە مامۆستا یاسینی گوت: 'یاسین تۆ باشترین یاریزانی باسکەیت.'

دوای ئەمە بۆ چەند هەناسەیەک بێدەنگ بوون و لە دوورەوە لە گڵۆپە تاکوتەراکانی شاریان دەڕوانی، پاشان حەمەبۆر باسەکەی بردەوە سەر یاریی تۆپی پێ و لە ژێر لێوەوە گوتی: 'خۆ بەهادینە شووتپانی براشی یاریچیی چاکە!'

'ئاخر هەتیو، تۆ بە تەمەنت مەگەر سوتفە، ئەگەر نا شەقت لە تۆپ هەڵنەداوە، تۆ چووزانیت لە خۆتەوە ناو ئەهێنیت!'

'ئێ خۆ ئەگەر دیسان بڵێم یاسین تۆ لای من باشترین یاریزانی تۆپی پێ و باسکە و گۆڕەپان و مەیدان و زۆر شتی تریشیت، وا ئەزانیت گاڵتەت پێ ئەکەم، یان سەر دائەخەیت و باسەکە ئەگۆڕیت.'

'ئێ، ئێ، ماستاوچی!'

'شیعریش.'

'ئەوەیـان، ســـەهووت فەرموو، کـاتێـک جەلالی میرزا کەریم و کـامەران موکری ئەبینم، ڕووم نـایەت لە ڕوویـانـدا دەم بکەمەوە و باسی شیعر بکەم.'

'گوتیان جەلال دیسان لە بەندیخانەیە.'

مامۆستا یاسین وەڵامی نەدایەوە و باسەکەی گۆڕی و چووە سەر باســی بەهاری غالب عەربەتی، شــاعیرانە باســی جوانییەکەیی کرد، پاشان گوتی، کە دەستی گرتووە و ماچی کردووە، حەمەبۆر قسەکەی بە مامۆســتا یاســین بڕی و پرســی: 'بە ڕاســتتە یاسـین، دەی، دەی چۆن؟'

مامۆستا یاسین تاوێک بوو بێدەنگ بووبوو، وەک لە خەیاڵی خۆیدا دیمەنی دەســـتگرتن و ماچکردنی بەهاری هێنابێتە پێش چاوی خۆی. حەمەبۆر لەو خەیاڵەی دابڕی و گوتی: 'دەی یاسین، با بینووسـین و ڕا کەین!'

'جا کەرە بۆ ڕا کەین، شێت بوویت، خۆ کەس بە دەرەوە نییە.'

دیســـان باســـی ڕۆژی پێشـــووی بۆ کرد، کە چۆن چووە و لە دەرگەی مـاڵی غـالـب عەربەتیی داوە و بەهـاری کچی دەرگەی لێ کردووەتەوە، حەمەبۆر گوێی لە قســـەکـانی یـاســـین نەدەگرت و بەردەوام ســـەیری ئەملاولای خۆی دەکرد و بە ترســـەوە گوتی: 'با خۆمـان مـاتـڵ نەکەین، بینووســـین و ڕا کەین! ئێ کـاکە ئەوەتـا مەخفەرەکەمان لێوە دیارە.'

'ئەرێ تۆ، ئەزانیت من باسی چیت بۆ ئەکەم؟'

'ئەی چۆن نازانم، باسی حوب!'

'ئەوە باسـی ئەو مەخفەری پۆلیســەی ســەرشــەقامت کرد، ئەزانیت پێشتر ماڵی کێ بوو، داگیر کرا و کردیان بە مەخفەری پۆلیس؟'

'شێخ مەحموود.'

یاسین پێکەنی: 'هەتیو خۆ ئەو ڕووداوە هەمووی حەوت ساڵ لەمەوبەر بوو، کوێڕا لە بیرت چۆتەوە.'

پاشان یاسین دەستی خستە سەر شانی و خۆی لار کردەوە، وەک بیەوێت لەو تاریکییەدا لە چاوی بڕوانێت و لێی پرسیی: 'ئەزانیت دوێنێ بەهار کە دەرگەکەی لێ کردمەوە، گوتی چی؟'

'بە خودا برا من لە توانامدا نەما، کاکە گیان برای چاک بە با ئەو نووسینە بنووسین و بڕۆین، تا تووشی گێچەڵ نەبووین!'

'ترسنۆک، ناتەوێت بزانیت بەهار چیی پێ گوتم؟'

'ئاخر توو خودا...'

'ئاخر توو خودا... پێم ناڵێیت تۆ لە چی ئەترسیت؟ دەک خودا بتبڕێت بۆ چ پیاوێکیت، گوێم لێ بگرە با قسەکەت بۆ تەواو بکەم.'

مامۆستا یاسین ئەوەی بۆ حەمەبۆری هاوڕێی باس دەکرد، کاتێک بەهار دەرگەکەی لێ کردووەتەوە، پێی گوتووە: 'ئازیزەکەم بیرم کردیت!'

حەمەبۆر ڕاچڵەکی، وەک بڵێی لەخەو خەبەری بووبێتەوە، دەستی برد و خستییە سەر دەستی یاسین و توند گوشی و لێی پرسیی: 'چۆن چۆن، ئەی جەلالی میرزا کەریم؟'

'جەلال گیراوە و هیچ هەواڵێکی نییە، باوەڕ ناکەم ئیتر چاوی بەم شارە بکەوێتەوە،'

دوای نیوەڕۆی ڕۆژی پێشوو، کاتێک مامۆستا یاسین لە دەرگەی ماڵی غالب عەربەتی دەدات، بەهار دەرگەی لێ دەکاتەوە، بەڵام مامۆستا یاسین دەمی تەتەڵە دەکات و ئەوەی پێشوەخت، یان باشترە

بلێم چەند مانگێک بوو خۆی بۆ ئامادە کردبوو، ویستبووی بە بەهاری بلێت: 'بەهار من تۆم خۆش ئەوێت.'

بەلام بە پێچەوانەوە و دوای ئەوەی چەند هەناسەیەک بێدەنگ و سەرسام لە بەهار دەڕوانێت، لە ژێر لێوەوە پێی دەلێت: 'خوشکێ گیان، مزگەوتی خانەقای مەحوی لە کوێوەیە؟'

بەهاریش بە پێکەنینەوە دەلێت: 'بۆ کاکە، تۆ لە خودای ئەگەڕێیت یان لە خورما؟'

پاشان یاسین لەوە زیاتر هیچ نالێت و سەری دادەخات و بە چەند هەنگاوێک بەردەم مالی غالب عەربەتی بە جێ دەهێلێت.

لە کۆتاییی قسەکانیدا حەمەبۆر بە مامۆستا یاسین دەلێت: 'ئەی خۆزگەم بە خۆت.'

دوای تاوێک بێدەنگی، حەمەبۆر لەسەر دیوارەکە دادەبەزێت و دوای ئەوەی لە دیوارەکە دەڕوانێت، دەلێت: 'دەی وەرە خوارەوە با بینووسین، ئەزانیت یاسین ئاوا بە درێژی ئەنووسین: بڕووخێت حیزبی بەعس.'

مامۆستا یاسین لە شانی حەمەبۆرەوە ڕاوەستابوو، فلچەی بۆیاخەکەی لە گیرفانی دەرهێنا، پێکەوە گوێنییەکەیان کردەوە و حەمەبۆر سەری قوتووە بۆیاخەکەی هەلبچڕی و بۆ مامۆستا یاسینی ڕاگرت، پێشتر بڕیاریان دابوو، کە مامۆستا یاسین بینووسێت، چونکە ئەو دەستوخەتی خۆشتر بوو، حەمەبۆر ئاوای بە مامۆستا یاسین گوتبوو، ئەویش لە وەلامدا پێی دەلێت: 'هەی جەبان، بۆ نالێیت لە ترساندا دەستم ئەلەرزێت و ناوێرم بینووسم؟'

لەو کاتەدا ئەو قسەیەی جەلالی میرزا کەریمی بیر کەوتەوە: 'ئەگەر ڕۆژێک من مەجبوور بم لەسەر دیواری قوتابخانەیەک بنووسم، ئەوا بە ڕەنگی سوور، ئاشتی و ئازادی یان بژی کوردستان ئەنووسم.'

کاتێک حەمەبۆر سەیری دەستی مامۆستا یاسینی کرد، بە وشەی (بژی) دەستی پێ کرد، خێرا دەستی خستە سەر شانی یاسین و پێی گوت: 'یاسین، کوڕە یاسین، بڕووخێت، بە بڕووخێت دەست پێ ئەکات، ئەوەی تۆ ئەینووسیت هەڵەیە!'

مامۆستا یاسین بێ ئەوەی لێی بڕوانێت، بەردەوام بوو لەسەر نووسین و لە بەر خۆیەوە گوتی: 'نەخێر حەمەبۆر، بە بژی دەست پێ ئەکات، بژی، نەک بڕووخێت!'

حەمەبۆر وەک بیەوێت بڕوات، قوتووە بۆیاخەکەی لە تەنیشتی مامۆستا یاسینەوە دانابوو، خۆی چووبوو لە دووریی پێنج مەترێکەوە لێی دەڕوانی، بانگی لێ دەکرد: 'کوڕە یاسین، ئەبێت بنووسیت ب ڕو وخێ، بڕووخێت، نەک بژی!'

'من ئەنووسم بژی، ئیتر خودای ئەکرد دونیا ئەڕووخا!'

'کوڕە، ئەنوەر گوتی بنووسن، بڕووخێت حیزبی بەعس.'

مامۆستا یاسین وەک گاڵتەی پێ بکات، زووزوو فڵچەکەی دەژەنی بە قوتووەکەدا و لەبەر خۆیەوە بە پێکەنینەوە دەیگوت: 'تازە نووسیم بژی کوردستان، بە خودا نەک ئەنوەر دارتاش و کەمالی حازم بەگ، بەڵکوو خوداش نایگۆڕێت!'

'ئاخر ئێمە سوێندمان بۆ ئەو پیاوە خواردووە کە لەگەڵی سادق بین.'

'حەمەبۆر گیان سادقین، ئێمە هەمیشە لەگەڵ هاوڕێکانی خۆمان و بگرە هەموو کەسێکی بێگانەشدا سادقین، خەمت نەبێت.'

حەمەبۆر زیاتر لە دە مەترێک لە یاسین و دیواری قوتابخانەی جمهووری دوور کەوتەوە، وەک بیەوێت بڕوات و هاوڕێکەی بەجێ بهێڵێت، ئەو هاوڕێیەی نەک لە قوتابییانی پارتیی دیموکراتدا، بەڵکوو پێشتریش هاوڕێی قوتابخانەی بوو، هەروەها پێکەوە لە تیپی باسکەی یانەی سلێمانی یارییان دەکرد و پێکەوە مامۆستاش بوون، هەستی هاوڕێیەتی وای لێ کردبوو وردە وردە بەرەو لای یاسین هەنگاوی دەنا، مامۆستا یاسین ئاگای لای حەمەبۆر نەمابوو، لەوەدا بوو نووسینەکە تەواو بکات، حەمەبۆر بە لای ڕاست و چەپدا دەڕۆیشت و هەوڵی دەدا نووسینەکەی لێوە دیار بێت، کە بە ئەستەم ڕووناکیی گڵۆپەکە لە بۆیاخە سوورەکەی دەدا و دەخوێنرایەوە، مامۆستا یاسین کاتێک نووسینەکەی تەواو کرد و فڵچەکەی خستە ناو قوتووە بۆیاخەکەوە، سەری قوتووەکەی نایەوە و خستییەوە ناو گوێنییەکەوە و گرێیەکی لێ دا، پاشان ئاوڕی لە حەمەبۆر دایەوە، کە لەو کاتەدا هاتبوو لە پشتییەوە ڕاوەستابوو، کاتێک دووبارە لە نووسینەکەی ڕوانییەوە، لە بەر خۆیەوە و وەکوو بییەوێت بە گوێی یاسیندا بچرپێنێت، خوێندییەوە: 'بژی کوردستان!'

'بەڵێ، بژی کوردستان، جا گەوادم ئەوێت خۆی بە کورد بزانێت و لاریی لەو دێڕە هەبێت!'

'کوڕە برا، کێ لاریی لەوە هەیە، ئەگەر خوداش ئەوەمان پێ ڕەوا نەبینێت من نایپەرستم، بەڵام لە داخی ئەم شیوعییانە پیاو نازانێت بڵێ چی!'

'چییە تۆش مێشکت تێک چووە و بوونی ئەو شیوعییانەت لێ بووە بە داخ و مەراق؟'

'ئەی چۆن برا، ئەرێ وەڵڵا دوژمنی گەلی کوردن و خودانەناسن!'

'بە ڕاســـت حەمەبۆر، دوژمنی گەلی کوردن یان خودانەناســـن... کامیانن؟'

'هەردووکیان!'

'باوەڕ ناکەم. تۆش وەک بزنەکانی تر کاویژ ئەکەیت.'

'ئەی خودانەناس نین؟'

'ئا ئەوەیە مەسەلەکە، مادام خودانەناسن، ئیتر ئەبێت وەک دوژمنی گەلی کورد لێیان بڕوانین، بە ڕاستی ئەوە ئەوپەڕی نەفامییە.'

'ئەرێ یاسین تۆش نەبوویبیت بە شیوعی؟'

'زۆر شتی کۆمۆنیزم وەک نەخشی سەر بەرد ڕاستە!'

'بە خودا برا کوڕانی میرزا کەریم مێشکی تۆشیان تێک داوە!'

'بۆ ئەگەر ڕاســتییەکان بزانیت و مەعریفەتت زیاد بێت، مێشــکت تێک چووە؟'

'کام ڕاستی و مەعریفەت، ئەوەی کە دوژمنی دینن؟'

'کێ وا ئەڵێت؟'

'هەموو کەس.'

'تۆ تا ئەمڕۆکە هیچت لەســـەر مارکســـییەت خوێندووەتەوە، یان ڕۆژنامەیەکی حیزبی شیوعیت خوێندووەتەوە؟'

'نەخێر، جا چۆن ئەیخوێنمەوە، خۆ من تۆ نیم!'

'ئەوە موشکیلەی ئەو خەڵکەیە، بەڵام بە داخەوەم بۆ کەسێکی وەک تۆ و زۆر لە هاوڕێکانمان، کە کوێرانە و بە چاولێکەری بڕیار لەســەر شــتەکان ئەدەن، شــێخ و مەلاکان خۆڵ ئەکەنە چاومان و وەک ئێمە هەموو نەخوێندەوار و نەزان بین!'

'بە خودا برا من دینەکەی خۆمم بە لاوە گرنگە.'

'ئێ منیش، بەڵام ناچم وەک مەیموون تەنیا قسەی ئەوانی تر بڵێمەوە، ئەمەوێت خۆم تێ بگەم؟'

'لە چی؟'

'لە دیانەت.'

'کام؟'

'هەتیو وا تێ نەگەیشتبیت کە کۆمۆنیزم دیانەتە!'

'دەی چووزانم.'

'چووزانم... ئەی ناتەوێت بزانیت؟'

'مردووت بمرێت، تۆش ئەوەندەی تر ئاڵۆزی مەکە، لێم بوویت بە جەلالی میرزا کەریم.'

'بۆ جەلالی میرزا کەریم چییەتی؟'

'کوڕە چووزانم... خۆ ئەو چەند جارەی لەگەڵمان دانیشت من هیچی لێ تێ نەئەگەیشتم!'

'ئینجا چۆن تێ بگەیت ئەگەر جارێک دەست نەدەیتە کتێبێک.'

'ئەرێ جەلال گیراوە؟ بە خودا برا حکومەت حەشر بەو شیوعییانە ئەکات!'

'بە ڕاستی کەس چەشنی ماڵی میرزا کەریم زەرەرمەند نەبوون!'

'ئینجا شیوعی نەبوونایە!'

'ئێستا تۆ واز لەو گەڕەلاوژێیەت بێنە، کەی دەست ئەکەیت بە خوێندنەوە؟'

'بە خودا برا من تاقەتی...'

حەمەبۆر قسەکەی تەواو نەکرد، غالب عەربەتی لە دوایانەوە بە دەنگێکی بەرز گوتی: 'ئەوە خەریکی چین؟!'

غالب عەربەتی بەو بەیانییە زووە بۆ دەرەوەی شـــار و ســـەر باخەکەی دەچوو، کاتێک ئەمەی گوت، هەردووکیان بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بدەنەوە تاوەکوو بزانن کێیە، بەرەو ســـەر، بۆ ناو کۆڵانەکانی سەرشەقام ڕایان کرد، لە چەند هەناسەیەکدا لە چاوی غالب عەربەتی ون بوون.

غالب عەربەتی هاواری لێ کردن، پاشان لە نووسینەکەی ڕوانی و گوتی: 'ئەک خودا لێت بە زیاد نەکات، ئەرێ شـوێن نەمابوو دیواری ئەو مەکتەبە نەبێت، ناوی تیپی خەباتی لێ بنووسن!'

غالب عەربەتی، یاســینی لە پشــتەوە ناســیبووەوە، دەیزانی ئەو ڕاهێنەر و یاریزانی تیپی خەباتە، چونکە پێشـــتر لە یاریگەی ئیدارە مەحەلی بینیبووی، هەروەها لەو ڕۆژانەدا لەســـەر دیواری مەکتەب و فەرمانگەکان ناوی تیپە میللییەکانیان دەنووسی، غالب عەربەتی خۆی خوێندەواریی نەبوو، بەڵام ئەوەی لە دراوسێکانی بیستبوو.

یاسین و حەمەبۆر لە گەڕەکی سەرشەقام یەک دەگرنەوە، وەک چۆن پێشـــتر پلانیان بۆ دانابوو، حەمەبۆر بە دەم ڕاکردنەوە لە ترســـاندا ئەوەندە لێوی خۆیی گەســـتبوو خوێن بە چەناگەیدا دەهاتە خوار، هەروەها دوو جار لە ڕێگە کەوتبوو، شـەرواڵەکەی لە سـەر ئەژنۆوە دڕابوو و ئاســـەواری خوێنیان پێوە بوو، مامۆســـتا یاســـین بە حەمەبۆری گوت: 'ئەو کەسە نامانناسێت و خەمی هیچت نەبێت.'

مامۆستا یاسین لە کاتی ڕاکردندا ئاوڕێکی خێرا دەداتەوە و غالب عەربەتیی باوکی بەهار دەناسێتەوە، پاشان کە گوێی لە دەنگی دەبێت، تەواو دڵنیا دەبێت.

ئەو شەوە یاسین، کاتێک حەمەبۆر دەگەیەنێتەوە بەردەم ماڵی خۆیان و بەجێی دەهێڵێت، لە خەیاڵی ئەوەدا دەبێت بچێت بۆ باخەکانی خوارووی شار و لەوێ قسە لەگەڵ غالب عەربەتیدا بکات، بەڵکوو لای کەس باسیان نەکات و خەبەریان لێ نەدات، پاشان ئەگەر غالب عەربەتی بە داواکەی ڕازی نەبوو، ئەوا لە لای لێپرسراوەکەی بیکات بە ڕاپۆرت و ئەوان تەمبێی بکەن.

بەڵام کە بیری لە بەهار دەکردەوە، لەو بڕیارەی پەشیمان دەبووەوە.

ئەو بەیانییە غالب عەربەتی توورەکە بەجێماوەکە هەڵدەگرێت و دەیبات بۆ مەخفەری پۆلیسی سەرشەقام، لەو کاتەدا دوو پۆلیس لە بەردەرگەکەدا دەبن، کاتێک غالب عەربەتی توورەکەکەیان پیشان دەدات و چیرۆکەکەیان بۆ دەگێڕێتەوە، پۆلیسەکان لێی دەپرسن، ئاخۆ ناوی چ تیپێکیان لەسەر دیوارەکە نووسیوە، غالب عەربەتی لە وەڵامدا دەڵێت: 'نازانم، چونکە بە ناشکوریی خودا نەبێت من نەخوێندەوارم، بەڵام ئەو دوو کوڕە یەکێکیان لە تیپی خەبات یاری ئەکات.'

ئەتانەوێ من بناسن؟
من عشقی ڕێگایەکم مەرگی تیابێ
کە هەڵوێست مرد.. بۆچی نابێ؟
دەروون شیعری شۆڕشێکی تری تیابێ..

جەلالی میرزا کەریم

کاتێک لەگەڵ مالیک لە بازاڕ و گەڕەک پێکەوە بووین، لەبەر ئەوەی دەیانناسین و دەیانزانی ئێمە کێین و هەڵگری چ بیروباوەڕێکین، جنێو و قسەی ناشیرینیان پێ دەگوتین، بێگومان چەند جارێک لە لایەن شەقاوە و بێکارەکانی شارەوە ئەوە ڕووی دا، جنێو و سووکایەتیپێکردنەکە ئەوەندە لەسەر ڕۆحم قورس بوو، نەمدەزانی چۆن بە ئاماژە لە مالیکی گەڕوالّی ئامۆزامی بگەیەنم، یان باشترە بڵێم درۆم لەگەڵ مالیک دەکرد و ڕاستییەکانم پێ نەدەگەیاند. خاتریم دەگرت و لەو ئازارە دەروونییە دەمپاراست، لەو کاتانەدا هەستم بەوە کرد، کە مالیک لە من بەختدارترە کە گوێی لەو قسانە نەبووە، پێ دەچێت ئەوە بە ڕێکەوت نەبووبێت.

هەر ئەو ڕۆژانە بوو، دوو لەو شەقاوانە کە تازە دامەزرابوون و بووبوون بە مستەخدەم مەدەنی و ئێمە پێمان دەگوتن جاش پۆلیس، مچەی بابەگەورە و سالەپیر، سالەی قالە حەلاو بوون، پەلاماریان دام و کامێراکەیان لێ سەندم، لە بەرچاومدا خستییانە ژێر پێیانەوە و شکاندیان، لە دوای ئەو ڕۆژەوە تاوەکوو ساڵێکیش تێپەڕی لە بێزاریمدا لە مالیک بێدەنگتر بووم، ئەو کامێرایەی چاوی من بوو، کە دەمویست لە ڕێگەی زوومەکەیەوە دیمەنی هەندێک کاتی ناوازە بچرکێنم. وەک بڵێی هەستم بەوە کردبێت لە داهاتوودا چی ڕوو دەدات.

پێم وا بێت ئەوە هۆکار بوو، کە بۆ دەربڕینی هەســــتەکانم پەنام بردە بەر شیعر نووسین.

کە شـــاعیر بووم: لە هەر جێگەیەک قەڵەمێکم دەبینی دەمکڕی یان بێ پرس دەمخســـتە گیرفانم. بەردەوام ماڵم لە کاغەز بۆ هەژاران دروســت دەکرد. عاشــقی جوانترین کچی دونیا بووم. قژ و ڕیشــم دەهێشــتەوە و خۆمم غەمگین نیشــان دەدا. بە ناوی خوداوە نامەم بۆ هەمووان دەنووسی و بە خەونی شاعیرانە دڵخۆشم دەکردن. کاتێک بەندیش بووم، خۆم بە بەختەوەر و ئازاد دەزانی. لەگەڵ ســـەگەکاندا تاوەکوو بەرەبەیان بێدار دەبووم و لاســـاییم دەکردنەوە و دەوەڕیم. هەموو شەوێک خۆم مەست دەکرد و گۆرانیم بۆ ژنە تەنیاکانی شار دەگوت. دوور فڕیم و بە جیهـانـدا گەڕام، لە بیری خۆمم بردەوە لەسەر چ پەلێکەوە فڕیوم. سەردەمانێک خۆم ڕادەستی هەوەسەکانم کرد و مەرگدۆستێکی سەرسەخت بووم.

شیعرم دەنووسی لەبریی چەک بۆ دەستەبەرکردنی نان و ئازادی، شیعر و شانامەی بەرگری، دواتر تێگەیشتم و ئەو پرسیارەم لە خۆم دەکرد، ئایا شـــیعر جێگەی ئازاری ئێمەی تێدا دەبێتەوە؟ یان کورت بڕی و زمانی شـیعر دەتوانێت بەرگری لە شـوناســی ئێمە بکات؟ لە کاتێکدا ئێمە ئەوســـا هەموومان شـــاعیر بووین. هەرچەندە تەمەنێک منیش وەک ئەوانی تر بۆ دەربڕینی هەستم پەنام بۆ شـیعرنووسـین بردبوو. دواتر ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ئەوسـا هیچم شک نەدەبرد لە شیعر زیاتر.

تەمەنم حەڤدە ســـاڵ بوو، یەکەم شــیعرم بۆ مام زامن خوێندەوە، ئەو پێی گوتم: 'تۆ و هاوڕێکانت ماڵ و نیشتمان بۆ هەژاران لە کاغەز دروست ئەکەن، واتان لەو خەڵکەی کردووە بە چاوی کراوەوە خەون

بە نـان و ئـازادییەوە ببینن. ئێوەی قوچڕەو بەو خەڵکە ئەڵێن، لەو پێناوەدا بمرن تا لە پاشەڕۆژدا نەوەکانتان ئاسوودە و سەرفراز بن. هەی فســـڕووت، نازانیت، کەس لەمەڕ ئێمە نایەوێت دارێک بڕوێنێت کە خۆی لە بەرەکەی نەخوات.'

پەرداخی ویسـکییەکەی بەردەمی بۆ دە خولەکێک دەچوو بەتاڵ بوو، بەردەوام چاوی بە دوای بارمەنەکەوە بوو، چەند جارێک دەسـتی بۆ هەڵبڕی و لێی ڕوانی: 'بە یارمەتیت، بەڕێز.'

'ببوورە ئێستا دێمە لات.'

کوڕێکی گەنجی باریکەڵەی سـوورکار بوو، کاتێک ئەمەی وەڵام دایەوە لێی دوور کەوتەوە و بۆ ئەو سەری بارەکە چوو، کە زیاتر لە دە مەترێک لەوەوە دوور بوو. بە دەوری بارەکەدا زیاتر لە بیسـت کەسێک دانیشتبوون، لەناو هۆڵی بارەکەش جێگە نەمابوو، بە دەستی چەپی، پەرداخەکەی بەردەمی لەسـەر مێزەکە دەخولاندەوە، لە قاپێکدا بـایەمی سـوێرکراو دانرابوو، زووزوو دەنکێکی لێ دەکردە دەمی، تێکسـتێک لە پشـتییەوە، لەسـەر تەختەیەکی قاوەیی نووسـرابوو: ''تۆ دەبێت پێشـتر هاتبیتە ئێرە، یان یەکێک ناونیشـانی ئێرەی پێ دابێت. هـاتنی تۆ بۆ ئێرە بە ڕێکەوت نییە!'' لە ئـاوێنەکەی بەرامبەریـدا پێچەوانە لێوەی دیار بوو، زیاتر لە جارێک هەوڵی خوێندنەوەی دا.

لەژێر لێوەوە: 'هاتنی من بۆ ئێرە بەڕێکەوت نییە...'

چـاوی بە چواردەوریـدا گێڕا و لـە بـەر خۆیەوە: 'قوربـانی تۆزی ڕێگەتم ئەی بادی خۆش مروور!'

جگەرەیەکی داگیرسـاند و مژی لێ دا، هـەناسـەیەکی قووڵی هەڵکێشا: 'دەبێت خۆت دووریت لەو شارە تاقیی کردبێتەوە ئەوسا بە ڕۆح لەو شیعرەی نالی ئەگەیت! ئەو قسەی دڵی منی کردووە.'

وەک بڵێیت دیمەنەکانی ئەوسای شاری سلێمانی هێنابێتە پێش چاوی خۆی، بێدەنگ، تاوێک بوو چاوی لەسەر مێزەکەی بەردەمی بڕیبوو، لە دەنگی بارمەنەکە ڕاچڵەکی، فەرمووی لێ کرد.

'پێکێک لە هەمان ویسکی.'

بە دوو قوم ویسکییەکەی خواردەوە، دیسان پەرداخەکەی بەرامبەر بارمەنەکە ڕاگرت و پێی گوت: 'دووبارە.'

پاشان پەرداخەکەی لەناو دەستی گرت و سوپاسی بارمەنەکەی کرد. وەک شتێکی بیر کەوتبێتەوە، دەستی برد و دەرەلینگی پانتۆڵەکەی تاوەکوو سەر ئەژنۆی هەڵکرد، بۆ ئەوەی لێی بڕوانێت ئەژنۆی خوراند، لەژێر لێوەوە: 'ئاسەواری ئەو برینە نەعلەتییە سارێژ نابێت!'

لەسەر هەردوو ئەژنۆی ئاسەواری برینێکی سەردەمی منداڵی هەبوو، کە تا ئەو تەمەنەیشی هێشتا پێستی هەڵدەدا و بەردەوام دەیخوراند. لەبەر خۆیەوە گوتی:

"سەیرێ بکە لە بەرد و لە داری مەحەللەکان
دەورێ بدە بە پرسش و تەفتیش و خوار و ژوور
داخۆ دەروونی شەق نەبووە پردی سەرشەقام؟!
پیر و فوتادە تەن نەبووە داری پیرمەسوور؟!"

ئەوەی زیاتر ئەو شیعرەی نالی لە لا شیرین کردبوو، تەنیا دووریی لەو شارە نەبوو، بەڵکوو یادی ئەو ڕۆژانە بوو، کە حەمەساڵح دیلان بە مەقام دەیچڕی و فەرید عیسا ئۆکوردیۆنی بۆ دەژەند.

قومێکی لە ویسکییەکەی دا، دەفتەرەکەی بەر باخەڵی دەرهێنا، قەڵەمێکی داری بەقەد سەری پەنجەی لە نێو پەڕەکانیدا بوو، ئەو

هەفتەیە لە ماڵەوە و هەموو جێگەیەک چەندین جار بەو جۆرە دەفتەر و قەڵەمەکەی لە پێش خۆی ڕاگرتبوو، بێ ئەوەی بتوانێت هیچی تێدا بنووسێت. بە چواردەوری خۆیدا چاوی گێڕا، لە تەنیشتیدا و لە شانی ڕاستییەوە، کچێکی قژڕەشی پێست‌سپیی دانیشتبوو، کوڕە بارمەنەکە زووزوو پێکەکەی بۆ پڕ دەکردەوە و خۆی بە سەر مێزی بارەکەدا لێ نزیک دەکردەوە و بە گوێیدا دەیچرپاند.

بە سەرنجەوە لێی ڕوانی، کاتێک کچەکە ڕووی تێ کرد، جەلال خێرا سەری داخست و لەسەر یەکەم لاپەڕەی دەفتەرەکەی نووسیی: 'ئەمشەو دڵم نوقمی ئاخ و حەسرەتی لافاوێکە و نانیشێتەوە. ئاوداماںم شۆڕکراوەی تەنوورێکە و ناکوژێتەوە. پەنجەکانم سڕی سەهۆڵبەندانێکە و ناتوێتەوە. چاوەکانم کزی ڕێگەی ونبووی ناونیشانێکە و نادۆزرێتەوە. گیانە! ئەمشەو چاوەڕوانم، من شەوگەڕەکەی جارانم، چرای کەزیتم بۆ هەڵکە، تاکوو بێمەوە بەر پەردەی ئاڵی ژووری خەوتنت، کەی گەشتمە لات شەرتبێ سەرم دابنەوێنم بۆ ئەو عەشقەی منی ئاوا ئاوارە کرد، بە بەهەشتیش ناتگۆڕمەوە. ئەوا کازیوەیە و منیش چاوی هیوام لێک نەناوە، هەر بە تەمام جریوەی چۆلەکەی دارستانەکەی ئەوبەرمانەوە لەگەڵ تاڵە تیشکی خۆردا بێنە ژوورەکەت، لەسەر سەرینەکەت هەڵنیشن و نەرم نەرم یاریی بە قژی خاوت کەن. ئەوساکە تۆش چاو هەڵهێنی، پەردەی پەنجەرەکەت لادەی تەماشایەکی دیمەنی نوێی لاپاڵ و نشێو بکەی. بزەیەکیش بە سەر لێوتا گوزەر بکات، نیگایەکیش بگرێتە من. ئیتر هیواکانم دەبنە پۆلە مەل و بە ئاسمانی کوردستانی پڕ ئاشتییا باڵ دەگرن و هەر هەڵدەفڕن.. هەڵدەفڕن و نانیشنەوە.'

بە یەک جار و بێ هەڵە ئەمەی نووسـی. دواقومی ویسـکییەکەی خواردەوە، دووبارە لە کچەکەی ڕوانییەوە، کە لەو کاتەدا ئەویش لێی دەڕوانی، چاوی قاوەیی و برۆکانی باریک و ڕەش، تەمەنی بیسـت سـاڵێک دەبوو، شـێوەی لە بەرچاویدا بووبوو بە بەهار، هەسـتی دەکرد، کە بانگی دەکات، ئەوەی هاتە بەر گوێ، کە هەموو جارێک لێی دەپرسیی: 'جەلال گیان چیت نووسی؟'

هەستایە سـەر پێ و پاکەتە جگەرەکەی هەڵگرت و چوو لە شـانی کچەکەوە ڕاوەسـتا، داوای لێ کرد، ئایا دەتوانێت لایەوە دابنیشـێت، کچەکە لە وەڵامدا گوتی: 'فەرموو.'

دانیشت و لێی پرسیی: 'ناوت چییە؟'

'سپرنیگ.'

لەگەڵ بیستنی ناوەکەیدا هەردوو دەستی بە دەموچاویەوە گرت و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەمە بە ڕێکەوت نییە!'

ئەوەی بە کوردی گوت، سپرنیگ لێی پرسیی: 'چیت گوت؟'

'گوتم ناوەکەت سەرنجڕاکێشە!'

'سوپاس، ئەوە چیت دەنووسی؟'

'ناوم جەلالە.'

دەسـتی درێژ کرد و سپرنیگ دەسـتی خسـتە نێو دەسـتی، لە یەک کاتدا هەردووکیان پێکەوە گوتیان: 'خۆشحاڵ بووم.' پێکەنین.

بۆ چەند هەناسـەیەک دەسـتی یەکیان گرتبوو، جەلال گوتی: 'ئەوە یادەوەرییەکم هاتەوە یاد و گوتم با بینووسم و لە بیرم نەچێتەوە.'

'ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەتنووسی!'

'بەڵێ، زمانی کوردی بەو جۆرەیە.'

'کام زمان؟'

'کوردی، زمانی میللەتەکەی منە لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست.'

'ئێ، ئێ.'

'وا بزانم تۆش ویسکی دەخۆیتەوە، دەتوانم دوو پەرداخ داوا بکەم.'

'بەڵێ، پیاو دەبێت هەرەم دەستپێشخەری بکات!'

'بە خۆشحاڵییەوە.'

زیاتر لە سـێ پێک ویسـکییان پێکەوە خواردەوە، کە بێجگە لە فەرمووکردنی یەکتری بۆ خواردنەوە و جگەرەکێشـان هیچی تریان نەگوت، زووزوو شانیان بەر یەکتری دەکەوت، پاشان سپرنیگ باسی ئەوەی بۆ جەلال کرد، کە بە نیازە باوکی ڕازی بکات تاوەکوو پارەی بداتێ و بۆ چەند مانگێک سـەفەر بۆ ئاسـیا و ئەفریقا بکات، ئەوەی دووبارە دەکردەوە، کە باوکی دەوڵەمەندە و پارە کێشـە نابێت، بەڵام باوکم زۆر دەترسێت.

کاتێک هاتە سەر ئەوەی گوتی: 'دەچم بۆ بەغدا.'

جەلال ئەوەی پێ گوت، کە ئێسـتا لە عێراق جەنگە و باشـترە نەچێت. سـپرنیگ لە وەڵامدا گوتی: 'تاوەکوو من باوکم ڕازی دەکەم، ئەو جەنگە کۆتاییی دێت!'

پاشان پرسیی: 'تۆ کەسوکارت لە بەغدان؟'

جەلال تاوێک بێدەنگ بوو، دەسـتی برد بۆ پاکەتە جگەرەکەی، داینایەوە و پێکە ویسـکییەکەی گرت بە دەسـتییەوە، دوو جار بۆ لای دەمی برد و قومی لێ نەدا، سـەری داخسـتبوو، بێ ئەوەی لێی بڕوانێت:

'بەڵێ، دایکم لەوێیە!'

'ئۆی، بە تەنیا دەژی؟'

'بەڵێ، بە تەنیا لەوێیە!'

سەعاتەکەی بەرامبەریان دوازدەی شەوی تێپەڕاند، سپرنیگ بە جەلالی گوت: 'کوا ئەو دەفتەرە بچووکەی تێیدا نووسیت؟'

وەک لە مەستیدا نەزانێت لە کوێدا هەڵیگرتووە، دوو جار هەستایە سەر پێ و دیسان دانیشتەوە، کاتێک دەفتەرەکەی دایە دەستی، سپرنیگ لە لاپەڕەی کۆتاییدا ژمارەی تەلەفۆنەکەی خۆیی بۆ نووسی. کاتێک ویستی بڕوات، خۆی لێ نزیک کردەوە و ڕوومەتی ماچ کرد، پاشان باوەشی پێدا کرد و توند خۆی پێوە نووساند. جەلال بێدەنگ بوو، هیچی پێ نەگوت، تەنانەت دەستی هەڵنەبڕی بە پشتییەوە بیگرێت، وەک چۆن دواتر بیری لێ دەکردەوە و پەشیمان بوو، تەنیا ئەوەندە نەبێت لە دواوە لێی ڕوانی.

هەستا و پەنجا دۆلارییەکی لەسەر مێزەکە دانا، پەرداخە ویسکییە بەتاڵەکەی لەسەر دانا و لە بارەکە چووە دەرەوە، چاوی بە ڕاست و چەپی شەقامەکەدا گێڕا. چەند ئۆتۆمبێلێک لە ڕاست و چەپی دەرگەی بارەکەوە ڕاوەستابوون.

سەری داخستبوو لە بەر خۆیەوە گوتی: 'بەڵێ حەلاوەخانی دایکم ماڵی لە بەغدایە! بەڵام... ئەوەندە دڵشکاوە دەرگەی ماڵەکەیی لەسەر خۆی کڵۆم کردووە، لە کەسی ناکاتەوە و نایەوێت کەس ببینێت.'

دوای چەند هەناسەیەک و بە دوای سپرنیگدا هاتبووە دەرەوە. ناوەکەی لەسەر زمانی بوو، سەرنجی چووە سەر گڵۆپێک، کە لە کۆتاییی شەقامەکە دەگرا، لە بارینی کلووە بەفرەکانی دەڕوانی، کە لە ژێر ڕووناکیی گڵۆپەکاندا و بە دەم شنە باکەوە سەمایان دەکرد. لە بەر خۆیەوە گوتی: 'هاتنم بۆ ئەم جێگەیە بە ڕێکەوت نەبوو.'

لەو کاتەدا و لە ناکاو لە پشـــتییەوە گوێی لە دەنگی ئۆتۆمبێلێک بوو، فریـای ئەوە نەکەوت ئـاوڕ بـداتەوە، پـاشـــی ئۆتۆمبێلەکە لـە هاتنەدواوەیدا بەر پشـتی کەوت، بە دەمدا کەوت و تایەی لای ڕاسـت و دواوەی ئۆتۆمبێلەکە بە ســەر پشــتیدا تێپەڕی، کاتێک لە تاو ئازار هـاواری کرد، دووبـارە ئۆتۆمبێلەکە گەڕایەوە و جـارێکی تر کەوتەوە ژێر تایەکەی. گوێی لە تێکشکانی ئێسقانەکانی لەشی خۆی بوو، لەتاو ئازار چاوی داخســـت. هەناســـەی لە ســـینگیدا پەنگی خواردەوە، نووزەیەکی لێوە هات و لە هۆش خۆی چوو.

٢

له نەخۆشــخانە دیوار و ســەرچەف و ســەر جێگە ســپییەکانم لێ بووبوون بە بەڵا، هەســـتم دەکرد پەیوەندییەکیان بە ڕابردوومەوە هەبووە، بە تایبەتی ئەو بەندیخانەیەی ســاڵ و نیوێک، لە ســەرەتای شـــەســـتەکاندا، لێی بەند کرابووم. ژوورێکی تەنیایی و یەک مەتر دووجا، کە زەوی و دیوار و بنمیچەکەی بۆیاخی سـپی بوو. ماڵەکەم لە شاری بیسمارک، لە ساڵەکەدا زیاتر لە شەش مانگ بەفر هەموو ئەم شـــارە دادەپۆشـــێت، منیش ناچار پەردەکانم دادەدەوە و لە چوونەدەرەوە خۆم لەو شارە سپیپۆشە دەپارێزم.

کاتێک لە نەخۆشــخانە دەرچووم، پێیان گوتم: باوکی ئەو کەســەی بە ئۆتۆمبێـل لێی دابووم، کـە کچێکی گـەنج بووە، هەموو خەرجیی نەخۆشخانەکەی دابوو. دوای ساڵێک ئەوەم بیر کەوتەوە کە ئەو کچە گەنجە سـپرینگ بووبوو، ئەوەیشـیان پێ گوتم، کە ئەو ئامادە نەبووە بە زەلیلی چاوی پێم بکەوێتەوە.

لە مـاڵەوە بووم، ڕێکخراوێـک پەیوەنـدییـان پێوە کردم، هـاتن و عەرەبانەیان بۆ هێنام، دوای پرســیارکردنی ئەوان، باســی خۆمم بۆ کردن، گوتم کەسـوکار و هاوڕێم لێوە نزیک نین، تاوەکوو بازاڕیم بۆ بکەن و یارمەتیم بدەن. پاشــان هاتنەوە و لەگەڵ خۆیاندا بردمیان بۆ گەڕان، لە ســـەر ڕووباری میســـۆری بە بەلەم چووین بۆ پارکی

دەروازەی ئەبراهـام لینکن. لەوێ گوێمـان لە کوڕێکی گەنج گرت، شیعری بۆ خوێندینەوە. منیش دواتر خۆم لە شاعیرەکە نزیک کردەوە و داوای شـیعرەکـانیم لێ کرد، کوڕە گەنجەکە دەسـتی کرد بە کۆڵەپشـتەکەیدا و کتێبێکی بچووکی بەرگسـووری پێ دام و گوتی: 'ئەگەر ڕۆحت چەپ نەبێت لە شیعر ناگەیت، بە تایبەتی لە شیعرەکانی من.'

قسـەکەی ڕایچڵەکاندم، ویسـتم وەڵامی بدەمەوە، ئەوەم بە خەیاڵدا هات؛ ئینجا چەپبوون حەقی چییە بە سەر تێگەیشتنی شیعرەوە. کە لە ڕاسـتیدا وەڵامێکی خێرا بوو، بێ ئەوەی بیرم لێ کردبێتەوە. ژنێک لە نێوانماندا بوو، ژنەکە پێکەنی و دەستی خستە سەر شانی من و پێش ئەوەی قسـەکەم بکەم، ئەو گوتی: 'بۆ ئەوەی لە شـیعر بگەیت دەبێت ژن بیت!'

قسەی هەردووکیان وەک دەرزییەک چەقینە دڵم، بەهاریش جارێک ئەوەی پێ گوتبووم: 'جەلال گیان، کە شـیعرێکم بۆ ئەخوێنیتەوە لێم مەپرسـە، لێی تێگەیشـتووم یا نا، چونکە بۆ ئەوەی لە شـیعر بگەیت ئەبێت ژن بیت!'

بە بیرم دێت بەهار کاتێک ئەوەی پێ گوتم، کە من چەند جارێک بوو پێم گوتبوو، ئەگەر دەتەوێت لە شیعرەکانم بگەیت، دەبێت بە ڕۆح چەپ بیت.

لێم ڕوانین و پێم گوتن: 'بە ڕای ئێوە، بۆ ئەوەی لە شـیعر بگەم پێویستە ببم بە چەپ، یان ئەبێت ژن بم؟'

پێکەنین و لە یەک کاتدا پێکەوە گوتیان: 'هەردووکیان!'

'کە واتە من ئەمڕۆ شـتێکی تازە فێر بووم، لە بەر تێگەیشـتن لە شیعر و هونەر، من لەمڕۆ بە دواوە ئەبمە چەپ.'

پاشـــان لە ژنەکەم ڕوانی: 'بەڵام، بمبوورە خانم، بە داخەوەم ئەم نۆبەتی ژیانەم بەختی ئەوەم بەر نەکەوت، کە ژن بم!'

کاتێک ئەمەم پێ گوتن، ژنەکە پێی گوتم: 'تەنیا بۆ خۆشی ئاوام پێ گوتی، زۆر ببوورە.'

'ئەوە یەکەم جارم نییە ئەو قســەیە ئەبیســتم، ژنێک پێشــتر ئەو قسەیەی تۆی پێ گوتووم.'

'چاوت لێیە! کە واتە من بە هەڵەدا نەچووم و ئەو ژنەی ئەوەی پێ گوتی، لەگەڵت زۆر ڕاستگۆ بووە.'

ژنەکە وای گوت، کـە پێ دەچوو لە تەمەنی خۆمـدا بووبێـت و قژزەردێکی قەڵەوی چاوســەوز بوو. گوتی؛ ناوی ئانایە. بە درێژاییی ئەو ڕۆژە پاڵی بە عەرەبانەکەمەوە دەنا. لە ژێر لێوەوە گوتم: 'بەهار لەگەڵم ڕاستگۆ بوو!'

شاعیرە گەنجەکە، پێ دەچوو تەمەنی بیست ساڵ بووبێت، دووبارە لە کۆڵەپشـــتییەکەیدا کتێبێکی تری دەرهێنا و بەرەو ڕووم ڕایگرت: 'لێرەوە دەست پێ بکە.'

گرتم بە دەســـتمەوە و ناونیشـــانەکەیم خوێندەوە: 'بەڵێ، هونەر، شوناسی چەپگەرایە.'

هەروەها پێی گوتم: 'ئەو کتێبە لە وەڵامی قســـەیەکی لیبراڵەکاندا نووسراوە، کە گوتوویانە هونەر هیوایەتی چەپەکانە لە کاتی بێکاریدا.'

کاتێک گەیشـــتمەوە ماڵەوە شـــیعرەکانی کۆلن براندنم خوێندەوە، ناونیشانی کتێبەکەی 'بەخشندەیت؟!' بوو.

دوای خوێندنەوەی کتێبەکە و قســـەی ئەو ژنە... کە بەهاری غالب عەربەتیی بیر خســـتمەوە، ئەو شـــەوە تاوەکوو بەیانی خەوم لێ

نەکەوت، نەمدەزانی کاریگەریی شـیعرەکان بوو، یان قسـەی ژنەکە. دەتوانم بڵێم یەکەم جارم بوو شیعری شاعیرێک بخوێنمەوە، کە نەک تەنیا لە ڕێگەی کاریگەریی بیستن و بینینەوە، بەڵکوو سوودی لە هەر پێنج هەسـتەکەی بینیبوو، بگرە لەوە زیاتریش، کە بیرم دەکردەوە چەند جارێک لە بەر خۆمەوە گوتم؛ هیچ شتێک بە ڕێکەوت نییە.

هەندێک سـات هەن وەک خەونێک دێنەوە پێش چاوم، بەڵام خەونێکی خۆش و سـەرنجڕاکێش، کە تـا ئەمڕۆش بیریـان لێ دەکەمەوە، بەڵام گەلێک لەو یادەوەرییانە پێویسـتیان بە هۆکارێکە تـاوەکوو لە ڕێگەیـانەوە بورووژێم و بە خەیـاڵ بگەڕێمەوە بۆ ئەو ساتە.

کاتێک من لە تەمەنی کۆلن براندنی شاعیری تەمەنبیستساڵدا بووم، بەرکەوتەی شـیعری چەند شـاعیرێکی ئەو سـەردەمە کاریگەریی سەیریان لەسەر خەیاڵم هەبوو. دەتوانم بڵێم ڕایانچڵەکاندم.

کـاتی خوێنـدنەوەی ئەو شـیعرانە بـە خـەیـاڵ گەڕامەوە بۆ ئەم یادەوەرییەم:

لە سـەربازگە یان باشـترە بڵێم سـجنی شـوعەیبە لە بەسـرە، کە هەندێک جاریش شوعەیبەی هەشتیان پێ دەگوت، لەگەڵ قادری برام و سـەدان گەنجی تری سـلێمانی و شـار و شـارۆچکەکانی تری کوردستان دەستبەسەر بووین.

کۆتاییی سـاڵی ١٩٥٤ بوو، دوای لەدەسـتدانی ماڵ، دەتوانم بڵێم هەرچییەکمان هەبوو، بەو هەژارییەی، باوکم دوای بەربوونی، هەموو مانگێک خۆی دەگەیاندە لامان و خواردن و حەلوا و گەزۆ، گوێز و کشمیشی بۆ دەهێناین و بڕێک پارەی پێ دەداین.

بێجگە لەو جارەی کە لە مزگەوتێک جزدانەکەیان لێ دزیبوو، ئێمە گەڕاین و لای کابرایەکی دووکاندار قەرزمان بۆ کرد و بە دڵشکاوی بۆ سلێمانی گەڕایەوە.

یەکێک لەو جارانە، دینارێکی بە من و قادری برام دابوو، منیش داوای بەشەکەی خۆم لە قادر کرد، ئەویش گوتی: 'من ماڵت لەگەڵدا بەش ناکەم و حەز دەکەیت با دینارەکە بۆ تۆ بێت.'

منیش ئەو ڕۆژە لە بەسرە و کتێبخانەی موتەنەبی سێ کتێبی شیعرم کڕی، وا بزانم یەکی بە عانەیەک بوو، کە هەمووی دەیکردە دوازدە فلس.

کتێبەکان:

بەدر شاکر سەیاب: کەناری گۆڕ.

نازک مەلائیکە: پریشک و خۆڵەمێش.

عەبدولوەهاب بەیاتی: شەیتان و مەلائیکە.

ئەوسا بەم سێ شاعیرەیان دەگوت: ڕێبەرانی شیعری نوێی عێراق.

کاتێک لە کتێبخانەکە هاتمە دەرەوە و قادری برام کتێبەکانی بە دەستمەوە بینی، هیچی نەگوت، تەنیا ئەوەندە نەبێت دەستی بەرەوڕووم پان کردەوە، منیش لە مەبەستی گەیشتم و باقی دینارەکەی باوکم پێی دابووین، کردمە دەستییەوە. پاشان کتێبەکانی لێ وەرگرتم و دوای ئەوەی لێی ڕوانین، دەستی کردە ملم و پێی گوتم: 'جەلال گیان، نازانین چەند لەم کاولەیە ئەمێنینەوە، ئەی ئەگەر باوکم چەند مانگێک نەیتوانی سەردانمان بکات؟ خۆ ئەم سەگبابانەش تێر بە سکی خۆمان خواردنمان نادەنێ.'

کتێبەکانم لێ وەرگرتەوە و سەرم بۆ ڕاوەشاند.

لەو ئێوارەیەوە دەسـتم کرد بە خوێندنەوەیان، دوای ئەوەی هەرسێکیانم خوێندەوە، وەک بڵێیت پەتایەکی گرانم گرتبێت، خەوم لێ زڕا و نانم بۆ نەدەخورا. بێجگە لەوە خۆم لە قادری برام و هەموو هاوڕێکانی ترم دەشاردەوە، حەزم نەدەکرد کەس ببینم، هەندێک جار بە تەنیا لە بەیانییەوە تا ئێوارە دەگەڕام، یان لە جێگەیەکی نادیاردا خۆم دەشاردەوە و چەندان سەعات بێدەنگ دادەنیشتم.

قادری برام بەردەوام چاوی لەسەرم بوو، زۆربەی کات دەیویست لەگەڵی بم، بەڵام نەمدەزانی ئەو شـەڕوجەنجاڵییەی خەیاڵمیان داگیر کردبوو، چی بوون.

لە تەمەنی شەشساڵیمەوە، دەتوانم بڵێم دەمتوانی بخوێنمەوە. لەو تەمەنەمدا لە شیعرەکان نەدەگەیشتم و هەندێک جار پرسیارم لە مامە مستەفام یان کاکە غەفوورم دەکرد، پاشان لەو شاعیرانەی دەهاتنە ماڵی ئێمە. لە ڕاسـتیدا بەختێکی باشـم هەبوو، چونکە دەتوانم بڵێم سـەردەمی منداڵیم، زۆربەی شـاعیرە ناودارەکانم ناسی. ئیتر نازانم کام شاعیر نانی ماڵی میرزا کەریمی نەخواردووە. منیش قسەم لەگەڵ هەموویاندا کردووە و پرسـیارم لێ کردوون، کە بە عەقڵی ئەوسـام هاوڕێم بوون.

خوێندنەوەی ئەو سێ کتێبە، کاریگەرییان لەسـەر خەیاڵم کردبوو. لەم تەمەنەمدا دەتوانم ئەوە بڵێم؛ کە پەیوەندی بە تەمەنم و گوزەرانی ئەو ڕۆژانەوە هەبوو، یان من ئەوسـا پەروەردەی خەیاڵ و شـیعری کلاسیکی کوردی و خەیاڵەکەی بووم. پاشان کاریگەریی شیعری ئەو سێ شاعیرە عەرەبە کە بە ڕێبەری شیعری نوێی عێراق ناسرابوون. هەرچەندە پێش ئەو ڕۆژانە لە نزیکەوە عەبدوڵڵا گۆرانم دەناسـی و تەنانەت هەندێک جاریش دەفتەری ڕەشنووسی شیعرەکانی لە ماڵی

ئێمە دادەنا و بە دزییەوە دەمخوێندەوە و هەندێک جاریش لە بەری دەمنووسییەوە. هەروەها ئەحمەد هەردی و حەمەساڵح دیلان بەردەوام لێیان دەپرسیم ئاخۆ شیعرم نووسیوە؟

کاتی خوێندنەوەی شیعری ئەو شاعیرە عەرەبە نوێخوازانە، ئاوا لەسەر بەرگی هەرسێ کتێبەکە نووسرابوو، هەموو شیعرێکی پێش ئەو ڕۆژانەی، کە بەرچاووگوێم کەوتبوو بیر خستمەوە، وەکوو یەکێک لە جەنگێکی دەروونیی سەختدا بێت لەگەڵ ڕابردوویدا. ئەوەم لە گۆران بیستبوو؛ کە شیعر دەبێت لە عەرووز و تەسەوف و هەروەها تێرکردنی هەستێکمان زیاتر بێت!

داوام لە قادری برام کرد، کە سێ دەفتەرم پێویستە، لە وەڵامدا گوتی؛ یەک دانەت بەسە. تاوەکوو ڕازیم کرد هەموو کەسوکارمانی هێنایەوە بیرم و پێکەوە لەو غەریبییە دەستمان کرد بە گریان.

ڕۆژی دواتر هات و سێ دەفتەری سەد پەڕەیی خستە باوەشمەوە، لێی ڕوانیم و گوتی: 'ئەگەر لێیان نەنووسیت، بەشی سەد ساڵت ئەکات.' بە قسەکەی پێکەنیم.

لە دیوانە شیعرییەکەی نازک مەلائیکەوە دەستم پێ کرد، کە هەر لە سەرەتاوە، جێگۆڕکێم بە وشەکان دەکرد. گەیشتمە ئەوەی شێواز و فۆرمەکەیم وەردەگرت و بە کوردی و تێکەڵەی خەیاڵی خۆم دەمنووسییەوە. لەو ڕۆژانەدا شیعری نێو ئەو دەفتەرەم بۆ قادری برام و سمکۆ ئەحمەد خوێندنەوە، پاشان شیعرە عەرەبییەکە، پێم گوتن کە من تەنیا شێوازیم وەرگرتووە، بە بیرم دێت گوتیان: 'ئێ،

ئەمە چییە و مەبەستت لەو کارە چییە.' منیش هیچ وەلامێکم بۆ ئەو قسەیەی ئەوان پێ نەبوو.

لە ماوەی دوو بۆ سێ مانگدا ئەو سێ دیوانە شیعرییەم دوو بۆ سێ جار نووسینەوە، وەک بڵێیت منداڵێک بم و لە دار و بەرد و لەتە خشت ماڵۆچکەیان لێ دروست بکەم. بێجگە لە غەریبیی کەسوکارم و شاری سلێمانی... تەواو نەهامەتی و زوڵم و زۆری ناو کەمپەکەیان لە بیر بردبوومەوە.

سێ ساڵ دوای ئەو ڕۆژانەی سەدان گەنج لە کەمپی زۆرەملێی شوعەیبە بووین.

لە بەغدا و ساڵی ١٩٥٨ بوو، شۆڕشی چواردەی تەممووز ڕووی دابوو، ڕژێمی پادشایەتی کۆتایی پێ هات، باشترە بڵێم لەناو بران. ڕق و تۆڵەسەندنەوەی ئەو ڕۆژانە بێزاریان کردبووم، دادگای مەهداوی دامەزرابوو، سەرکردایەتی حیزبی شیوعی لەو دادگایەدا بڕیاردەری سەرەکی بوون، بێجگە لە تۆڵەسەندنەوە لێبووردنیان بەرامبەر بو هیچ نەیارێکیان نەنواند، شەقامی شار و شارۆچکەکان بۆنی خوێنی لێ دەهات. زۆرینە، بە کورد و عەرەب، نەتەوەیی و چەپەکانەوە ئاهەنگمان دەگێڕا، ئەوەی جێگەی سەرنجم بوو، زۆربەی شاعیر و نووسەرەکان شەو و ڕۆژ مەست بووین، یان باشترە بڵێم خۆمان مەست دەکرد، وەکوو ڕۆژانی دوای ڕوودانی کارەساتی لافاوەکەی سلێمانی، لە مەراقدا... هەموو شەوێک بە مەستی دەنووستین. ساڵی ١٩٥٨ سێبەری بێزاری و دوودڵییەک باڵی کێشابوو بەسەر ڕۆحی هەمووماندا، لەو ڕۆژانەدا من شیعرێکم بە

ناونیشـانی؛ ڕوانینەکانی چاوی شـەقام نووسـی، کە ئەمە دەسـتپێکی شیعرەکەم بوو:

"چاوی شەقام
هۆن هۆن نیگای ئاگری باڵی کاروانمان
مەرگی بەهاری ئاسۆ دائەبارێنێ.
هۆنراوەی زام
تاڵ تاڵ چڵی خوێنی وشەی سەربڕاومان
لە ڕێژنە و تاوی هەناسەی ژاڵە و بیدا دائەچێنێ.
لێوی پەیام
گەڵا گەڵا تریفەی بزەی هاوارمان
بەناو ناخی ڕێگای قورپێوان و شیندا ئەوەرێنێ."

بۆ هاوڕێکانم خوێندەوە، هەندێکیان پێیان گوتم؛ کە من لەم شـۆڕشـە بە گومـانم. بیرم دێت، کاتێک بە عەرەبی هەمان شـــیعرم بۆ نازک مەلائیکە خوێندەوە، ماچی کردم. بەڵام لەســـەر ئەم شـــیعرەم، لە قوتابییان و ڕیزەکانی حیزبی شیوعی دەرکرام، دواتر و سـاڵی ١٩٦١ بە گرتیان دام و دوو سـاڵ لە ژوورێکی تاکە کەسـیدا دەسـت بەسـەر بووم.

ئەگەر بگەڕێمەوە ســـەر باســـەکەم، کە چۆن ڕێکەوتی ئەو ســـێ شـــاعیرەم کرد و لە نزیکەوە بەریان کەوتم و قســـەم لەگەڵدا کردن. لەگەڵ هەرســـێکیـانـدا بـاســـی ئەو ڕۆژانەم بۆ گێڕانەوە و ئەو یادەوەرییەی خۆمم لەگەڵدا بەش کردن. هەرسێکیان سـەرسـام بوون،

زیاتر بەوەی من شـــیعرەکانی ئەوانم لە خۆیان باشـــتر لە بەر بوو، هەروەها سەرنج و خوێندنەوەم بۆیان هەبوو.

بە تایبەتی نازک مەلائیکە، لە هۆڵی زانکۆی موستەنسـەرییە کۆڕی شیعرخوێندنەوەی هەبوو، بۆ سـەردان لە ئەمریکاوە گەڕابووەوە، کە بۆ خوێندنی ئەدەبیاتی بەراوردکاری چووبوو. نازک تەمەنی ۳۷ ساڵ بوو، پێشتر لە بەغدا پەیمانگەی مامۆستایانی باڵا و پاشان ئەکادیمیای هونەری مۆســیقای خوێندبوو. دوای کۆڕەکەی، خۆمم پێ ناســاند و داوای ئەوەم لێی کرد، کە گفتوگۆیــەکی بۆ ڕۆژنـامەیەکی کوردی *ڕۆژی نوێ* لەگەڵدا بکەم، لە وەڵامدا پێی گوتم: 'پێویســـتە، کەی و چۆن؟'

دوو ڕۆژ دواتر لە ئەبوو نەواس پێکەوە نانمان خوارد، دواتر پێکەوە بەرەو شەقامی سەعدوون چووین. کاتێک بەڕێوە بووین قۆڵی کرد بە قۆڵمـدا و گوتی: 'وەک دیمەنێکی نێو شـــیعرەکـانمـان، ئیتر تەنیـا شاعیرانە، گریمان من و تۆ ئەمڕۆ دڵخوازی یەکین.'

تـاوەکوو ئەو کاتە، هەموو شـــتێک ئـاســـایی بوو، دوای ئەوە سـەرەداوی پرسـیارەکانم لێ تێک چوون و تەنیا خەیاڵم لای گەرمیی پێســـتی قۆڵی ئەو بوو، کە بە ڕێکەوت لەو کاتەدا هەردووکمان، دوو کراسی سپیی قۆڵکورتی خەتدارمان لە بەردا بوو. لەگەڵ ئەو شاعیرە دڵخوازەمدا تاوەکوو ساڵی ۱۹۷۰ پەیوەندیمان بەردەوام بوو.

لەگەڵ بەدر شـاکر سـەیاب، ئەو منی ناسـییەوە، کە سـاڵانی پێشـوو لە بـەغدا و لـە چـالاکیی قوتـابییـانـدا منی بینیبوو. پێی گوتم؛ کـاتێک تۆ چوویتە سەر سەکۆکە و گوێم لە قسەکانت بوو، لە دڵی خۆمدا گوتم،

حەیفە ئەو گەنجە بەهرەمەندە تەنیا شیوعی بێت. کاتێک قسەمان کرد و ئەو یادەوەرییەی خۆمم بۆ گێڕایەوە، بەراوردی کرد بە سەردەمی لاوێتیی خۆی و پێی گوتم، کە چۆن ئەویش ئەو یارییەی بە شیعرەکانی شاعیرێکی دڵخوازی خۆی کردووە، کە شاعیری میسری عەلی مەحموود تەها بووە و پاشان لە بەغدا بینیویەتی و بوونەتە هاوڕێ. ئەو دە ساڵ پێش ئەو ڕۆژە هاتبووە سلێمانی و سەردانی ماڵی ئێمەشی کردبوو، هەرچەندە ئەو بینینی منی بە منداڵی بیر نەکەوتەوە، بەڵام دیمەنی ماڵەکە و یادەوەریی لەگەڵ مالیکی ئامۆزام و ناوی کاکە غەفوورمی هێشتا باش لە بیر مابوو.

ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام، هەمان گلەییی لە حیزبی شیوعی هەبوو، چونکە ئەویش ئەندامی حیزبی شیوعی بووبوو، باسی لە شاعیر و ئازادیی شیعرنووسین کرد، ڕەخنە و قسەکانی زۆر سەرنجیان ڕاکێشام. هەر ئەوەش بوو کە بووە هەوێنی بیری بزووتنەوەی ئەدەبیی ڕوانگە.

بەدر شاکر سەیاب پێی گوتم: 'کاتێک شاعیرێک تەوقی ئایدیۆلۆژییەکی دەکرێتە مل، ئیدی دەبێت بە چاوی حیزب ببینێت، بە عەقڵی حیزب بیر بکاتەوە، کوێرانە هەموو ئەو خواروخێچییانەی دونیای ڕیاڵی پێ باش بێت، کە ئایدیۆلۆژیای حیزب پەسەندیان دەکات. من شیعری زۆر لە شاعیرانی کۆمۆنیستم خوێندووەتەوە، هەر لە نازم حیکمەت و پاپلۆ نیرۆدا و ئەراگۆنەوە بۆ سیمۆنۆف و دەیانی تر، جگە لە شیعرێکی پووچوبێمانا شتێکی تر نەبوون. تەنانەت هەندێکیان شایەنی ئەوە نەبوون پێیان بڵێیت شیعر، بەڵام وەک شیوعییەک و وەک ئەندامێکی حیزب، ناچار بووم داکۆکییان لێ بکەم و وەک گەورەشاعیرانی دونیاش باسیان بکەم.'

ئەو ڕۆژە من ڕام لەگەڵ ئەودا جیاواز بوو، بەڵام کاتێک بەجێم هێشت و ساڵانی دواتر، لە کرۆکی مەبەستی بەدر شاکر سەیاب گەیشتم. ئەوەی لە شیعرەکانی دووری خستمەوە و تاوەکوو ئەمڕۆ نەچوومەتەوە سەریان، ئەو عەقڵە عەرەبییە شۆڤێنیستییەی بوو، کە بە ئاشکرا بەرگریی لێ دەکرد.

بینین و لێدوانم لەگەڵ عەبدولوەهاب بەیاتی یەک جار بوو، کاتێک خۆمم پێ ناساند و کەوتینە قسەکردن، توانیم سەرنجی ڕابکێشم و تەنانەت بۆ ماڵەکەی خۆی بانگهێشتی کردم، ئەمە تاوەکوو ئەو کاتەی پێم گوت، کە شاعیر و ڕۆژنامەنووسم، یان باشترە بڵێم لە ئەنجامی لێدوانەکانماندا لای ئاشکرا بوو، کە من کوردم و شاعیرم و هەروەها چەپم، ئیتر لە دوای ئەمەوە تامی دەمی گۆڕا و بێ ئەوەی هەست بە خۆی بکات ڕستەکانی بۆ تەواو نەدەکرا، خۆی لە وەڵامی پرسیارەکانم دەدزییەوە. منیش، کە هەستم بەوە کرد، دیوانە شیعرییەکەیم، کە لەسەر بەرگ و زۆربەی پەڕەکانی، بە قەڵەمێکی سوور بە زمانی کوردی نووسیبووم، لەسەر مێزەکەی بەردەمی بۆ بەجێ هێشت و بێ دەنگ چوومە دەرەوە.

کاتێک عەبدولوەهاب بەیاتیم بەجێ هێشت، لە یانەی ئەڵوەن ڕێکەوتی قادری برامم کرد، عەبدولی سووران و سمکۆ فەتحوڵڵای لەگەڵدا بوو، دوای من حەمەکاکە و عەلی عەسکەرییش هاتن. کاتێک چوومە سەر مێزەکەیان، ئەوان یەکی نیو بوتڵ ئارەقیان خواردبووەوە، بێدەنگ بوون. سڵاوم کرد، بە بێزارییەوە و لە ژێر لێوەوە وەڵامیان دامەوە، ویستم باسی عەبدولوەهاب بەیاتی بکەم، ڕێگەیان پێ نەدام.

یـان بـاشـــتره بڵێم گوێیـان لێ نەگرتم. ئەو ڕۆژە ئەوان لە بەغدا کۆنفرانســی یەکێتیی قوتابییانی کوردســتانیان بەســتبوو. دیار بوو ئەنجامی کۆنفرانسەکە بە دڵی ئەوان نەبووبوو.

قادری برام گوتی: 'ئێمە بەو مەرجە بەشـــدار بووین لە پێڕەو و پرۆگرامی قوتابییاندا گۆڕانکاری بکرێت.'

ئەوە داخوازیی ئەوان بوو، دەیـانویســـت، بـاڵێکی چەپ لەنـاو ڕیزەکانی قوتابییانی پارتیدا ڕێک بخەن. یان هەر هیچ نەبێت ڕێز لە بیروبۆچوونی چەپەکـان بگیرێـت. بەڵام دیـار بوو ئەو ڕۆژە لەو خەونەیـان نـائومێد بووبوون. هەموویـان گلەییـان لە مـام جەلال و مەحموود عەلی عوســـمان دەکرد، کە ئەو ڕۆژە ســـەرپەرشـــتیی کۆنفرانسەکەیان کردبوو.

من پێم گوتن: 'تەنیـا چـاری ئێوە ئەوەیە، یـان بگەڕێنەوە نـاو ڕیزەکـانی حیزبی شـــیوعی، یـان پێکەوە حیزبێکی کۆمۆنیســـتیی کوردستانی نوێ دابمەزرێنن.' بەو قسەیەی من پێکەنین.

# ٣

تەنیا ئەو بارهەڵگرانەی دانەوێڵەیان بۆ شـــارەکانی خوارووی عێراق دەگواســتەوە، ڕێگەیان پێ دەدرا لە شـارەکانی کوردســتان دەربچن، وەکوو تر هەموو ڕێگەکان داخرابوون. خەســتەخانەکانی ســلێمانی نەخۆش و برینپێچ و دکتۆر و کارمەندەکانیان ئیزن دابوو. شـــەوان بێجگە لە ســـەرباز و پۆلیس کەس بە ســـەر جادە و کۆڵانەکانەوە نەبوو.

حەلاوەخان هەفتەیەک بوو لەتاو ئازاری گورچیلەی لە ناو جێگەدا کەوتبوو، بەردەوام بە دەم ئـازارەوە بـانگی لە غەفوور و جەلالی کوڕی دەکرد.

عەزیز خۆی دەگەیەنێتە گەراجی ســـەعیـد تەهـا کۆیی، لەگەڵ کابرایەکی عەرەبدا کە بازرگانی دانەوێڵە دەبێ، لەســـەر ئەوە ڕێک دەکەون کە چل فەردە گەنمی بەرەو بەغدا بۆ بار بکات، کە مەبەستی عەزیز زیـاتر گەیـانـدنی حەلاوەخـانی دایکی دەبێت بۆ لای دکتۆر، نەوەک کرێی لۆرییەکەی.

دوای بارکردنی دانەوێڵەکە، ئەوە لە کابرای بازرگان دەگەیەنێت، کە دایکی نەخۆشە و دەیەوێت لەگەڵ خۆیدا بۆ بەغدای بەرێت، پاشان لە ڕێگەی دەربەندیخانەوە بەڕێ دەکەون.

لـە ڕێگە، حەلاوەخـان ئـارام بوو... بێدەنگ لە شـــانی بـازرگـانە عەرەبەکەوە دانیشـتبوو. بازرگانە عەرەبەکە بە درێژاییی ئەو ڕێگەیە

باســـی جوانیی باکووری عێراقی دەکرد، عەزیز زوو زوو بەڵێی بۆ دەکرد و هەندێک جار ئەوەی دەگوت، کە ئەو کوردستانی مەبەستە.

پێش ئەوەی بگەنە دەربەندیخان، لە نزیک گوندی بیرکێ و سـیارە، ڕێگەکە لە لایەن ســەربازەوە گیرابوو، ســەدان ســەرباز بەو ناوەدا بڵاوەیان پێ کرابوو. لەســـەر جادەکە پیاوانی ئەو دوو گوندەیان کۆ کردبووەوە، ڕیزیان کردبوون و ئەفسـەرێکی دەرەجەدار بە سـەریاندا دەگەڕا، یەکـیەک کڵاو و جامانەکانی فڕێ دانە سـەر جادەکە... ئەمان لە ناو لۆرییەکەوە و لە بەرزییەوە چاویان لە ڕووداوەکان بوو، بەڵام گوێیان لێ نەبوو ئەفســـەرەکە چیی بە گوندییەکان دەگوت. کابرای بازرگان گوتی: 'ئەوە تێکدەرەکانن.'

عەزیز بێ ئەوەی لێی بڕوانێت: 'جووتیارن، جووتیار.'

'پێ ئەچێت جووتیار بن!'

کاتێک ئەمان لەم لێدوانەدا بوون، سەربازەکان پیاوە گوندییەکانیان دایە بەر دەستڕێژی گوللە. هەندێکیان بە بریندارى ویستیان ڕا بکەن، بەڵام ژمارەی ســەربازەکان ئەوەندە زۆر بوون، کەسـیان نەیانتوانی چەند مەترێک زیاتر لەو جێگەیە دوور بکەونەوە و بەســـەر یەکدا کەوتن. پاشـــان، چەند ئەفســـەرێک بە ســـەریاندا گەڕان و یەکـیەک گوللەیان دەنا بە ســـەریانەوە. حەلاوەخان لەگەڵ دەنگی بیســـتنی هەموو گوللەیەکدا نووزەیەکی لێوە دەهات، وەک بڵێیت گوللەکان بەر جەستەی ئەو کەوتبن.

پاشـان کابرای بازرگان سـەری لە جامی لای سـەکنەوە دەرهێنا و بە ســـەربازەکانی گوت: 'دەی تەواو، خێرتان بنووســـێ، ئەوەی مرد مرد، ڕێگەمان بدەن با مەحتەل نەبین.'

عەزیز توند هەردوو دەستی بە سوکانەکەوە گرتبوو، لە پەسا هەناسەی قووڵی هەڵدەکێشا و ڕانەکانی دەجووڵاند، بێدەنگ دڵۆپی فرمێسک بە سەر ڕوومەتیدا گلۆر بوونەوە و تێکەڵ بە تووکی ڕیش و سمێڵی بوون.

پاشان تاوەکوو گەیشتنە بەغدا، حەلاوەخان بەردەوام دەیناڵاند و دەگریا، عەزیز وشەیەک چییە لەدەمی نەهاتە دەر.

درەنگانێکی شەو گەیشتنە بازاڕی شۆرجە و بەردەم کۆگەیەک، کابرای بازرگان بەجێی هێشتن، بەڵکوو بۆ داگرتنی فەردە گەنمەکان لە دووی حەماڵ بگەڕێت.

عەزیز لە لۆرییەکەی دابەزیبوو، دارێکی بە دەستەوە گرتبوو، چەند هەنگاوێکیش بە دوای کابرای بازرگاندا چوو، لە خەیاڵی ئەوەدا بوو، لە دواوە پەلاماری بدات. لە دواوە بەردەوام گوێی لە دەنگی دایکی بوو، حەلاوەخان چاوی لە عەزیز بوو، وەک بزانێت کوڕەکەی بە نیازی چییە... بە دەم گریانەوە، بە دەنگێکی تێکشکاوەوە بانگی لێ دەکرد. پاشان لە جێگەی خۆی هەڵوێستەی کرد و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا. گەڕایەوە و لە سندووقی کەرەستەی لۆرییەکەیدا جلیکانێکی نایلۆنی بیست لیتری دەرهێنا، کە پڕ بوو لە گاز، خۆی بە لۆرییەکەیدا هەڵزنی و گازی نێو جلیکانەکەی بە سەر فەردە گەنمەکاندا پرژاند.

دوای سێ سەعات، دوو کوڕی گەنجی کوردی فەیلی بۆ داگرتنی گەنمەکە هاتبوون، کلیلی کۆگەکەیان پێ بوو، کابرای بازرگان، کە عەزیز تاوەکوو ئەو کاتە ناوەکەشی نەدەزانی و بگرە هەر پرسیاری

ناوی لێ نەکردبوو، کریکەی بەواندا بۆ عەزیز ناردبوو، گوتیان براین و خۆیان بە ناوەکانی حەسەن و حوسێن ناساند، ئەویش بە تووڕەیییەوە گوتی: 'ئەی عەلیی باوکتانتان بۆ لەگەڵ نییە؟!'

یەکێک لە کوڕەکان گوتی: 'قوربان، حاجی عەلیی حەماڵی باوکمان پار ئەمری خودای بەجێ هێنا. دیارە بەڕێزت دەماننناسیت؟'

'بەڵێ، بەڵێ، ئینجا کەس هەیە لەم شاری بەغدایە ناوی عەلیی باوک و حەسەن و حوسێنی کوڕیی نەبیستبێت!'

حەسەن و حوسێنی حەماڵ لە داگرتندا زووزوو ئەوەیان دەگوت، کە گەنمەکە بۆنی گازی لۆرییەکەی گرتووە، عەزیز پێی گوتن: 'ئەرێ کاکە دایبگرن و نەجاتمان بدەن، ئەوە بۆنی سن و کوللەیە، ئەمساڵ هەموو دانەوێڵەی ئەو کوردستانە سن و کوللەی بیابان تێیان داوە، بەڵایەکە و ڕووی کردووەتە ئەو کوردستانە و مەگەر بەس خودا بۆ خۆی لەدەستیان نەجاتمان بدات!'

دوای داگرتنی گەنمەکە، لێیخوڕی و لۆرییەکەی لە گەراجێک ڕاگرت، دایکی گەیاندە هۆتێلێک لەو نزیکانە، کە لە شەقامی سەعدوون بوو. لە گەراجەکەوە تاوەکوو هۆتێل عیماد، دایکی گرتبوو بە کۆڵەوە، پاشان لە قاتی چوار و ژووری ژمارە بیست جێیان گرت. زیاتر لە هەشت مانگ بوو غەفوور و جەلال دەستگیر کرابوون. لە گەیشتنیاندا حەلاوەخان بە دەم ئازارەوە گوتی: 'عەزیز گیان، سبەینێ زوو ئەچین بۆ مواجەی ئەو کوڕانە.'

'بەیانیی زوو ئەتگەیەنمە لای دکتۆرێکی باش!'

'ڕۆڵە گیان، دەردی من تەنیا خەمی ئەو کوڕانەمە.'

'تۆ تۆزێک ئیسراحەت بکە، بۆ سبەینێ خودا گەورەیە!'

'ئەی عەزیز گیان من ئێستا قوڕی کوێ بکەم بە سەری خۆمدا، باوەڕ ناکەم غەفوور و جەلال ببینمەوە.'

'نا، نا، دایکە ئەوەندە بێهیوا مەبە.'

'ئێ ئەوەتا ڕۆڵە گیان، هەرکەسێک دێت، ئەڵێت: لەم ڕۆژەدا هەرچی کەسێک بگرن ئیتر چاوی بە ڕووناکی ناکەوێتەوە.'

'ئەی بێقەزا بیت، تۆ لەتاو ئازار هەفتەیەک زیاترە خەو نەچووەتە چاوت، ڕاست ناکەن و قابیلە کاکە غەفوور و جەلال چییان لەسەرە تا بەریان نەیەن!'

'باشە عەزیز، کە هیچیان لەسەر نییە، بۆچی تەنانەت ناهێڵن بیانبینین؟'

'تۆ قومێک ئاو بخۆرەوە و چاو لێک بنێ، بەڵکوو تۆزێک ئیسراحەت بکەیت.'

ڕۆژانی دواتر حەلاوەخان ڕازی نەبوو بۆ لای دکتۆر یان نەخۆشخانە بچێت، بە عەزیزی گوتبوو: 'تا ئەو کوڕانەم نەبینم، بشمرم لەگەڵت بۆ لای دکتۆر نایەم.'

پێکەوە سێ جار بۆ بەندیخانە چووبوون، جارێک بۆ شاری حلە و لە بەغدادیش سەردانی دوو بەندیخانەیان کردبوو. تەنیا ئەوەندەیان پێ گوتبوون: 'لێرە نین.'

دواسەردانیان بۆ بەندیخانەی ڕەسافە لە بەغدا، پێیان دەڵێن: 'سەردانی ئەو دووانە قەدەخەیە.'

حەلاوەخان ڕەنگی زەرد هەڵگەڕابوو، چاوەکانی خوێنیان تێ زابوو، هەرچییەکی دەخوارد خێرا هەڵیدەهێنایەوە، بەو جۆرەش دانی بە خۆیدا دەگرت، تاوەکوو لە بینینی کوڕەکانیدا بێهیوا نەبێت.

به عەزیزی گوتبوو: 'دڵم پێم ئەڵێت، ئیتر من ئەو کوڕانە نابینمەوە.'

'ئەو کوڕانە چەندان جاری تر گیراون و بەریش بوون. تۆ باش لە پۆلیســـەکان حاڵی نەبوویت، گوتیان زرووفی وڵات ئاڵۆزە و دواتر وەرنەوە.'

عەزیز ئەوە بە حەلاوەخـانی دایکی نـاڵێـت، کە پۆلیســـەکـانی بەندیخـانەی ڕەســـافە پێیان دەڵێن، ســـەردانی غەفوور و جەلال قەدەخەیە.

لە بەغدا بە دەگمەن هەواڵی کوردســـتان و بە تایبەتی ســـلێمانیت دەبیســـت، بێجگە لە ڕێگە... هێڵەکانی تەلەفۆنیش داخرابوون، ئەوانەی هەواڵەکانیان بە نیوەناچڵ دەگەیاند، بەرژەوەندیخواز و بازرگانەکان بوون. تەنیـا ئەوان دەیـانتوانی لە ڕۆژێکی ئـاوادا هـاتوچۆ بکەن. هەواڵەکان تەنیا باسـی گرتن و کوشـتن بوون، کە عەزیز ئەوەشـی لە دایکی دەشاردەوە و پێی نەدەگوت.

ســـێ مـانگ بوو لە بەغدا بوون، عەزیز دایکی بۆ لای چوار دکتۆر بردبوو، دەوای جیـاوازیـان بۆ نووســـیبوو، بەڵام تەنـدروســـتیی حەلاوەخان ڕۆژ بە ڕۆژ خراپتر دەبوو.

یەکەم هەینیی مانگی پێنجی ســـاڵی ١٩٦٣ بوو، دوای ئەوەی حەلاوە خان لە بینینی کوڕەکانی بێهیوا بوو، دەمەوئێوارەی ئەو ڕۆژە کاتێک عەزیز بۆ پێداویســـتیی و نانکڕین گەڕایەوە بۆ هۆتێل عیماد، خاوەنی هۆتێلەکە پێی گوت: 'ئەوە بۆ زیـاتر لە ســـەعاتێک دەچێت، دایکت دەگری و بانگت دەکات، لەسەر ئەو جادەیەوە گوێت لە دەنگیەتی.'

کاتێک عەزیز چووە ژوورەوە حەلاوە خان لەسەر زەوییەکە و لە تەنیشتی جێگەکەیەوە لەسەر پشت کەوتبوو، ئەوەندە زۆری لە خۆی کردبوو، خوێنی لووتی بەر بووبوو، دەموچاو و قژی خوێناوی بوون. عەزیز هەڵیگرت و خستیەوە سەر جێگەکەی خۆی. هەناسەی لێ بڕابوو، تەنیا چاوەکانی نەبێت زەق دەیانڕوانی، خاولییەکی تەڕ کرد و خوێنەکەی دەست و دەموچاوی سڕی. حەلاوەخان بێدەنگ لێی دەڕوانی، عەزیز کە دایکی بەو زەلیلییە بینی، نەیتوانی هیچ بڵێت.

زیاتر لە سەعاتێک بێدەنگ بەو جۆرە لە یەکیان ڕوانی، پاشان حەلاوە خان بێدەنگ چەند جارێک لێوی جووڵاند، وەک بیەوێت بانگی یەکێک بکات، یان پرسیاری کەسێک لە عەزیز بکات. عەزیز سەری لێ نزیک کردەوە و لێی پرسیی: 'ئەڵێیت چی و چیت بۆ بکەم؟'

دەستی بە سینگییەوە گرت و هاواری کرد، عەزیز دەستێکی لەسەر دەمی دانا و پێی گوت: 'هێواش، هێواش، ئەوەندە زۆر لە خۆت مەکە.'

حەلاوەخان گازی لە پەنجەی عەزیز گرت و خوێن بە چەناگەیدا هاتە خوار. نەک پێست و گۆشت، بەڵکوو ئێسقانی پەنجەشی شکاندبوو. عەزیز ئازاری زۆر بوو، بەڵام خۆی تێک نەدا و تەنیا بێدەنگ لە چاوی دایکی ڕوانی، دەستی لەسەر دەمی لا برد و خاولییە تەڕ و خوێناوییەکەی لە دەستییەوە پێچا.

'کوان، ئەو کوڕانەم کوان؟!'

ئەوە دواوشەی حەلاوەخان بوو، دوای ئەمە هەناسەی لێ بڕا و چاوی داخست.

عەزیز وای دەزانی لەتاو ئازار لەهۆش خۆی چووە. پەرداخێک ئاوی هێنا و دەموچاو و لێوی پێ تەڕ کرد. پاشان ڕاستی کردەوە و

نووســـاندی به ســـینگی خۆیەوە، بێدەنگ فرمێســـکی ڕشـــت، پاڵی خستەوە و شان و ملی بۆ شێلا. دوای ئەوەی سەری لەسەر سینگی دایکی دانا و گوێی لە ترپەی دڵی نەبوو، هەســـتا و خێرا لە ژوورەکە چووە دەرەوە.

پێش ئەوەی بگاتە قاتی خوارەوە، لەسەر قادرمەکان هەڵوێستەیەکی کرد و بە قۆڵی کراســـەکەی، فرمێســـکەکانی ســـڕی. چووە بەردەمی عیماد فەیلیی خاوەنی هۆتێلەکە، کە لەو کاتەدا لەوێ بوو. پێی گوت: 'دایکم مرد.'

کابرایەکی بە تەمەنی ڕیشسپیی کورتەباڵا لە شانی عیمادەوە بوو، کە بە باوکی عیماد خۆی بە عەزیز ناساند و پرسیی: 'دایکت، لە کوێ مردووە؟'

'بابە، لە ژووری ژمارە بیست!'

عیماد وای گوت. بێ ئەوەی لە کابرای پیر بڕوانێت. پاشـان کابرای پیر بۆ لای عەزیز هـات و ویســـتی دەســـتی بگرێت، کاتێک بینی خاولییەکی خوێناویی پێچاوە بە دەســـتییەوە، پرســـیی: 'ئەی ئەوە چییە؟'

''دایکم لەتاو ئازار گازی لە پەنجەم گرت.'

'دەی ئێمە دەتوانین چیت بۆ بکەین؟'

کاتێک عیماد ئەمەی گوت بۆ لای عەزیز بەڕێوە بوو.

'هەرچۆنێک بووە مەیتەکەی بگەیەنمەوە سلێمانی.'

'ڕێگە گیراوە، کەس ناتوانێت لەوێوە بێت، ئەوەی بیەوێت بچێت دەیگرن، برا هەموو ڕێگەکان داخراون!'

'تۆ بڵێیت ئەوەندە بێویژدان بن ڕێگە لە مردوو بگرن.' باوکی ئاوا وەڵامی عیمادی دایەوە.

عیماد بۆ هێنانی دارەمەیتێک لە هۆتێلەکە چووە دەر، عەزیز لەگەڵ باوکی عیماد سەرچەفێکیان لە حەلاوەخانەوە پێچا. پێش ئەوە باوکی عیماد دوو سابوونی ڕەقیی نابوونە نێو سەرچەفەکە، شووشەیەک عەتری قۆلۆنیای پیاوانی بە جلەکانیدا پرژاند. دوو کوڕی گەنجی شاگردی هۆتێلەکە هاتبوون و لەناو دەرگەی ژوورەکەدا ڕاوەستابوون.

کاتێک عەزیز تەرمی دایکی بە باوەش بردە خوارەوە، عیماد دارەمەیتێکی هێنابوو، باوکی پێی گوت: 'بە خودا ڕۆڵە تۆ کوڕی ڕۆژی تەنگانەیت، ئەوە لە کوێ ئاوا زوو ئەو دارەمەیتەت پەیدا کرد؟!'

'بێ پرس، کەسی لێ نەبوو مەگەر دوایی بچمەوە و ئاگاداریان بکەمەوە.'

کاتێک حەلاوەخانیان خستە نێو دارەمەیتەکە، نیوەی پڕ نەکردبووەوە. باوکی عیماد لە هۆتێلەکە مایەوە و ئەوانیش تاوەکوو ئەو گەراجەی لۆرییەکەی عەزیزی لێ ڕاوەستابوو، یارمەتییان دا.

ئەو ڕۆژە عەزیز بێ وەستان و بە خێرایی نێوان نەوەد بۆ سەد کیلۆمەتر لە سەعاتێکدا لێی دەخوڕی، وەک بڵێیت هێشتا دایکی نەخۆشە و بیەوێت لە کاتی خۆیدا بیگەیەنێتەوە سلێمانی. تاوەکوو شاری جەلەولا هیچ ڕێگرییەک نەبوو، بەڵام کاتێک لە سنووری ئەوێ دەرچوو، لە بازگەیەک ڕایانگرت و بێ ئەوەی ڕێگەی پێ بدەن قسە بکات، دەست و چاویان بەست و بردیان لە کەناری ڕێگەکە لەگەڵ سێ کەسی تردا ڕایانگرت. زیاتر لە سێ سەعات لەوێ بێدەنگ ڕاوەستابوون، تەنیا گوێت لە عەزیز بوو کە لووشکە لووشک دەگریا. گەنجێکی دڕداشەلەبەر لە شانیەوە بوو، بە کوردی پێی گوت: 'ئەرێ کاکە تۆ بۆ ئەوەندە دەترسیت.'

عەزیز هیچ وەڵامێکی نەدایەوە.

پاشـــان دوو ســـەرباز هاتن و یەکیەک بردنیان، کاتێک ســـەرەی عەزیز هات، چاویان کردەوە و لێیان پرسی: 'ئەوە مەیتی کێیە لە ناو لۆرییەکەتدا؟'

'مەیتی دایکمە!'

دوای ئەوەی بەســـەرهاتەکەی بۆ گێڕانەوە، پێیـان گوت، کە تۆ دەتوانیت بگەڕێیتەوە بۆ بەغدا و بەرەو باکوور ڕێگەت پێ نادەین.

عەزیز ویســـتی داوای یارمەتییان لێ بکات، بەڵام کاتێک لە نزیکی ئەوان گوێی لە دەنگی گوللە بوو، ڕای گۆڕی و بێدەنگ چوو، دوای دووبـــارە پـێـچـانەوەی تەرمەکەی دایـکـی، کە ســـەربـازەکـان سەرچەفەکەیان دڕیبوو، لە ژێر لێوەوە پێی گوت: 'حەلاو ئەو سەگانە ناهێڵن بۆ ماڵەوەت بەرمەوە!' پاشـــان بەتانییەکەی خۆیی تێوە ئاڵاند، کە بەردەوام لە پێشی لۆرییەکەیدا بوو.

ڕۆژی دواتر گەیشـــتەوە بەردەم هۆتێل عیماد، لۆرییەکەی ڕاگرت، بە درێژاییی ئەو شـــەقامە بۆنی مردوو دەهات، پاشـــان باوکی عیماد لەگەڵی چوو بۆ ئەو مزگەوتە، کە کوڕەکەی بێ پرس دارەمەیتەکەی لێ هێنابوو. مەلای مزگەوتەکە ئەوەی بە عەزیز گوت، کە ئەو مردووە سونەمەزهەبە و باشترە بۆ مزگەوتێکی تری بەرێت. عەزیز لە مەلاکە چووە پێشـەوە و بە تووڕەیییەوە پێی گوت: 'دایکی من نە سـونەیە و نە شیعە، تەنیا عەبدی خودایە و تۆش غەسبە لەسەرت چیی پێویستە، بۆی بکەیت!'

ئەو ڕۆژە دەمەو ئێوارەیەکی درەنگ، کە خۆر لە ئاوابووندا بوو، تەرمی حەلاوەخان لە گۆڕستانی شێخ مارفی کەرخی لە شاری بەغدا نێژرا، تەنیا مەلای مزگەوتی ئیمام حوسێن و عیماد و باوکی، لەگەڵ عەزیز بوون.

ڕەفیقی وێنەگر، دوای ئەوەی چایەکی بە پێوە خواردەوە، چوو لە شانی فەرەجی چایچییەوە ڕاوەستا و پرسیاری مامۆستا یاسین یان هەریەکێک لە یاریزانانی تیپی خەباتی لێ کرد، فەرەج بێ ئەوەی ئاوڕی لێ بداتەوە، بە دەم چاتێکردنەوە: 'بۆ کاکەی ئەفەندی وا ئەزانیت ئێرە مەیدانی کەرانە؟! ئەوانەی تۆ ناوت هێنان، ئیتر نایەڵم بێنە چایخانەکەم!'

ڕەفیقی وێنەگر دەستی خستە سەر شانی فەرەجی چایچیی و دوای ئەوەی توند گوشیی، ڕووی وەرگێڕا و دەنگی بە سەردا هەڵبڕی و پێی گوت: 'گەوجەگەوج، ناپیاو، ناماقووڵی نەکەیت، لەم شارەدا کوڕی وەک ئەوانە بەڕێز کوا!'

'ئێ برا بۆ خۆت تووڕە کردووە، من چووزانم... ئەو کوڕانە سەرێکیان هەیە و هەزار سەودا، هاکا پەیدا بوون!'

'چووزانم، تۆ کابرایەکی چایچیت، ئیتر خەڵک دێت و دەڕوات، ئێرە جێگەی هەموو مشتەرییەکە، بە تایبەتی ئەو کوڕە گەنجانە!'

'بۆ کاکە تۆ کارت پێیان چییە؟'

'ئەرکی تۆ ئەوەیە بە ئیحتیرام بیت، وێنەی تیپەکەیانم بۆ گرتوون، وا بزانم بۆ نیشتەجێی تیپی خەباتیان دەوێت، ئەوە بۆم هێناونەتەوە.'

'داینێ، لە لای من بەئامانەت داینێ و خەمت نەبێت!'

'نەخێر، خۆم چاوەڕێیان دەکەم، ئەگەر بۆم هەبێت لێرە بوەستم، دەمودووتم زۆر بە دڵ نەبوو، کێ دەڵێ بە دەستیان دەگات؟!'

'چۆن، دەی بێقەزا بێت، ئەوە سوعبەتم لەگەڵ کردیت!'

'دەی عەمرت نەمێنێت، بۆ خۆت و دەمودووت.'

لەو کاتەدا کۆمەڵێک گەنج خۆیان کرد بە ژووردا، فەرەجی چایچیی دەستی بۆ درێژ کردن و لە ژێر لێوەوە گوتی: 'ئەوەتان، باسی جنۆکەمان کرد!'

ڕەفیقی وێنەگر بێ ئەوەی لە فەرەج بڕوانێت، سەری ڕاوەشاند و لە بەر خۆیەوە گوتی: 'گەوجە.'

کاتێک گەیشتە بەردەم گەنجەکان، کە یەک بە یەک دەیناسین و دەستی تەوقەی بۆ درێژ کردن، پرسیاری مامۆستا یاسینی لێ کردن، پێش ئەوەی ئەوان وەڵامی بدەنەوە، زیاتر لە دە گەنجی تر هاتبوون و لەناو دەرگەی چایخانەکەدا ڕاوەستابوون، مامۆستا یاسین دەنگی هەڵبڕی و گوتی: 'کاک ڕەفیق، تۆ بڵێی وێنەکەمان تەواو بووبێت؟'

'بەڵێ، بەڵێ، دەی بۆچی هاتووم، کاکی چایچیی خەریک بوو دەرمانکاتە دەرەوە!'

ڕەفیقی وێنەگر دەستی لە ناو دەستی مامۆستا یاسین بوو، ئاوڕی دابووەوە و لە فەرەجی چایچیی ڕوانی، مامۆستا یاسین گوتی: 'کوڕە گوێی مەیەرێ، ئیتر فەرەج بێ ئەوەی پرسیشمان پێ کردبێت، چایخانەکەیمان کردووە بە شوێنی نیشتەجێبوونی تیپی خەبات!'

مامۆستا یاسین دەستی ڕەفیقی وێنەگری بەر نەدا و لەگەڵ خۆی بردی و لە تەنیشتی یەکەوە دانیشتن، کوڕە گەنجەکانیش کە ژمارەیان شانزە کەسێک دەبوو، چواردەوریان لێ دان، ڕەفیقی وێنەگر لە جانتاکەیدا دوو وێنەی دەرهێنا و دایە دەستی مامۆستا یاسین، وێنەیەک کە ئەندامانی تیپی خەبات لە بەردەم دیواری نیشتەجێکەیاندا لە گەڕەکی سەرشەقام گرتبوویان، وێنەکە پێ دەچوو

لە ڕۆژێکی ئاسـاییدا گیرابێت، چونکە جلی جۆراوجۆریان لە بەردا بوو، مامۆسـتا یاسـینی ڕاهێنەر لەسـەر کورسـییەک دانیشـبوو، یاریزانەکانیش بە ڕیز لە شـانی ڕاسـت و چەپییەوە ڕاوەسـتابوون، ڕیزێکیش لە بەردەمی دانیشتبوون.

هەموویان سـەریان بە سـەر وێنەکەدا شـۆڕ کردبووەوە، مامۆستا یاسـین پەنجەی ئاماژەی خسـتە سـەر وێنەکە و گوتی: 'کوڕینە کێ خەتی جوانە، ناوەکانمان لە پشتی وێنەکە بۆ بنووسێت.'

ڕەفیقی وێنەگر پاندانێکی پارکەری بە دەسـتەوە بوو، وەکوو بیەوێت پیشـانی هەمووانی بدات، لێی ڕوانین و گوتی: 'بێنە با پاندانە پارکەرەکەم تاقیی بکەمەوە.'

ڕەفیق کاتێک ویسـتی وێنەکە لەسـەر مێزەکە بە دەمدا دابنێت و لە پشـتەکەی ناوەکان بنووسـێت، مامۆسـتا یاسـین، لە بەر باخەڵی چاکەتەکەیدا ڕۆژنامەیەکی کۆنی ژێنی دەرهێنا و لەسـەر مێزەکەی بەردەمیان کردیەوە، لە ڕەفیقی وێنەگری ڕوانی و گوتی: 'ئێسـتا باشـترە، با وێنەکە تەڕ نەبێت، خۆ فەرەجی چایچیی قەت پەڕۆیەک بەو مێزانەدا ناهێنێت، هەر ئەزانێت پارەی چا وەربگرێت.'

فەرەجی چایچیی لە تەنیشـتی گەنجەکانەوە وەسـتابوو، خۆی کێشایە ناوەوە و بە بەروانکەکەی؛ دوای ئەوەی ڕۆژنامەکەی هەڵبڕی مێزەکەی سڕی، لە بەر خۆیەوە گوتی: 'خۆ بە ناشکوریی خوا نەبێت دایکی هیچتانم نە... نەدیوە! کەچی بەقەدەر باوکێک موشـورتان دەخۆم!' هەموویان دایانە قاقای پێکەنین.

ڕەفیق پەنجەی لەسـەر هەر کەسـێک دادەنا، ناوەکەیان پێ دەگوت و ئەویش دیسان وێنەکەی هەڵدەگێڕایەوە و لە پشتەکەی دەنووسی.

ئەو ڕۆژە ڕەفیقی وێنەگر ناوەکانی ئاوا لە پشتی وێنەکە نووسی:

تیپی خەبات، ڕەفیقی وێنەگر

ڕاوەســـتاوەکان لە ڕاســـتەوە: مەحموود محەمەد مەلا ڕەحیم، ئەحمەد حاجی عەبدوڵا ڕیخۆڵە، حەمەڕەشـید حەمە سـەعید (پاشـا)، ئەنوەر عەبدوڵا شـاە محەمەد، عوسـمان ئەحمەد سـەعید (عوسـیل)، سـالّح عەبدوڵا مسـتەفا (عەبۆل)، محەمەد مەلا نەجمەدین، هادی مەلا سەلام.

دانیشـــتووەکان لە چەپەوە: ئەکرەم عارف قەرەچەتانی، عومەر حەمە ڕەش، کامیل محەمەد ئەمین سـەڕاج، سـەلاح مەحەمەد کەریم، مامۆسـتا یاسـین حەمە سـالّح (ڕاهێنەر)، بەکر حەمە ڕەش، ئیبراهیم قاسم (ڕەش)، عومەر محەمەد (چەتە)، لەتیف ئەحمەد."

ڕەفیقی وێنەگر، دوای ئەوەی ناوەکانی لە پشـتی وێنەکە نووسـی، چەند جارێک فووی لە نووسـینەکە کرد، پاشـان مامۆسـتا یاسـین هەڵیگرت و دوای ئەوەی چاوی پێدا گێڕان، گوتی: 'ئەم دوو وێنەیە تایبەتە بە نیشتەجێکەمان، ئەگەر کاک ڕەفیقیش عەزێتمان بۆ بکێشێت و نووسخەی ترمان بۆ لەبەر بگرێتەوە.'

لەو کاتەدا فایەقی سەعۆل و کەمال سەلیم هاتبوونە ناو چایخانەکە و تاوەکوو سـلاویان نەکرد، تەنانەت فەرەجی چایچیش ئاگاداریان نەبوو، فایەقی سـەعۆل دەسـتی خسـتە سـەر شـانی برایمی قاسـمە ڕەشـی پۆلیس و گوتی: 'ئەوە چییە کوڕینە ئەڵێیت پوورەهەنگن و دەورەتان لە شاکەتان داوە، خەریکی چین؟!'

کاتێک جێگەیان بۆ کردنەوە، کەمال سـەلیم لە مامۆسـتا یاسـینی ڕوانی و گوتی: 'ئەری یاسـین من و کاک فایەق قەیرێک لە ئەسحابەسپی چاوەڕێت بووین!'

کاتێک مامۆستا یاسین وێنەکەی دایە دەستی فایەقی سەعۆل، دیسان بە پێوە هەموو دەورەیان لێ دایەوە و یەک یەک ناوەکانیان هێنایەوە، پاشان فایەقی سەعۆل گوتی: 'دەی یاسینە فەنی مەگەر نەمانگوت، قەولمان داوە و دەبێت سەعات دە بچین بۆ گەرەکی قەزازەکان و لە ماڵی میرزا کەریم بین، ئەی کوا تالیبی سەید عەلی؟'

'دێت، جارێ کاتمان ماوە.'

مامۆستا یاسین کاتێک ئەمەی گوت، لە سەعاتەکەی دەستی ڕوانی: 'کاک حەمەی مام مستەفای ناڵبەند دێت بە دواماندا، خۆ ئێمە ماڵەکەیان نازانین.'

'ئەرێ یاسین پێم ناڵێیت مەبەستی ئەم چوونەی ئێمە بۆ ماڵی میرزا کەریم چییە؟'

'کاک فایەق، حەلاوەخانی خێزانی میرزا کەریم لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە، وا بزانم ئەو داماوە بۆ بینینی غەفوور و جەلالی کوڕی چووبوو، کە ئێستایش لە سجنن. وتیان ڕێگەیشیان پێ نەداون مەیتەکەی بێننەوە.'

'ئێ ئێ... زۆر بە داخم، دە وەرە... ئا لەم زروفەدا لە سجنی ئەو گورگانە بیت.' فایەقی سەعۆل ئەمەی گوت و هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا.

'ئەو بنەماڵەیە زۆر موزەحین و ئیتر بێقەزا بن ئەو کوڕانەیش...'

مامۆستا یاسین قسەکەی بە کەمال سەلیم بڕی و گوتی: 'ئەو کوڕانە... مرۆڤی مەبدەئی و ڕۆڵەی ئەم میللەتەن!'

'بەڵێ ئەی چۆن، یاسین ئێمە هەموومان ئەوە ئەزانین!'

فایەقی سەعۆل ئەمەی گوت، پاشان هەموو بێدەنگ بوون و پێکەوە لە وێنەکەی تیپی خەباتیان ڕوانییەوە.

فەرەجی چایچیی بە سـینییەک چاوە لە تەنیشـتیانەوە ڕاوەسـتا و گوتی: 'ئا دەی کاکە، ئەو جەریدەیە. وێنەی ئەو پاڵەوانانە لەسـەر مێزەکە لا بەن با تەڕ نەبێت. ڕۆژ هەتا ئێوارە دوو دەرزەن فەریکە پیاو بە دوای تۆپێکەوەن و شـەقی تێ هەڵدەدەن، توخوا ئێوە بە خۆتان ئەڵێن چی... یان یاریچیی.'

هەموو پێکەنین.

## ٥

دوو هەفتە بوو دەمتوانی بە ئاسانی هەڵبسم و دانیشم، چەند ڕۆژێک بە تەنیا بۆ باخەکانی جێنســـی و بارگ چووم، کە لە نزیکی ماڵەکەم بوون. ڕێکخراوی خێرخوازیی داکۆتا سەریان دام و لەگەڵیاندا چوومە دەرەوە. هەروەها کارتێکی ســـاڵانەیان بۆ هێنام، هەرچی کاتێک بمویســـتایە بە خۆڕایی دەمتوانی بۆ ئەپارتمانی ســـەنتەری کولتووری و شـــانۆیی گراند بیســـت و دوو بچم. کە بە پێی من... لە ماڵەکەمەوە پێنج خولەک بوو. بێجگە لەوان، بۆ چوار مـــانـگ دەچوو بێجگە لە دکتۆر و پەرستاری نەخۆشخانە کەسم نەبینیبوو. تەلەفۆنم بۆ قادری برام کرد، کە باشم و کەوتوومەتەوە سەر پێی خۆم.

پاشـــان پەیوەندیم بە خەلیل حەمدانەوە کرد. من و خەلیل حەمدان لە ســـاڵی ١٩٥٢وە بووبووین بە هاوڕێ، لەم ئەمریکا گەورەیەدا بە ڕێکەوت لە هەرێمی داکۆتا و شـــاری بیســـمارک یەکتریمان بینی، هەرچەندە ئەو دە ســـاڵێک لە من گەورەتر بوو. لە ڕێگەی حیزبی شـــیوعی و بە تایبەتی کاکە غەفوورمەوە ناســـیم، کە ئەویش یەکێک بوو لەوانەی چەند جارێک هاتبووە سلێمانی و لە ماڵی ئێمە مابووەوە، لە تەمەنی هاوڕێیەتیماندا لە ڕێکخراوی قوتابییانی عێراق و ڕادیۆی بەغدا پێکەوە کارمان کردبوو، هەرچەندە ئەو لەو ســـاڵانەدا چەند جارێک تووشـــی گرتن هات و لێم دابڕا، بەڵام بەردەوام ئاگاداری یەکتری بووین، ئەو زۆربەی کەســـوکاری گیران و بێســـەروشـــوێن بوون.

خەلیل هات بە شـــوێنمدا، لە ڕێگە و پێش ئەوەی بگەینە ماڵەکەی، ئەویش وەکوو من بە تەنیا دەژیا و دوای بێســەروشـوێنکردنی ژن و دوو کچەکەی لە لایەن بەعسییەکانەوە، ئیتر ژنی نەهێنابووەوە.

ســـەربازی کۆمار، ئەمە ناونیشـــانی کتێبی یادەوەرییەکانی بیرات مستەفا بوو.

ئەو کتێبە لە دووکانی مزگەوتێک لە شاری بیسـمارک بۆ فرۆشـتن دانرابوو، کاتێک خەلیل حەمدان لە دووکانەکە نان و ماسـتی تورکیی کڕی و لەگەڵ دووکاندارەکەدا بە زمانی تورکی کەوتنە قسەکردن، من کتێبی ســەربازی کۆمارم لەســـەر مێزی بەردەم دووکاندارەکە بینی، گرتم بە دەســـتمەوە و لە وێنەی ســـەر بەرگەکەم ڕوانی، چوار پیاو بوون و بە شـــانی یەکەوە ڕاوەســـتابوون و مەلوییەی ســـامەڕا لە پشـــتیانەوە دیار بوو. پێم وا بێت بینینی مەلوییەکەی ســـامەڕا بوو سەرنجی ڕاکێشام و دەستم دایە کتێبەکە.

ناونیشـــانی کتێبەکە بە زمانی تورکی بوو، کاتێک خێرا چاوم بە لاپەڕەکانیدا گێڕا، لەگەڵ نووســـینەکانیدا زۆربەی لاپەڕەکان وێنەیان لەگەڵ بوو، لە ســـەرەتای کتێبەکەدا زۆربەی دیمەنی نێو وێنەکانم ناسـینەوە، کە لە بەغدا یان شـارەکانی تری عێراق گیرابوون. لە ژێر وێنەکاندا ئاماژە بە ساڵی ١٩٦٣ کرابوو.

بە خەلیل حەمدانی هاوڕێم گوت، لێی بپرســـە بزانە ئەو کتێبە بە چەندە، لە وەڵامدا بە پێکەنینەوە لێی ڕوانیم و گوتی: 'بۆ، تۆ تورکی زۆر دەزانیت؟ بۆچیتە؟!'

خەلیل پێشـتر پێی گوتبووم، کە پێش گەیشـتنی بە ئەمریکا شـەش ساڵ لە ئیستەنبوڵ بووە.

کابرای دووکاندار پیاوێکی قەڵەوی کورتەباڵا بوو. لە سەرەتاوە وام زانی خەڵکی تایلەند یان چین بێت و سمێڵێکی شۆڕی داناوە، لەو کاتەدا بە زمانی ئینگلیزی گوتی: 'ئەوە دوێنێ کابرایەک هێنای، گوتی؛ ئەگەر فرۆشرا پارەکەی بۆ دەخیلەی مزگەوت، نرخی پێنج دۆلارە.'

ئەو لەو قسانەدا بوو، من جزدانەکەم لە گیرفانی پانتۆڵەکەم دەرهێنابوو، پێنج دۆلارم لەسەر مێزەکەی نێوانمان دانا و خەلیل حەمدان سەری لێ ڕاوەشاندم.

تاوەکوو گەیشتینە ماڵەوە، لە هەموو وێنەکانی نێو کتێبەکەم ڕوانی، کاتێک لە بەر خۆمەوە گوتم: 'خۆزگە لێی تێ ئەگەیشتم!'

خەلیل بە دەم زەلاتەدروستکردنەوە گوتی: 'ئێ خۆ منیش نازانم تورکی بخوێنمەوە، تەنیا کەمێک قسەی پێ دەکەم.'

'تا بزانم ئەو تورکانە مانگی چواری ساڵی ١٩٦٣ لە بەغدا ئیشیان چی بووە!'

'پێ دەچێت بۆ سەفەر و سەیران چووبن. ئێ سبەینێ هەینییە و نیوەڕۆکەی بچۆ ئەو پیرانە هەموویان لەوێن.'

'بە جلی سەربازییەوە سەفەر و سەیرانی چی! بێجگە لەوە ئەوە ڕێکەوتی ئەو ڕۆژانە ئەکات کە قەومییەکان دەسەڵاتیان گرتە دەست!'

'قەومییەکان کێن؟'

'ئەوە بۆ خۆتم لێ غەشیم ئەکەیت، بەعسییەکان!'

'ئێ، ئینجا ئەوە هەواڵێکی خۆشە یان ناخۆش، ئیتر هەرچی کامێکیان بێت با بە یادی ئەو ڕۆژانەوە پێکێک ویسکی بخۆینەوە.'

'نازانم چییە و چۆنە، بەڵام خەیاڵم بۆ شتێک ئەچێت و کە بیری لێ ئەکەمەوە هەست ئەکەم تامی دەمم ئەگۆڕێت!'

'بۆ ئەوەی لە بیرت بچێتەوە و تامی دەمت بگۆڕیت، پێکێک لەو ویسکییە دەرمانە.'

'پرسیارەکە ئەوەیە، ئەو ئەفسەر و سەربازە تورکانە لەو ڕۆژانەدا لە بەغدا چییان کردووە؟'

'جەلال، تۆ دەزانیت من دوای ئەو هەموو سجن و دەردیسەرییە نامەوێت هیچ لەسەر عێراق بزانم، دەردی خۆت هەموو جارێک دەڵێیت؛ من ساڵی ١٩٦٢ خودام لە سجن لێ ون بوو، منیش ئەو ڕۆژە لەسەر ئەو پردەی نێوان کەرخ و ڕەسافە خودایان لە پێش چام کوشت. ئەو کتێبە لا بەرە و ئەو شووشە ویسکییە هەڵبچڕە.'

'ئەگەر ئەوەی بیری لێ ئەکەمەوە ڕاست بێت، ئەوە نهێنییەکی سەیرە، واتە ئەو تورکانە ساڵی ١٩٦٣ بۆ پشتیوانیی بەعسییەکان لە بەغدا بوون.'

'ئەرێ تۆ هیلاک نەبوویت لەو باسوخواسانە، ئێمە کاتی خۆی لەدەست زوڵمی ئەو بەعسییانە و تەنانەت دەسەڵاتدارانی پێش و دوای ئەوانیش هەڵاتووین، کەچی تۆ بەردەوام بە خەیاڵ بۆی دەگەڕێیتەوە. گوو بە خودای تۆ... هیچ نەگۆڕاویت.'

'لە هەندێک وێنەدا بە جلی سەربازییەوە و بە تێکەڵی لەگەڵ ئەفسەر و سەربازە عێراقییەکاندان، یان باشترە بڵێم لەگەڵ حەرەسقەومییەکاندا وێنەیان گرتووە، تەنانەت هەندێک لە وێنەکانیش لە کوردستانن، ئەمەوێت لەوە بگەم...'

لەو کاتەدا هاتبوو دەستێکی خستبووە سەر شانم، قسەکەی پێ بڕیم و گوتی: 'بە خودا تۆ شێتیت، دە ئەو شووشە ویسکییە هەڵبچڕە، ئەو باسانە تێپەڕیون و پاشان...'

'پاشان چی؟ ئەوە مێژووی من و تۆ و هاورێکانمانە، منیش حەزم ئەکرد وەک تۆ...'

'وەک من بێدەماخ ببوویتایە؟ یان دڵشکاو و مردوو؟'

'نا، نا، وەک تۆ بمتوانیایە ئەو ڕابردووەم لە بیر بکردایە.'

دوای ئەمە تاوەکوو هەڵبچڕینی شـــووشـــەی ویســـکییەکە، کە مـارکەکەی بلاک جـاک بوو بێدەنـگ بووین. پـاشـــــان خەلیـل ئەو بێدەنگییەی شکاند و پرسیی: 'ڕووداوەکانی ساڵی ١٩٦٣ت مەبەستە؟'

'چی بوو، برینەکانتم کولاندەوە؟'

'خۆزگە تەنیا برینێک دەبوو، زۆر لەوە...'

ئەو قســـەکەی تەواو نەکرد و منیش هیچم نەگوت، بێدەنگ قوممان لە پەرداخی ویســـکییەکە دەدا، دیار بوو بە خەیاڵ لەگەڵ ڕەگی تاڵیی ویسکییەکەدا بۆ ڕووداوەکانی ڕابردوومان و ئەو ساڵە گەڕابووینەوە.

ئەو شـــەوەی لە ماڵی خەلیل حەمدانی هاوڕێم میوان بووم، لە دوای ئەوەی کتێبەکەمان پێکەوە سـەیر کرد، ئەو بێدەنگی دایگرت و بێجگە لە گریان هیچی ترم لێی نەبیست. بە جۆرێک لە کردنەوەی ئەو باسە و گەڕانەوە بۆ ساڵانی شەستەکان پەشیمان بووم. هەرچی شیعرێکم تا ئەو ڕۆژە بە زمانی عەرەبی نووسـیبوو، بۆم خوێندەوە، گوێی لێم نەگرت و نەمتوانی دڵی بهێنمەوە جێگەی خۆی و فرمێسکەکانی وشک بکەمەوە.

خەلیل بە دەم گریانەوە کراسـەکەی داکەند و پانتۆڵەکەی هێنایە سـەر ئەژنۆی، یەکیەک شـوێنی ئەو گوللانەی پیشـان دام، کە لە تەمەنی لاوێتیـدا و بە تەواوی لە ڕاپەڕینەکەی کـانوونی یەکەمی ١٩٤٨دا لەسـەر پردی نێوان کەرخ و ڕەسـافە بریندار بووبوو. یازدە گوللەی پێوە بووبوو، تاوەکوو ئەو ڕۆژەش، نزیکی سی و پێنج ساڵی بە سـەردا تێپەڕیبوو، هێشـتا چوار گوللە لە پشـتیدا مابوونەوە و دکتۆرەکان بە نەشتەرگەری بۆیان دەرنەکرابوون.

خەلیـل بە دەم هەنسـکهەڵکێشـانەوە گوتی: 'ئەو ڕاپەڕینەی حکومەتەکەی سـاڵح جەبریی ڕووخاند. ئەو ڕۆژە؛ سـەرباز و پۆلیس دەیانویسـت ڕێگە لە خۆپیشـاندەرانی بەری کەرخ و ڕەسـافە بگرن و تێکەڵ نەبن، زیاتر لە دوو سەد کەس کوژران و سێ سەد کەسێکیش بریندار بوون. سـەربازەکان شـەستیریان لەسـەر خانووە بەرزەکانی هەردوو بەر دابەسـتبوو. لە دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەدا، دوای ئەو

هەموو کوژراوە کوڵیان نەدا و تێکەڵ بوون و بۆ بەری ڕەسافە پەڕینەوە.'

خەلیل بەردەوام لە بەر خۆیەوە دەیگوت: 'گوو بە خوات.'

منیش پێم دەگوت: 'هەی دۆڕاو!'

ڕۆژی دوایی گەڕامەوە ماڵەوە و کتێبەکەی سەربازی کۆمارم هەر بە دەستەوە بوو. شوێن و کاتی وێنەکانم دەناسییەوە و بە تایبەتی وێنەیەک زۆر سەرنجی ڕاکێشام، کە ئەویش وێنەی ماڵی حازم بەگ بوو. ئەو ماڵەی لە یەکێک لە وێنەکانی نێو کتێبەکەی سەربازی کۆماردا بوو، وێنەی کۆمەڵێک گەنج و پیاوێکی پیر لەسەر کورسییەک لە نێوانیاندا، لە گەڕەکی کەرادە مریەم. لە ڕێگەی مامۆستا یاسین حەمەساڵح و ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی لە بەغدا هەموو شتێکم لەسەر مێژووی ماڵی حازم بەگ و بە تایبەتی کوڕەکانی دەزانی.

چیرۆکی حازم بەگ و کوڕەکانی:

دیمەنی نێو وێنەکە ئەو خانووەیە، کە ساڵی ١٩٤٨ مەلیک فەیسەڵی دووەم لە ڕۆژی ئاهەنگی ساڵانەی کۆشکی پادشایەتیدا دەیکاتە دیاری حازم بەگ. عەبدولئیلاهـ ڕاوێژکار و مامی مەلیک فەیسەڵی دووەم دوای ئاهەنگەکە کلیلەکانی دەداتێ و بۆ بینینی خانووەکە دوو پاسەوانی لەگەڵدا دەنێرێت، دوای دوو سەعات دەگەڕێتەوە بۆ کۆشکی پادشایەتی و دەیەوێت ئەوەیان لێ بپرسێت، کە ئایا بە ڕاستیانە ئەو خانووە دەبێتە موڵکی ئەو.

ساڵی ١٩٦٣یەو پێنج ساڵە مەلیک فەیسەڵی دووەم لە ژیاندا نەماوە. دەسەڵات لە عێراقدا گۆڕاوە و قەومییەکان حوکمی تەواوی

عێراقیان گرتووەتە دەست، واتە لەو ساڵەدا سێ کەسایەتی و دەسەڵاتی جیاواز فەرمانڕەوایی عێراقیان کردووە. حازم بەگ خۆی ئەو توانایەی جارانی نەمابوو، ڕۆژانە بە دوو کەس لە ناو جێگەکەیدا هەڵیدەستێنن و بۆ باخەکەی یان لە بەر هەیوانەکەدا لەسەر کورسییەک دایدەنێن، حازم بەگ تەنیا دوو کوڕی هەبوو، بە ناوەکانی کەمال و سەردار، کلیلی ماڵەکەیان وەردەگرن و کاروبارەکانی باوکیان ڕادەپەڕێنن، باوکیان ڕاوێژکاری نهێنیی هەموو ئەو ڕژێمانە بووبوو؛ کە لە پەنجا ساڵی ڕابردوودا لە عێراق حوکمیان کردبوو، پێش ساڵی ١٩١٧ یەکێک بووبوو لە ئەفسەرانی عوسمانی. هەر بەو جۆرەش لای ئەو ڕژێمانەوە کوڕەکانی هەمان متمانەیان پێ درابوو. چەندان جار بە کەمال و سەرداری کوڕی گوتبوو: 'ئاشەوان دەبێت نەهێڵێت ئاو لە ئاشەکەی ببڕێت، ئیتر کێشە نییە ئەو ئاوە سەرچاوەکەی لە کوێوە دێت.'

حازم بەگ لە ساڵی ١٩٣٠وە لە شاری سلێمانی دەڕوات و لە بەغدا نیشتەجێ دەبێت، ڕێک هەفتەیەک دوای ڕۆژی شەشی ئەیلوول. ئەو ڕۆژەی زیاتر لە دوو سەد کەس لە بەر دەرکی سەرا دەکوژرێن. حازم بەگ یەکێک دەبێت لەو چەندان بەرژەوەندیخوازەی خەڵکی سلێمانی، کە خۆیان بە مەندوویی خەڵکی سلێمانی دەزانن و خۆپیشاندەران بە منداڵەوردکە و گێرەشێوێن لە قەڵەم دەدەن.

حازم بەگ و کوڕەکانی لە دوای ساڵی ١٩٦٣وە و لە ڕۆژی هاتنەسەرحوکمی قەومییەکانەوە هەوڵی ئەوە دەدەن خۆیان بشارنەوە؛ یان بۆ شاری سلێمانی بگەڕێنەوە. بەڵام پەیوەندییەکانی حازم بەگ ئەوەندە بەرفراوان دەبن، هەر زوو پەیوەندی بە ئەندامانی حیزبی بەعسەوە دەکات و گفتی ئەوەیان لێ وەردەگرێت، کە

سـەرومالّی پارێزراو دەبێت. بەڵام کەمالی کوڕی لە خۆی دڵنیا نابێت و بۆ سلێمانی دەگەڕێتەوە و خانووە کۆنەکەیان لە گەڕەکی شێخانی شـاری سـلێمانی ئاوەدان دەکاتەوە، پاشـان خانوویەک لە گەڕەکی عەقاری دەکڕن. کاتێک حازم بەگ هەواڵ بۆ کەمالی کوڕی دەنێرێت، پێی باش دەبێت ئەو بنکەیەیان لە سلێمانییش هەبێت.

مانگێک پێش ئەو ڕۆژە نازم گوزار و دوو کەسـی تر سـەردانی ماڵی حـازم بەگیـان کردبوو، بۆ نوێکردنەوەی هەمـان ئەو پەیمـانەی ئەو لەگەڵ ڕژێمی پێشتردا هەیبوو.

دوو ڕۆژ دوای سـەردانەکەی نازم گوزاری سـەرکردەی باڵای حیزبی بەعس، دوو پیاوی چاکەت و پانتۆڵپۆش بە فۆرتێکی ڕەش گەیشبوونە بەردەم ماڵەکە. سـەرداری حازم بەگ چاوەڕوانی کردبوون، چونکە پێشـتر لە هاتنیان ئاگاداریان کردبووەوە. لەگەڵ وەسـتاندا بێ ئەوەی داببەزن لەگەڵیـانـدا دەڕوات، کـاتێـک دەگەنە ئەپـارتمـانی وەزارەتی ناوخۆ، هەموو دەرگەکان بۆ هـاتنی ئەو میوانە؛ کە دیار بوو ئاگادار بوون، خرابوونە سـەر پشـت. لە قاتی چوار و کۆتایی، دەچنە ژووری وەزیری کاتی، سـابر خەڵەف؛ کە پیاوێکی قەڵەو بوو، بە قاتێک جلی سپییەوە لە پشت مێزێکەوە دانیشتبوو، وەک بڵێیت لەبەر قەڵەوی هیچ جلێکی ناچێتە بەر، بۆیە ئەو پارچە جلە سـپییانەی لەبەر کردووە. دیار بوو نەیدەتوانی بە ئاسانی لە جێگەی خۆی هەڵبستێت، چونکە لە هاتنەژوورەوەی سـەرداردا، تەنیا بە ئەسـتەم سـەری بۆ جووڵاند و گوتی: 'چۆنی کاکە، خۆشـەویسـتمان سـەردار، کەسـوکار چۆنن، سلێمانی چۆنە، هەموو باشن!'

بە دەنگێکی گڕ ئەمە دەڵێت و سـەرداری حازم بەگ بەرەو ڕووی دەچێت، کابرا بێ ئەوەی ئانیشـکی لەسـەر مێزەکە بۆ بجووڵێنێت تەوقەی لەگەڵ دەکـات. بە سـەر مێزەکەدا خۆی دەچەمێنێتەوە و تەوقەی لەگەڵ دەکات، سەردار دەڵێت: 'سوپاس گەورەم، ئێوە چۆنن، تەندروستیتان باشە؟ باوکم سڵاوی بۆ بەڕێزتان هەبوو.'

'هەزار ڕەحمەت لـە بـاوکت، کاکە سـەردار، بـاوکت یەکێکە لە دڵسـۆزەکانی شـۆڕش، تەنانەت سـەرۆکیش ناوی ئێوە و باوکتی بیستووەتەوە... بۆ ئەو خزمەتەی دەیکەن پێزانینی هەیە.'

'سوپاس گەورەم، ئێمە وەک عێراقییەک ئەرکی سەرشانمان بەجێ هێناوە.'

'خودا بتپارێزێت، سـەردەمی بەکرێگیراو و تاوانبار بەسـەر چوو، ئێسـتا بۆ بنیاتنانی عێراقێکی نوێ، ئێمە بەرامبەر گەل و شـۆڕش لە بەردەم بەرپرسیارێتییەکی گەورەداین!'

'بەڵێ، ئەمرکە گەورەم!'

'دوژمنانی گەل و شـۆڕش زۆرن و پێویسـتە کاری جددی بکرێت، لەبەر ئەوە ئەرکمان زۆرە.'

'بەڵێ گەورەم، ئامادەی فەرمانتم.'

'لە بـاکوور پلانێکی گەورەمـان هەیە! بەرامبەر ئەوانەی دژی بەرژەوەندیی هەمووانن.'

'بەڵێ گەورەم، ڕاست دەفەرموویت و زۆر پێویستە.'

'بۆ ئەو مەبەسـتە تۆ میوانی وەزارەتی بەرگری دەبیت و لەوێ چەند پێویست بێت دەمێنیتەوە و لەگەڵ هاوڕێ عەبدولکەریم شێخلی هاوکاریی دەکەیت و تۆ لەو ڕێنمایی وەردەگریت.'

'فەرمانی تۆیە گەورەم.'

دوای ئەمە زەنگی تەلەفۆنەکە لێ دەدرێت، کورسییەکەی دەسووڕێنێت و پشت لە سەردار دەکات. بە چرپەچرپ قسە لەگەڵ یەکێک دەکات. پاشان ئەو کەسەی لەگەڵ سەردار چووبووە ژوورەوە و بە پێوە لە شانییەوە ڕاوەستابوو، بە ناوی عەبدولکەریم شێخلی، کە یەکێک بووبوو لەو دوو کەسەی بۆماڵەوە بە دوایدا چووبوون، دەست دەخاتە سەر شانی و پێی دەڵێت: 'کاک سەردار، پێویستە بڕۆین.'

سواری هەمان ئۆتۆمبێل دەبن و پێش ئەوەی بە ڕێ بکەون، عەبدولکەریم دوو پاکەتی جگەرەی مارلبۆرۆی لە نێو چەکمەجەی ئۆتۆمبێلەکەی دەردەهێنێت و یەکێکیان فڕێ دەداتە سەر داشبڵەکە و ئەوی تریان هەڵدەپچڕێت. دوای ئەوەی هەردووکیان جگەرەکانیان دادەگیرسێنن و مژی لێ دەدەن، بێ ئەوەی هیچ بڵێن بەڕێ دەکەون.

پێش ئەوەی بگەنە بەردەم ئەپارتمانی وەزارەتی بەرگری، عەبدولکەریم شێخلی بە سەرداری گوتبوو: 'ئەوەی پێ بنێتە نێو ئەپارتمانی ئەم وەزارەتەوە، دەبێت کەسێکی زۆر باوەڕپێکراوی حیزب بێت، بە تایبەتی لەم ڕۆژانەدا، کە پلانی پاشەڕۆژی عێراق سەرلەنوێ دادەڕێژرێت، کاکە سەردار تۆش یەکێکی لە ئێمە و ئیتر پێویست ناکات باسی گرنگیی پاراستنی نهێنیت لە لا بکەم. چونکە دەبێت تۆ ئەوە زۆر زۆر باش بزانیت؛ کە من و تۆ قاسەی پاراستنی نهێنیی حیزبین!'

کاتێک عەبدولکەریم شێخلی ئەمە بە سەرداری حازم بەگ دەڵێت، بە سەرنجەوە لە ناو چاوی دەڕوانێت و توند سەر شانی دەگوشێت.

# ٧

گەیشـــتبووە بەردەم ماڵی غالب عەربەتی، کاتێک گوێی لە هاواری کەسێک بوو، ڕاوەستا و گوێی گرت، دەنگەکە بوون بە دووان، کاتێک دەرگەی دالانەکەی ماڵی غالب کرایەوە، هاوار و پاڕانەوەی بەهار و دایکی بوو: 'کاکە بۆ خاتری خوا، ئێوە کێن و بۆ کوێی دەبەن؟'

دەرگەکە کرایەوە و هێشـــتا مامۆســـتا یاســـین بێدەنگ لە جێگەی خۆی ڕاوەســـــتابوو، دوو پیاو قۆڵیان لە قۆڵی غالب عەربەتیدا بوو، جامانەکەی لە ملیدا بوو، جووتێک نەعلی ژنانەی زەردی بە ســـەر پێوە بوو، کاتێک چاویان بە یاســـین کەوت، بۆ چەند هەناســـەیەک بێدەنگ لە یەکترییان ڕوانی، هەرچەندە دوو کەسـەکە دەموچاویان بە جامانە هەڵپێچابوو، یاســـین گوتی: 'عوســـمان، ئەوە غالب بۆ کوێ دەبەن؟'

کاتێک مامۆستا یاسین ئەمەی گوت، عوسمانی ئامە دەستی بەرەو ڕووی یاسین هەڵبڕی و لوولەی دەمانچەکەی تێ کرد. کەسی دووەم کابرایەکی ڕەشـــتاڵەی کورتەباڵا بوو، جامانەیەکی ڕەش و ســـپیی دابوو بە دەموچاوی خۆیدا.

عوسمانی ئامە بە تووڕەییەوە بە مامۆستا یاسینی گوت: 'قەستەم بە کاک ئەحمەیی شـــێخ یەک کەلیمە لە دەمت بێتە دەر، فیشـــەکێک ئەنێم بە تەوقی سەرتەوە.'

نامیق ئاغا و عەزیزی میرزا کەریم لە خوارووی کۆلانەکەوە بۆ لایان هاتن، عەزیز خۆی خستە بەردەم مامۆستا یاسین و گوتی: 'نەکەی کورە، نا نەجیب، دەستت داگرە!'

نامیق ئاغا لە مامۆستا یاسینی پرسیی: 'ئەوە چییە یاسین، ئەمانە کێن؟'

'ئەمەیان عوسمانی ئامە درێژە و ئەویتریشیان مەگەر خوا بزانێت بەکرێگیراوی کێیە!'

لەو کاتەدا بەهار و دایکیشی هاتبوونە بەینەوە، بە جۆرێک هەرەشەکانی عوسمانی ئامە و قسە و پاڕانەوە تێکەڵ بووبوون، هاوڕێ دەموچاوهەڵبەستراوەکەی عوسمانی ئامە تاوەکوو ئەو کاتە هیچی نەگوت، بەڵام عەزیز لکی چۆغەکەی غالب عەربەتیی گرتبوو، لە بەینیاندا هەریەکە و بە لایەکدا ڕایدەکێشا، لەگەڵ ئەوەدا عوسمان لوولەی دەمانچەکەی کردبووە عەزیز، بەڵام عەزیز بەردەوام لێی دەچووە پێشەوە، نامیق ئاغا دەستی عەزیزی گرت و پێی گوت: 'کوڕە عەزیز ئاگاردار بە، تەقەمان لێ نەکات!'

'ئەو پیاوە نییە، خوێڕیی بەکرێگیراوە!'

کاتێک خەڵکی گەڕەک هاتنە بەر دەرگە و چەند پیاوێک بەرەو ڕوویان چوون، یەکێک لەوانە حەمەفەرەجی پۆلیس بوو، هاوڕێ دەموچاوهەڵبەستراوەکەی عوسمانی ئامە دوو فیشەکی بەسەریاندا تەقاند، ژنەکان قیژاندیان و پیاوەکانیش سڵەمینەوە و لە جێگەی خۆیان ڕاوەستان، لەو کاتەدا نامیق ئاغا و عەزیزی میرزا کەریم دەستیان دابووە یەخەی عوسمان، کابرا دەموچاو هەڵبەستراوەکە لوولەی دەمانچەکەی کردە غالب عەربەتی و دوو فیشەکی نا بە سینگییەوە، لەو کاتەدا عەزیز پەلاماری دا و چمکی جامانەکەی

لەسەر دەموچاوی ترازاند، بەڵام هیچیان ئەویان نەناسییەوە، دوای ئەوە نامیق ئاغا و یاسین دەستیان لە یەخەی عوسمانی ئامە بەر دا و چوون بە سەر غالب عەربەتیدا نوشتانەوە، عوسمان و هاوڕێکەی سواری جێبەکەیان بوون و لە چەند هەناسەیەکدا لەچاو ون بوون، نامیق ئاغا بە ڕاکردن چوو بە دوای ستاری سایەقدا کە ماڵەکەیان دەکەوتە سەر شیوی قازی، خوێنی غالب عەربەتی دوو مەترێک جۆگەلەی بەستبوو، عەزیز و مامۆستا یاسین خستیانە ناو سەیارە فۆرتەکەی ستارەوە و بە هەمان ڕێگەدا، کە تەقەکەرەکان لێوەی تێپەڕیبوون، بۆ نەخۆشخانەیان برد.

دوایین هەواڵی غالب عەربەتی، لە نێوان مردن و ژیاندا بوو، دکتۆرەکان بە مامۆستا یاسینیان گوتبوو، کە یەکێک لە گوللەکان بەر بڕبڕەی پشتی کەوتووە و ئەگەر نەیشمرێت ئەوا بەختی نابێت جارێکی تر لەسەر پێی خۆی بوەستێت، بەڵام یاسین کاتێک دەگەڕێتەوە بۆ ماڵەوە، ئەوە بە بەهار و دایکی ناڵێت و تەنیا ئەوەندە نەبێت: 'عەمەلیاتی بۆ کراوە و شوکور لە مردن ڕزگاریان کردووە!'

پاشان عەزیز و نامیق ئاغا بە بەهار و دایکی دەڵێن، کە ئێوارە خۆیان حازر بکەن و دێنەوە بە دوایاندا و پێکەوە بۆ نەخۆشخانەی جمهووری دەچن.

سەعات چواری دوای نیوەڕۆ یاسین و پیاوێکی نەناس دەگەنە ماڵی غالب عەربەتی، یاسین جەمیل مەدفەعی هاوڕێی بە بەهار و دایکی دەناسێنێت، لەو کاتەدا عەزیز و نامیق ئاغا بە جێبێکی لاندرۆڤەری سەوزەوە لە بەردەمیاندا ڕاوەستان.

کاتێک پێکەوە گەیشتنە خەستەخانەی جمهووری، ئەو ژوورەی کە دەبووایە غالب عەربەتیی تێدا بووایە، جێگەکەی چۆڵ دەبێت، پاشـــان پێیان دەڵێن، کە سـەعات سـێی دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە، چوار سـەرباز و دوو کەسـی مەدەنی هاتوون و غالب عەربەتییان بۆ نەخۆشـخانەی سـەربازی لە حامییە بردووە. وەکوو ئەو زانیارییەی بە نەخۆشـخانەی جمهووری دابوویان، گوایە لەوێ چارەسـەری باشتری بۆ دەکرێت... چونکە برینەکەی کاریگەرە.

دوای ئەوەی بۆ بەردەم پرسـگەی سـەربازگەی حامییە دەچن، پێیان دەڵێن کە ئەوان ئاگاداری هیچ نین و دەریاندەکەن، پاشـان بۆ گەڕەکی سەرشەقام دەگەڕێنەوە.

سـەعات هەشـتی شـەوی ئەو ڕۆژە ئەنوەر دارتاش دێت بە دوای مامۆسـتا یاسـیندا و پێکەوە بۆ ماڵی کەمالی حازم بەگ دەچن، کاتێک دەچنە ژوورەوە و لە حەوشـە و ناو باخەکەدا؛ ئەو پیاوەی لەگەڵ عوسـمانی ئامەدا بوو لەوێ دەبینێت، ئەو کەسـەی تەقەی لە غالب عەربەتی کردبوو، لە ماڵی کەمالی حازم بەگ دەبێت.

کەمال پێیان دەناسـێنێت و دەڵێت: 'ئەوە کاک عەگید سـدیقە و لە سلێمانی نوێنەری سەرۆک بارزانییە!'

مامۆسـتا یاسـین دەسـت دەخاتە ناو دەسـتی، دەسـتی یەکتر توند دەگوشن و تاوێک بە ڕقەوە لە چاوی یەک دەڕوانن.

دادەنیشـن، ئەنوەر دارتاش دەڵێت: 'لە ڕێگە، یاسـین ئەوەی بۆ گێڕامەوە، کە ئەمڕۆ لە گەڕەکی سـەرشـەقام تەقەیان لە کابرایەکی هەژاری باخەوان کردووە!'

'ئیتر ئەوە وەزعەکەیە!'

کەمالی حازم بەگ ئەمە دەڵێت و عەگید سدیق بۆی دەسەنێتەوە و لە یاسین دەڕوانێت و دەڵێت: 'ئێمە دەبیت باش دوست و دوژمنی خۆ ناسبکەین، دەبیت هەڤالان باش ئاگاربن، کە بە ناڤێ خەبات لە بەرەی ناحەز و دوژمن نەبین! چونکێ ئەڤە خیانەتە و جێگەی قەبول نییە.'

'ئێمە نابێت بە ناوی خەباتەوە خەڵکی هەژار بە دوژمنی خۆمان بزانین و شـــــەلاتی و خوێڕی بە کرێ بگرین و پەلاماریان بدەن و بیانکوژن! ناچێتە عەقڵمەوە جەنابی مستەفا بارزانی بەوە ڕازی بێت!'

کاتێک مامۆستا یاسین ئەمەی گوت، لە عەگید سدیقی دەڕوانی.

# ٨

'بە بیرم دێت ئەوەت بۆ باس کردم، کە تۆ لەو کۆبوونەوەیەی شاری بەغدای حیزبی شیوعیی ساڵی ١٩٤٨دا، کە لە ماڵی یەهودا سدیق بەسترا، ئامادە بوویت! لەوێ چی ڕووی دا؟'

کاتێک ئەمەم لە خەلیل حەمدان پرسیی، ساڵی ١٩٨٢یە و لە شاری بیسمارکی ویلایەتی داکۆتای وڵاتی ئەمریکا لەلای من میوان بوو.

'بێقەزا بیت، تۆش چیت لە بیر ماوە.'

'بەڵێ، چونکە تا ئەمڕۆ لە کەسی ترم نەبیستووە.'

'لەو ساڵەدا و دوای لەسێدارەدانی سێ سەرکردەکەی حیزبی شیوعی، بۆ دەرچوون و خۆپاککردنەوە لەو نەعلەتە، وەکوو سەرەتای دامەزراندنی حیزبی شیوعی لە ماڵی جوویەک لە بەغدا کۆ بووینەوە. من وەک نووسەرێکی حیزب بانگ کرابووم. چونکە ئەوکاتە من لە حیزبدا هیچ بەرپرسیارێتییەکی ترم نەبوو. ئەوە بوو بۆ دوو ساڵ دەچوو، یەهودا سدیق سەرکردایەتیی حیزبی شیوعیی بە نهێنی گرتبووە دەست. لە ماڵی خۆیاندا بەردەوام کورد و عەرەبە شیوعییەکانی کۆ دەکردەوە. ئەو ڕۆژە لە کۆی ئەو بیست کەسەی لەوێ ئامادە بوون، هەشتیان جوو بوون. چوار ڕۆژ کەس لەو ماڵە نەچووە دەر، باش بە بیرم دێت لە نێوان خۆیاندا بووبوون بە دوو بەرەوە، دیار بوو کاریگەریی ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانە و سیاسەتی حکومەت هەموو ڕێگەکانی لێ داخستبوون. لە ڕاستیدا، لە کۆبوونەوەکەدا بێجگە لە دژایەتی و لایەنگریی زایۆنیزم باسی هیچی

تر نەکرا. لە دەمی ئەندامە عەرەبەکانەوە ئەوە دەبیسـترا، دەبێت ئێمە زمان و نووسین و گوتاری حیزبی شیوعی تەواو لە زایۆنیزم و جوو پاک بکەینەوە. لە وەڵامی ئەوەدا ساسۆن دەلال گوتی: "ئێمە بۆ ئەوە ئەم پارتەمان هەڵبژاردووە و هەموومان چالاکانە کاری لەپێناودا دەکەین، کە پەیوەندیی بە ئایدیا و ڕووداوەکانی ئێسـتای عێراق و جیهانەوە هەیە. تەشـەنەکردنی زوڵم و زۆر و کێشـەی چینایەتی و دژە سـامی، نەهێشـتنی جیاکاریی ئایینی و نەژادی و کۆمەڵایەتی. ئێمەی جوو بە شـوێن ئەو ئـایـدیـا گشـتگیرەوەین، وەک چۆن سـۆشـیالیزم خەبات بۆ ڕزگاریی مرۆڤ لەدەسـتی زوڵمی ئایینی و نەژادی دەکات، ئێمەیش خوازیاری ژیانێکین، کە تێیدا ئایینێک یان نەتەوەیەکی زۆرینە بە سـەر ئەوانی تردا باڵادەسـت و زاڵ نەبێت." ئەو ڕۆژە بە کۆی دەنگی سەرکردە عەرەب و کوردەکان، جووەکانیان پەراوێز خست و بە ڕاشکاوانە باس لەوە کرا، کە لە ئەدەبیاتی حیزبدا ئەوەی لە سێزدە ساڵی تەمەنی حیزبدا نووسراوە و لەمڕۆ بە دواوە دەنووسـرێت، ئەوەیە کە دەبێت ناوی ئەوان بسـڕێتەوە. تاوەکوو پـارێزگـاری لە سـومعـەی حیزب بکرێـت و بەر نەعلەتی خەڵـک نەکەوێت.'

'جارێک لەگەڵ کاکە غەفوورمدا باسـم کرد، بەڵام ئەو هیچی لەبارەوە نەئەزانی. باشـە خەلیل ئیتر بەو ئاسـانییە بڕیاری کۆتاییی درا؟'

'بەڵێ، دوای بڕیـاری کۆتـایی، یـاقووب کۆهین دەنگی هەڵبڕی و گوتی: "هاوڕێیان، بەم جۆرە سۆشیالیزم لە عێراق هیچ پاشەڕۆژێکی نـابێت. جووەکـان لە یەک کـاتـدا دەردەپەڕێنرێن و بە زۆر ڕەوانەی ئیسـرائیـل دەکرێنەوە؛ چونکە لە لایەن ئێوە و گەلەوە بە عێراقی

دانانرێن، لەوەش خراپتر هەموویان بە زایۆنیزم و زەوتکەری خاکی فەلەستین دادەنرێن. ئەم دژبەیەکی و ناکۆکییە هێندەی پەیوەندیی بە جووە وێناکراوەکەوە هەیە، کە ١٤٠٠ ساڵە سکێچەکەی کێشراوە، ئەوەندە پەیوەندیی بە حەقیقەتی کارەکتەری مرۆڤی ئاسایی جووەوە نییە." جەلال خۆت ئەوە دەزانیت، لە ساڵی ١٩٤٨دا و دوای شکستی عەرەب لە جەنگی دژ بە ئیسرائیل، ئیتر دەستەواژەی "جووەکان برای شیوعییەکانن!" لە لایەن ئیسلامی و عەرەبە نەتەوەپەرستەکانەوە بڵاو کرایەوە. ئیتر حیزبی شیوعی عێراقی ناچار بوو، یان باشترە بڵێین لە لاوازی و نەزانینیاندا، لە گوتار و نووسراوەکاندا خۆیان لە ناوهێنانی سەرکردەکانی وەک؛ یەهودا سدیق، ساسۆن دەلال، شائۆل تەویق و یاقووب کۆهین، هەروەها فێردا یاقۆ بپارێزێت.'

'فێردا یاقۆ کێیە؟'

'فێردا کچی یاقۆ یەهودای ملوێنێر بوو، کە لە سەرەتای دامەزراندنی حیزبەوە بەشدار بوو، هاوڕێی نزیکی فەهد بوو. فێردا لە سەرەتاوە لایەنی دارایی حیزبەکەی گرتبووە ئەستۆی خۆی، بێ ئەوەی بیەوێت ناوی بهێنرێت. هەندێک لە هاوڕێ نزیکەکانیان دواتر گوتبوویان، کە فێردا لەگەڵ فەهد دڵخوازی یەکتر بوون. فەهد لە بەندیخانەی بەعقووبە دەڵێت؛ "من لە ڕێگەی هاوڕێ فێردا یاقۆ یەهوداوە سۆشیالیزمم ناسی."

پاشان فێردا لە هەمان ساڵدا بۆ خوێندن دەچێ بۆ ئەمریکا و ناگەڕێتەوە. تەنانەت لەو کۆبوونەوەیەشدا چەند جارێک بۆ یەک هەستانەوە و پەلاماری یەکتریان دا. ساسۆن دەلال لە کۆتاییی کۆبوونەوەکەدا و کاتێک ویستی بڕوات، ڕووی لە ئەندامە عەرەبەکان کرد و پێی گوتن: "ئێوە هیچ لە بیری سۆشیالیزم نەگەیشتوون،

چونکه ئێوەی عەرەب؛ سۆشیالیزم وەک ئایدیۆلۆژییەک بۆ خزمەتی پرســـی نەتەوایەتیی عەرەبی خۆتــان بەکــار دەهێنن، بە داخەوە کوردەکــانیش کوێرانە دواتــان کەوتوون، کە ســــبەینێ هەمــان چارەنووسی ئێمەیان دەبێت. ئەمڕۆ ئەوەتان سەلماند کە ئەندامبوون لەم پارتە بە ناو کۆمۆنیزمەدا بۆ ئێمەی کەمینە جۆرێکە لە خۆکوژی.''

پاشـــان لە ڕۆژنامە و بەیانی حیزبی شـــیوعیدا بە ڕاشـــکاوی ئەوە نووســـــرا: ''جووەکـان پلانگێڕن و کـارکردن لەگەڵیـان یـاخود جێکردنەوەیان لە ناو ڕێکخراو و حیزبدا بەشـــداریکردنە لە پلانەکانی زایۆنیزم لە ئیسرائیل.'' من ئەو شەو و ڕۆژانە هیچی وام نەنووسی، کە خۆی لە ڕاستیدا بۆ ئەوە لەوێ بووم.

'خەلیل، تۆ ئەبووایە کاتی خۆی ئەو زانیارییانەت بڵاو بکردایەتەوە.'

'جەلال، تـازە ئـەوە تێپەڕی و تکـات لێ دەکەم تووشـــی ئەو سەرئێشەیەم مەکە!'

'بە بیرم دێت، ئەوســـــا بەیاننامەیان بڵاو کردەوە، کە گوایە ئەو ئەندامە جووانە خیانەتیان لە حیزبی شیوعی کردبوو!'

'چەند ڕۆژێک دوای کۆبوونەوەکەی ماڵی یەهودا ســـدیق ئەندامە جووەکان شـوێنی مانەوەیان لە لایەن هاوڕێیانەوە دەستنیشـان کران و بەگرتیـان دان. پاشــــــان تەواوی زانیـاریی مێژووی کارکردنیان تاوەکوو دواڕۆژی پێکەوەبوونیان چووە بەردەســتی کاربەدەسـتانی میری. یەهودا ســـــەدیق چەند مـانگێک دوای ئەو ڕۆژە عیدام کرا. دەزانی جەلال، حیزبی شـیوعی بەم کارەی ویسـتی خۆی لە زوڵم و زۆرداریی ڕژێمی پادشـــایەتی بپارێزێت و دوای شـکسـت دووبارە خۆی ڕێک بخـاتەوە. پاشــــــان لە نێو ئەندام و لایەنگراندا دەنگۆی ئەوەیـان بڵاو کردەوە، گوایە ئەنـدامـانی جوو لە بەنـدیخـانە هەموو

نهێنیی حیزبیان درکاندووه و خیانەتیان لە هاورێکانیان کردووه. ئەویش جۆرێک بوو لە تۆڵەسەندنەوه و پاککردنەوه، یان باشترە بڵێم تۆڵەسەندنەوه، چونکە ناوی گەلێک ئەندامی کورد و عەرەبیشی تێدا هاتبوو! کە ئەوانیش هەموو گیران.'

## ٩

هەرکەسێک دەیناسی پێی گوتبوو، کە واز لەو ئەتوارە ناشیرینە بێنێت، بەڵام زۆر خراپ خووی پێوە گرتبوو، بۆی تەرک نەدەکرا، بۆ هەر جێگەیەک دەچوو، بە درێژاییی ئەو شەقامە، خڕەبەردێکی پێش خۆی دەدا و سەری شۆڕ دەکردەوە و بە ڕاست و چەپی پێکانی شەقی تێهەڵدەدا، لەگەڵ تێ هەڵدانی خڕەبەردەکەدا خەیاڵی دەڕۆیشت و ئاگای لە خۆی نەدەما.

ئەو شەوە لەگەڵ هاوڕێکانی لە گەڕەکی شێخان و ماڵی کەمالی حازم بەگ بوون، لەوێ گوێیان لە یاریی نێوان عێراق و تونس گرتبوو، یاریی کۆتایی جامی وڵاتە عەرەبییەکان بوو، پێشبڕکێکە لە بەیروت ساز کرابوو، کەمالی حازم بەگ ڕادیۆکەی بۆ هێنابوونە بەر پەنجەرەکەیان و زیاتر لە پەنجا کەس هاتبوون و لە چیمەنەکەی ئەواندا گوێیان لە یاریی کۆتاییی دەگرت، هەندێکیان دانیشتبوون و زۆریان بە پێوە بوون، دوای تەواوبوونی یارییەکە لەگەڵ مامۆستا ئیسماعیل و ئەنوەر دارتاشدا لە گەڕەکی شێخانەوە بەرەو چوارباخ گەڕانەوە، مامۆستا ئیسماعیل و ئەنوەر دارتاش گلەییی ئەوەیان لە مامۆستا یاسین دەکرد، کە لە ماڵی کەمالی حازم بەگ ئەو بە تەنیا هاندەری تیپی هەڵبژاردەی عێراق بووبوو، کە تونس بە گۆڵێک یارییەکەی بردەوە و کاسەکەی برد.

ئەوانەی ئەو شەوە لە ماڵی کەمالی حازم بەگ پێکەوە گوێیان لە یاری گرتبوو، هەموویان لە لایەنگرانی پارتیی دیموکرات و ئەندامی

قوتابییان و لاوان بوون، مامۆستا یاسین چەند جارێک دەنگی هەڵبڕی و ویستی ئەوەیان پێ بڵێت، کە وەرزش و سیاسەت دوو شتی زۆر جیاوازن و بە یەک بەراورد ناکرێن، بەڵام ئەوانەی لەوێ بوون هەموویان ڕایان لەگەڵ ئەو جیاواز بوو، بە پێچەوانەوە لە کاتێکدا کە عێراق گۆڵی لێ دەکرێت ئەوان دەیکەن بە شـــایی و هەڵپەڕکێ و ئەو بە تەنیا دەمێنێتەوە، پاشان لەگەڵ چەند گەنجێکدا توشی شەڕەقسە دەبێت، دوای ئەوەی یارییەکە کۆتایی دێت و هەڵبژاردەی عێراق دەدۆڕێت، قسە و باسەکان لە وەرزشەوە بۆ سیاسەت دەگۆڕێن، پاشان زۆربەیان دەڵێن، کە حکومەتی عێراق نابێت بە دۆستی کورد بزانین، ئیتر کەواتە هەڵبژاردەکەیشی باشترە بدۆڕێت، کەمالی حازم بەگ دەســـت دەکات بە گوتارخوێنی و بە ئامادەبووان دەڵێت: 'ئێمە وەک حیزبی شـــیوعیی عێراقی نیین و نابین، پارتی حیزبێکی کوردســـتانییە و عەرەب ڕقیان لە هەموو شـــتێکی ئێمەیە، بەڵام ئێمە ساویلکانە حەزمان لە هەموو شتێکی ئەوانە و پێیان سەرسامین، ئەوە مانای ئەوە دەگەیەنێت کە ئێمە خۆمان لەوان بە کەمتر ئەزانین، یان لەوە ئەچێت لە ژێرەوە سەر بە حیزبی شیوعی بین!'

مامۆستا یاسین، نەیدەتوانی بەو قسانەی ئەوان دڵی ئاو بخواتەوە و بە دۆڕانی هەڵبژاردەی عێراق ڕازی بێت، زووزوو لە ژێر لێوەوە و وەک لەگەڵ خۆیدا بدوێت: 'هەڵبژاردەی عێراق بە تونس دۆڕاوە، توو خوا ئەوە ڕاستە، هەڵبژاردەیەکی ئاوا بەهێز دۆڕاوە!'

پاشان کاتێک لەگەڵ مامۆستا ئیسماعیل و ئەنوەر دارتاشدا بۆ ماڵەوە بەڕێوە بوون، ویســـتی باســـی ئەو نامەیەی جەلالی میرزا کەریمیان لەگەڵدا بکاتەوە و بۆچوونی ئەوان وەربگرێت، جەلال لە ســـجنەوە بۆی ناردبوو، تاوەکوو بیگەیەنێتە دەســـت بەهاری غالب

عەربەتی، ئەوەندە بە نامەکە سەرسام بوو، چەندان جار خوێندبوویەوە. نەیتوانی ئەو نهێنییەی خۆییان لەگەڵدا باس بکات، بە تایبەتی لە دوای ئەو ڕۆژەوەی کە پێ گوتبوون، حەزی لە بەهاری غالب عەربەتی کردووە.

پێی گوتن: 'ئەرێ ئێوە تا پێش یارییەکەیش موشەجیعی مونتەخەبی عێراق بوون، نازانم بۆچی ئاوا هەڵگەڕانەوە، ئاخر توو خوا ئێوە عەیب ناکەن، ئەی ئەوە دووڕوویی نییە؟'

لە دوای ئەمەوە، بە دەم ڕێگەوە خەریک بوون دەستیان دەدایە یەخەی یەکتری، مامۆستا یاسین بە هاوڕێکانی گوت: 'ئێوە هەردووکتان دووڕوون، فڕتان بە یاریی دووگۆڵییەوە نییە و مەگەر بە ڕێکەوت ئەگینا ڕۆژێک شەقتان لە تۆپێک هەڵنەداوە و چی لە یاریی دووگۆڵی ئەزانن، نازانم ئەمشەو بۆچی لە دژی من هاندەری هەڵبژاردەی تونس بوون!'

'یاسین، وا بزانم تۆ لە شتێک تووڕەیت؟'

کاتێک ئەنوەر دارتاش ئەمەی گوت، مامۆستا یاسین دوو هەنگاوی خێرای نا و چوو لە بەردەمیاندا ڕاوەستا، وەکوو بیەوێت ڕێگەیان پێ بگرێت، هەردوو دەستی بەرەو ڕوویان بەرز کردەوە و بە تووڕەیییەوە پێی گوتن: 'بەڵێ زۆر تووڕەم، لەوەی ئێمە بە ناوی خەباتەوە تەعدا لە خەڵکی هەژار و خەڵکی کوردی قوڕبەسەری خۆمان بکەین.'

'تەنیا مەبەستت غالب عەربەتیی باوکی بەهارە، کە بەحسابی خۆت خۆشت ئەوێت؟'

'ئێوە نازانن چ پلانێک لە پشتی ئەم دەستدرێژی و تاوانانەوەیە، تکایە برادەران، باشە غالب عەربەتی لەسەر ئەوەی شیوعییە بە

بەرچاوی ژن و منداڵ و خەڵکی گەڕەکی سەرشەقامەوە تەقەی لێ دەکرێت، ئەمە تا ئێرە، بە یاسا و ڕێسای پارتیمان تەواوە، بەڵام...'

مامۆستا ئیسماعیل نەیهێشت قسەکەی تەواو بکات و گوتی: 'ئێ برا، باوەڕتان بێت، ئەوانە دوژمنی شۆڕشن!'

'تکایە، سمە بێ زەحمەت تۆ واز لەو گەڕەلاوژێیە بێنە، خۆ تۆ خۆت بە ڕۆشنبیر ئەزانیت، هەی عەمرت نەمێنێت، دەی بە ناخێری گیانت ئەو قسەیەش دووبارە بکەوە، کە شێخ و مەلاکان ئەڵێن، شیوعییەکان سواری خوشک و دایکی خۆیان ئەبن.'

'ئەرێ یاسین، تۆ ئەوەندە کاریگەریی کوڕانی میرزا کەریمت بەسەرەوەیە؟ مەقسەدم، کە ئەوەندە لایەنگری شیوعییەکانیت، چیت داوە لە پارتی، برا تۆ تۆزێک بە سەر خۆتا بچیتەوە باشترە!'

'هاوڕێیان، تکاتان لێ ئەکەم، من ئەمەویت پێتان بڵێم، بۆچی شەلاتییەکی وەکوو عوسەی ئامە، هەروەها عەگید سدیق بە ناوی نوێنەری بارزانییەوە لە سلێمانی، پەلاماری شیوعییەک دەدەن و پاشان ئیستخباراتی عەسکەری بریندارەکە سەرەونگوم ئەکات، ئەی نابێت ئێمە ئەو پرسیارە لە خۆمان بکەین، خۆ ئێستا پارتی لەگەڵ حکومەت لە شەڕدایە، ئەی ئەمەیان لە چی؟!'

'ئینجا تۆ دڵنیایت کە غالب عەربەتی لە لایەن حکومەتەوە ون کراوە!'

'هاوڕێیان، تکاتان لێ دەکەم، ئەوە خۆم شایەتحاڵم و ئاگاداری هەموو شتەکانم، ئێ خۆ نامیق ئاغا و کاک عەزیزی میرزا کەریمم لەگەڵدا بوو، بە ڕاستی من ئامادە نیم...'

مامۆستا ئیسماعیل بە درێژاییی ئەو ڕێگەیە لە دوای مامۆستا یاسینەوە دەڕۆیشت، ئەنوەر دارتاش لە پێشیانەوە بوو، مامۆستا

ئیسماعیل لە وەڵامدا گوتی: 'دەبێت تۆ ئەوەت لە بیر نەچێت، کە ئێمە ئەندامی پارتیین، پاشان وەکوو پشتگیری لە هەڵبژاردەی تونسیش، کە چوویتە شاری کوێران دەبێت دەست بە چاوتەوە بگریت!'

'وەڵڵا بابە شاری کوێران، هاوڕێیان کەمالی حازم بەگ کڵاو ئەکاتە سەرمان، بە ناوی پارتییەوە خوێنی خەڵکی هەژار ئەڕێژن، ئەوەتا کوڕانی میرزا کەریم و چەندان گەنجی تری ئەم شارە لە لیستی ئەوانەدان کە دەبێت بکوژرێن، دەیان شەلاتی و خوێڕیی وەک عوسەی ئامەیان بە کرێ گرتووە، باوەڕ ناکەم ئەمە ئەخلاقی پارتی بێت و حەتمەن ئەمانە بەکرێگیراون، ئەوەندی من زانیاریم هەبێت کاک نووری ئەحمەدی تەهایش ئاگادار نییە، ئەوە کێ پێی قبووڵ ئەکرێت، مەگەر کەرێکی وەک...'

مامۆستا یاسین قسەکەی تەواو نەکرد، دوای ئەمە، یەکترییان نەدواند و بێدەنگ بە دوای یەکدا گەیشتنەوە گەڕەکی سەرشەقام، مامۆستا یاسین بێ خواحافیزی هاوڕێکانی بە جێ هێشت.

بە دەم ڕێگەوە، بەردەوام لەگەڵ خۆیدا دەدوا، دیسان بەردێکی پێش خۆیدا و بە ڕقەوە شەقی تێ هەڵدەدا، هەندێک جار لەو جێگەیانەدا، کە بەر ڕووناکیی گڵۆپەکان نەدەکەوت، بەردەکەی لێ ون دەبوو. کاتێک نزیکی ماڵی خۆیان بووبووەوە، باوکیی بیر کەوتەوە و لە بەر خۆیەوە گوتی: 'بە ڕاست چی وەڵامی باوکم بدەمەوە، دیسان پرسیاری ئەوەم لێ دەکات، لە کوێ بوویت؟ ئاخر پێم ناڵێیت هەتیو لە کوێ بوویت؟ لە خواردنەوە؟ لە بێئەخلاقی؟! یان لەگەڵ ڕەفیقە خوێڕییەکانت لە گاندان بوویت؟'

کاتێک گەیشـــتەوە گەڕەکی ســـەرشـــەقام و لە ماڵی خۆیان نزیک بووەوە، هەڵوێستەیەکی کرد و دیسان ئەمەی بە خەیاڵدا هات: 'ئەڵێم بچم بۆ جێگەیەکی تر و خۆم لە باس و خواستەکانی باوکم بدزمەوە، خۆزگە ئیتر باســی تۆپتۆپێنی لەگەڵدا نەئەکردم، ئەترسـم، ئەمشــەو زۆر لەوە ئەترســم، چونکە حەوســەڵەم نییە و قســە ڕەقەکانیم پێ قبووڵ ناکرێت، ئەزانم دەبێت بە دەمەبۆڵەمان.'

بۆ چەند هەناســەیەک لە شــوێنی خۆی وەســتابوو، چەند جارێک ویســتی بگەڕێتەوە، پاشــان دەســتی بە قژیدا هێنا و لە دوورەوە لە ماڵی خۆیانی ڕوانی، لە بەر خۆیەوە گوتی: 'باشــترە بڕۆمەوە، ئەزانم حەپسەی دایکم چاوەڕێمە و حەز ناکەم دڵی ئەو بشکێنم!'

لەو کاتەدا لە دەنگی گوللەکان ڕاچڵەکی، خێرا بە دوو هەنگاو خۆی گەیاندە بن دیواری ماڵی مام برایمی دراوســـێیان، پێکانی توند لە ڕووی کاشی شـۆســتەکە گیر کردبوو، ترسـێک بە ناو دەمارەکانی جەستەیدا دەگەڕا، ئارەقێکی سارد لە بنباڵ و ناو شانیەوە جۆگەلەیان بەســت، ماســوولکەی پێکانی گرژ بووبوون و بە ئەســتەم دەیتوانی لەسەریان بوەستێت، وای هەست دەکرد هێشتا پێکانی لە ناو پێڵاوی فوتبۆڵێنەکەیدان و ئەوەندە توند قەیتانەکانی بەســـتوون، قاچی گوشـــیون و خوێنیان بۆ ناچێت، لەگەڵ شـــریخەی گوللەکاندا توند دەســـتی بە ســـینگییەوە دەگرت و خۆی بە پێشـــدا چەماندەوە، بە جۆرێک خەریک بوو ئەژنۆکانی دادەدایە ســـەر کاشـــییەکان، هێزی دەدایە بەر خۆی تاوەکوو بگاتە بەر دەرگەی ماڵەکەیان، پێکانی بە ڕووی کاشیی شۆستەکەدا دەخشاند و کوورە کووڕ دەڕۆیشت، وەک ئەو گوللانەی لە دوور دەنگیان دەهات هەموو بەر جەســـتەی ئەو

کەوتبن. هاوڕێکانی هەموویان ئەوەیان دەزانی، کە ئەم چەند لە دەنگی گوللە دەترسێت.

گەیشـتبووە پێش دەرگەی ماڵەوەیان، خۆی بە ڕووی دەرگەکەوە هەڵپەسارد و سـەری نا بە ڕووی ئاسـنە ساردەکەوە، ڕەنگی شـینی تۆخی دەرگای ماڵەکەیان لەناو تاریکیی کۆڵانەکەیاندا ڕەش دەینواند، دەنگی گوللەکان لە دوور تاکو دەهات لە زیادبووندا بوون، ڕۆحی لە ناو جەسـتەیدا ئارامی لێ هەڵگیرابوو، هێزی ئەوەی تێدا نەبوو لە دەرگەکە بدات، لە پشـتیەوە و لە ناو بێدەنگیی کۆڵانەکەدا و لای دەستە ڕاستیەوە گوێی لە میلهێنانەوەی تفەنگ بوو، پاشان گوێی لێ بوو بە زمانی عەرەبی بانگیان لێ کرد: 'کوڕە لە جێگەی خۆت نەجووڵێیت!'

سـەری نابوو بە دەرگەکەوە و هەردوو دەسـتی هەڵبڕیبوو، چوار پۆلیس بوون. لە پشـتیەوە ڕاوەسـتابوون و لوولەی تفەنگەکانیان تێ کردبوو، یەکێک لە پۆلیسـەکان لێی نزیک بووەوە و دەسـتی بە ورگ و پشـتیدا هێنا، پاشـان ڕوویان پێ وەرگێڕا و وەک منداڵێک لە نێوانیاندا وەسـتابوو، یەک یەک لێی دەڕوانین، ئەو پۆلیسـەی کە دەیپشکنی، لە ناکاو زلەیەکی لێ دا و گوتی: 'بڕۆ، یەڵا بڕۆ، لەم ناوەدا نەوەستیت، گەوادا!'

ویستی پێیان بڵێت، بۆچی بە عەرەبی قسە دەکەن، ئەوەی نەپرسی و ڕای گۆڕی، پێی گوتن، کە ئەوە ماڵەکەیانە و ئێسـتا لە سـەیری یاریی هەڵبژاردەی عێراق گەڕاوەتەوە، لە کاتێکدا ئەو دەمی تەتەڵەی دەکرد و چەند جارێک دەستێکی بە توندی بە ڕووی دەرگا ئاسنەکەدا دەکێشا، پۆلیسەکە جارێکی تر هەمان قسەی دووبارە کردەوە و دوو جار شەقی تێ هەڵدا، هەوڵی خۆپاراستنی نەدا، شەقەکان بەر ڕەقاییی

قاچی کەوتن، نەیدەتوانی لەسەر لاق بوەستێت، پۆلیسێکی تریان هاتە پێشەوە و لێی پرسیی: 'گەواد، تۆ بەم نیوەشەوە لە کوێ بووی؟!'

پێش ئەوەی ئەو وەڵامی بداتەوە، دەرگەکە لە پشـــتیەوە کرایەوە، حەمەســـاڵحی عەزەی مەمەنگ خێرا هاتە نێوان یاســـینی کوڕی و پۆلیســـەکان و ڕاوەســـتا، باڵای ئەوەندە بەرز بوو پۆلیســـەکان دوو مـەترێـک چوونـە دواوە و لێیـان ڕوانی، قۆڵی هـەڵکرد و بـازووە ئەســـتوورەکانی دەرکەوتن، هەردوو دەســـتی پان کردنەوە، وەکوو لەپی خاکەنازێک دەهاتنە پێش چاو، بە عەرەبییەکی ڕەوان لەگەڵ پۆلیسەکاندا کەوتە گفتوگۆ، لەو کاتەدا حەپسەی دایکی، کە لە گەڕەکدا بە حەپسە شیعە ناسرابوو، دەستی یاسینی گرت و بردیە ژوورەوە، عوســـمانی برای و ســـوبحیی خوشـــکی لەودیو دەرگەکەوە گوێیان گرتبوو، حەمە ساڵحی باوکی خێرا بانگی لە غەفووری کوڕی کرد، کە چایان بۆ بێنێت، یان ئاوی سارد. کاتێک غەفوور بە سوراحییەک ئاو و جامێکەوە بۆ بەر دەرگە گەڕایەوە، پۆلیســەکان بە حەمە ســاڵحیان گوت: 'لـە بـەر خـاتری تۆ نـەبووایـە لـەگـەڵ خۆمـانـدا ئـەمـانبرد و لێپێچینەوەمان لەگەڵدا ئەکرد.'

دوای ئاوخواردنەوە پۆلیســەکان ســوپاســیان کرد و کۆڵانەکەیان بەجێ هێشت.

پاشـان حەمەسـاڵحی باوکی لە حەوشـەکەیاندا، وەکوو شـێت و بە هـەڵـەداوان لـە دار دەگـەرا، لـەبـەر خۆیـەوە بـەردەوام جنێوی بـە منداڵەکانی دەدا، دوای ئەوەی بە دەســـتی بەتاڵ چووە ژوورەوە، حـەپســـەی خێزانی یاســـینی کردبووە ژوورێکەوە، دەرگەکـەیـان داخســتبوو، حەپســە لە پێشــەوە و منداڵەکانی تری لەبەر دەرگەکەدا دانـابوو، چونکـە دەیزانی هـەر جـارێـک لـە منـداڵـەکـانی دەدا؛ جێگەی

دەستی شین دەبووەوە یان شوێنێکی دەشکاندن. ڕۆژی پێشوو، بە ڕقەوە پەلی سـوبحی کچی ڕاکێشـا بوو، ئێسـقانی مەچەکی لە جێ بردبوو.

حەمەسـالّحی عەزەی مەمەنگ بە گەنجی یاریزانی کۆنی زۆرخانە دەبێـت، ڕۆژێـک لە بەردەم خـانەقـای مەحوی تەختەی پـاشـی عەرەبانەیەکی یایلی دەگرێت، هەرچەند سـالّحی عەرەبانچی قامچی لە ئەسپەکەی دەدات، لە شـوێنی خۆی نابزوێت، سـەد کەسـێک لێی کۆ دەبنەوە و پاشان دەست دەکرێت بە چەپلّەلێدان،

حەمەسـالّح هەندێک جار سـابوون و شـەکری دەکڕی و دەیفرۆشتنەوە، دوو سـالّ پێش ئەو ڕۆژە میرزا کەریم ئەو خانووەی بۆ بەکرێ دەگرێـت و پێنج دینـاری بە قەرز پێ دەدات تـاوەکوو کاسبیی پێوە بکات. خەلّکی لە گەڕەکی سەرشەقام و ناو بازاڕ خۆیان لێ لا دەدا و لێی دەترسـان. تەنیا حەپسـە شـیعەی دایکی یاسـین دەرەقەتی دەهات، کاتێک بە سـەریدا هاواری دەکرد، ئەو پیاوە بالاّ بەرز و بەهێزە، لە بەردەمیـدا بچووک دەبووەوە و وەکوو منـدالّ سەری دادەخست.

ئەو شـەوەی لە یاسـینی کوڕی توورە بووبوو، حەپسـەی ژنی پێی گوت: 'قەسەم وەخوا دەست لەو کوڕە بدەی، پەل ئەو مندالاّنە دەگرم و دەیانوەمۆ بۆ مالّ باوکم!'

دەسـتی بە ڕووی حەپسـەی ژنیدا هەلّبڕیبوو، لە ژێر سـمێلە ئەسـتوور و ماشـوبرنجییەکەیەوە لێوی خۆی دەگەسـت، دوای چەند هەناسـەیەک دەسـتی داگرتەوە و پشـتی کردە ژنەکەی و بۆ حەوشـەکەیان چوو، بە دەم ڕێگەوە: 'یاسـینە خوێڕی، بە ئیمام عەلی دەوێت تەعلیمت دابووەم.'

## ١٠

یاســـین لە ماڵی مامۆســـتا حەمەبۆری هاوڕێی بوو، دوای ئەوەی حەمەبۆر بۆینباخەکەی بۆ بەســت، پێی گوت: 'دەزانیت، یاســین، ئەم بۆینباخە ڕەشەی من لەگەڵ ئەو قاتە شینەی تۆدا ناجۆرە!'

'ناشـوکری نەبێت ئێسـتا بە هەردووکمان هەر ئەوە شـک ئەبەین، بۆم ببەستە و گوێ بە ڕەنگ مەیە.'

'چییە هەتیو ئەڵێیت بۆ خوازبێنیی بەهار ئەچیت؟!'

'جا کوا، بەڵام باوەڕناکەم قەت ئەوە ڕوو بدات.'

'بەینی خۆمان بێت چاک عەشقی بوویت!'

'ئینجا ناحەقمە؟'

'نازانم، بۆچی زۆربەی گەنجی ئەو شـــارە، بەهارتان لێ بووە بە پەریی خودا.'

'پەرییش حەدی نییە ئەوەندە جوان بێت.'

'کە واتە ئەمڕۆ دێم لەگەڵت!'

'ناماقووڵیت کرد.'

'بۆ هەتیو، پێت وایە ئەگەر من ببینم ئیتر ڕەنگی کاڵ ئەبێتەوە، ئەترسم ئەگەر بوو بە هاوسەرت بۆم نەبێت بێمە ماڵەکەت و دڵت لێی پیس بێت!'

'ژنی جوان قەت بە تەنیا موڵکی پیاوێک نییە!'

'ئەم قسەیەت لە کوێوە هێنا؟'

'لە پیاوچاکێک، مام زامن.'

'مام زامن کێیه؟'

'نوقڵفرۆش!'

'ناویم نەبیستووە.'

دوای ئەوەی ئەمەی بە حەمەبۆر گوت، لە دەرگەی ماڵەکەیان هاتە دەر و بەرەو ماڵی بەهار کەوتە ڕێ، بە دەم ڕێگەوە بەردەوام ئەوەی لە بەر خۆیەوە دووبارە دەکردەوە: 'بەهار خان من تۆم خۆش ئەوێت، یان بەهار گیان من حەزم لێ کردوویت.'

بەهار چاوەڕوانی یاسینی دەکرد، چونکە دەیزانی ئەگەر هەواڵێکی جەلال هەبێت دەبێت لە یاسینەوە پێی بگات، تەنانەت هەستیشی بەوە کردبوو، کە شتێک هەیە و یاسین لێی دەشارێتەوە.

غالب عەربەتیی باوکی بەهار دەیزانی کە کوڕانی شار هەموو وەکوو پوورەهەنگ دەورەیان لە ماڵەکەی ئەو داوە، بەڵام لەوەش دڵنیا بوو، کە کچەکەی دەتوانێت تەنیا دڵ بە یەکێکیان بدات.

دایکی بەهار باسی ئەوەی بۆ غالبی مێردی کردبوو، کە بێجگە لە جەلالی میرزا کەریم کچەکەیان چاوی بە دوای هیچ کوڕێکەوە نییە.

غالب عەربەتی دۆستی ماڵی میرزا کەریم بوو، هەرچەندە نەخوێندەوار بوو، بەڵام بۆ بیست ساڵ دەچوو پەیوەندیی لەگەڵ غەفووری میرزا کەریمدا هەبوو، یەکێک بوو لە هاوڕێ باوەڕپێکراوەکانی غەفوور، هەموو جارێک غەفوور بە غالبی دەگوت، ئەگەر تۆ خوێندەوار بوویتایە، ئەوەندە پاک و دڵسۆزی، دەبوویتە سەرکردەمان.

یاسین لە بەر بەلەدێکە پرسیاری غالب عەربەتیی کردبوو، سەوزەفرۆشێک لەبارەی غالب عەربەتییەوە گوتبووی: 'یەحیای باوکی غالبیش هەر شیوعی بوو، یەکێک بووە لە دامەزرێنەرانی

یەکێتیی جووتیاران و با بڵێین، جەمعییەی فەلاحینی عەرەبەت و کاتی خۆی لە خۆپیشاندانی جووتیاراندا لە عەرەبەت بەشدار بووە!'

کاتێک گەیشـــتە بەردەم دەرگەی گومرگەکە، قوبادی پۆلیس لە ناکاو هاتە بەردەمی و پێی گوت: 'ئیشـی نهێنی بە پیاوی ترسـنۆک ناکرێت، دوایی ئەزانیت باجەکەی چەند قورسە.'

قوبادی پۆلیس ئەمەی گوت و مامۆستا یاسین لێی چووە پێشـەوە و پێی گوت: 'ئەرێ تۆ باسـی چی ئەکەیت، ئیشـی نهێنیی چی و شتی چی؟'

'بە خودا جوانە، ئەوە تەربییەتی پارتییەکانە، لەسـەر دیوارەکان بە ڕەنگی سـوور ئەنووسـن، بژی یان بڕووخێت حکومەت، بەو جۆرە بە بەردێک دوو چۆلەکەی ئەکوژن!'

'کاکە قوباد تۆ باسی چی ئەکەیت؟'

قوبادی پۆلیس پیاوێکی کورتەباڵا بوو، قاتێک ڕانکوچۆخەی ڕەشی لە بەردا بوو؛ خۆی هەڵبڕی و هاتە سەر نووکی پێکانی و دەموچاوی لە مامۆسـتا یاسـین نزیک کردەوە و بە چرپە پێی گوت: 'ئێوەی پارتی ئەگەر یەک تۆز غیرەتتان تێدایە، ئەو ئیشـانە بە ناوی خۆتانەوە بکەن، قوڕەکە بۆ شـیوعییەکان خەسـت مەکەنەوە و خۆتان وەک بەرزەکی بانان بۆی دەربچن، شـۆڕش بە پیاوی ترسـنۆک و دووڕوو سـەر ناکەوێت!'

مامۆسـتا یاسـین هیچ وەڵامێکی قوبادی حەیتەی نەدایەوە، ویستی پێی بڵێت، کە ئەو ئاگاداری ئەو شـتانە نییە، بەڵام دەمی تەتەڵەی کرد و تاوەکوو قوبادی پۆلیسیش لێی دوور کەوتەوە، بێدەنگ لە دوورەوە لێی دەڕوانی، ئەژنۆکانی دەلەرزین، شەلالی عارەق بوو، هەناسـەی لە

سینگیدا پەنگی خواردبووەوە، بە لاچاوێک لە دەرگەکەی ماڵی بەهاری ڕوانی، هەناسـەیەکی هەڵکێشـا و بە ڕاکردن، وەک بڵێی یەکێک بە دوایەوە بێت، خۆی گەیاندە خانەقای مەولانا خالید و دەموچاوی شووشت و بۆینباخەکەی لە ملی کردەوە.

دیسـان بەهار لەو خەیاڵ و ترسـەی دایبڕی، کاتێک لە مزگەوتەکە چووە دەرەوە، وەک ڕۆژانی پێشوو لە بەردەم دەرگەی مزگەوتەکەدا ڕانەوەسـتا و لە سـەعاتەکەی دەسـتی نەڕوانی، بێ بیرلێکردنەوە بۆ بەر دەرگەی ماڵی غالب عەربەتی چوو، بۆینباخەکەی بە لوولکراوی گرتبوو بە دەسـتەوە، بۆنی ئارەقی جەسـتەی خۆی دەکرد، لە ڕێگە بەردەوام دەستی بە قۆپچەی چاکەتەکەیەوە بوو، دایدەخستن و پاش چەند هەنگاوێک دیسـان دەیکردنەوە، گەیشـتە بەر دەرگەکە، هەردوو دەسـتی خسـتبووە گیرفانی، بێدەنگ بەرامبەر دەرگەکە ڕاوەسـتا، لە قووڵاییی ڕەنگی سـەوزی دەرگەکەدا ئەوەی دەخوێندەوە، ئەو دێڕەی لە نامەکەی جەلالدا نووسرابوو، حەزی دەکرد خۆی ئەوەی بە بەهار بگوتایە، لە بەری کردبوو... لە بەر خۆیەوە گوتیەوە:

'ئەگەر ئەم جارە بێمەوە، ژوورێکت لە شـار، لە دڵمدا بۆ چراخان ئەکەم، شـەوڕۆژ ڕووناک بێت بەهار، تا پێکەوە پیروخەڕۆ ئەبین، شیعرت بۆ ئەهۆنمەوە.'

زۆری پێ چوو، کە لەو خەیاڵەی بە ئاگا هاتەوە، لە بیری چوو چەند بوو لە بەر دەرگەکەیاندا ڕاوەسـتابوو، ڕسـتەی سـەرەتای نامەکەی جەلالی گۆڕیبوو بە؛ بەهار ئەگەر تۆ پێم ڕازی بیت...

دەستی لە گیرفانی دەرهێنا و هێواش سێ جار بە پشتی دەستی لە دەرگەی دا، لەو کاتەدا وەک بڵێیت لە شـتێک پەشـیمان بێت، لە چواردەوری خۆیی دەڕوانی، هەرچەندە لەو کۆڵانە کەسـی لێ نەبوو،

بەڵام ئەو هەستی دەکرد هەموو چاوەکانی ئەو شـاره لێی دەڕوانن. بە لاجانگەکانیدا دڵۆپ دڵۆپ ئارەق دەتکانە سـەر کراسـەکەی، بە بۆینباخەکەی دەسـتی ئارەقەی دەموچاو و ملی سـڕی، لە دەسـتی ڕاستی شەقامەکەوە عەرەبانە و ئەسپێکی بینی، هەنگاوێک هاتە دواوە و ڕووی کردە شـەقامەکە و ویسـتی بپەڕێتەوە و بڕوات، لەو کاتەدا سـاڵحی عەرەبانچی بە خۆی و عەرەبانە و ئەسـپەکەیەوە گەیشـتە بەردەمی، سـاڵح دەسـتی بۆ بەرز کردەوە و گوتی: 'ماندوو نەبیت، مامۆستا یاسین.'

دوای ئەوەی خۆی ڕاسـت کردەوە و قوڕگی پاک کردەوە: 'چۆنی مام ساڵح.'

هێشـتا ئەو لە عەرەبانە پایلییەکەی دەڕوانی، خوێندییەوە، کە لەسەر بۆردێک بە سپیی نووسرابوو: 'السليمانيه، ژمارە ٢.'

لە پشـتییەوە بەهار دەرگەکەی کردبووەوە و بە دەنگێکی ناسک و شەرمنانە، گوتی: 'فەرموو!'

کاتێک دەنگەکەی هاتە بەر گوێ، لە شـەرماندا ویسـتی ئاوڕ نەداتەوە، دیسـان ئەوەی بە خەیاڵیدا هات، کە چی بە بەهار بڵێت، هەواڵی باوکی یان مەبەستی دڵی خۆی. ئاوڕی دایەوە و دوای ئەوەی قوڕگی دیسان پاک کردەوە: 'بەهار خان.'

ئەوەندەی پێ گوت و لە بەهاری ڕوانی، ماکسییەکی ڕەشی تەسکی لە بەردا بوو، سـینگی ڕووت و مەمکەکانی دەرپەڕیبوون، قژی ڕەش و خاوی بە سـەر شـان و سـینگە ڕووتەکەیدا پەخشـان بووبوون، ماکسییەکەی لەسـەر سمت و ناو قەدیدا بە جەستەیەوە نووسـابوو، قۆڵی تاوەکوو سـەر شـانەکانی ڕووت، پێش ئەوەی مامۆسـتا یاسین بێت لە دەرگەکەیان بدات، بەهار لە قاتی سـەرەوەی باڵاخانەکەیانەوە

قژە کاڵ و لوولەکەی مامۆسـتا یاسـین دەبینێت، لەو کاتەدا داوا لە دایکی دەکات و پێی دەڵێت: 'دایکە گیان، ئەگەر گوێت لە تەقەی دەرگەکە بوو، ئەوا تۆ گوێی مەیەرێ و خۆم ئەچم ئەیکەمەوە.'

'ئێی کچی خۆم، دەردی دڵ ئەوەندە گرانە، ئیتر ناتوانم هیچت پێ بڵێم.'

دوای ئەوەی دایکی ئەمە بە بەهار دەڵێت، وەڵامی دایکی ناداتەوە و دەچێت خۆی دەگۆڕێت و قژی دادەهێنێت، پاشان لە حەوشەکەیاندا چەپکێک ڕێحانە ڕەشە دەڕنێت و بە سەر سینگ و گەردنیدا دەهێنێت، دەرگەکە دەکاتەوە و چەپکە ڕێحانەکەی لە ناو دەست دەبێت.

مامۆستا یاسین لە لای ڕاست و چەپی شەقامەکەی ڕوانی و خێرا و وەک لە گوتنی پەلەی بێت، شـێوەی ورچێکی بێئارام بەردەوام خۆی بە ڕاست و چەپدا دەخست، زووزوو بۆینباخەکەی دەستی بە ناوچەوانیدا دەهێنا، ئەوەندە لە بەهار هاتبووە پێشەوە، هەستی دەکرد نێو سینگی پڕ بووبوو لە بۆنی ڕێحانە، پاشان دەستی توند بە لێواری دەرگەکەوە گرت و گوتی: 'بەهار خان، کاک غالب بەو نزیکانە بە ساغوسەلامەتی دێتەوە!'

'نامیق ئاغا و کاک عەزیزی میرزا کەریم لێرە بوون و گوتیان، هیچ هەواڵێکی نییە، ئەوەندە نەبێت، کە بە برینداری لە خەسـتەخانەی عەسکەریی حامییەکەیە!'

'بەڵێ، بەڵێ، قابیلە خۆ باوکت چ تاوانێکی کردووە، چارەسـەری بۆ ئەکەن و ئەیهێنێرنەوە ماڵەوە.'

'دەی مامۆستا، خوازیارم قسەکەی تۆ ڕاست بێت.'

تاوێک بێدەنگ بوون و لە یەکتریان ڕوانی، بەهار گوتی: 'وا بزانم شتێکی تر هەیە کە پێویستە پێمی بڵێیت؟!'

'بەڵێ، دڵم چووەتە سەرت و حەزم لێت کردووە.'

بەهار ماســـوولکەکانی دەموچاوی هێنایەوە یەک و تۆنی دەنگی خۆی گۆڕی و گوتی: 'ئای، تۆ کە کوڕێکی چاوقایمیت، ئێســـتا کاتی ئەوە بوو؟!'

'ئەی نازانم...'

'بە زمانی خۆت، حەزت لێم کردووە.'

'زۆر زۆر...'

'ئێ، ئێ، تێ گەیشتم مامۆستا!'

دوای ئەوەی بەهار ئەمەی لە ژێر لێوەوە پێ گوت، مامۆستا یاسین ســـەیری ئەملا و ئەولایی کرد و لەوە زیاتر هیچی نەگوت، بەهار دەستی برد و دەستی خستە ناو دەستی، دەستی گوشی و چەپکێک ڕێحانەی لە ناو دەستیدا بەجێ هێشت، پاشان لە چاوی ڕوانی و پێی گوت: 'بەڵام...'

مامۆستا یاسین هەنگاوێک لێی دوور کەوتەوە: 'بەڵام چی؟'

'بەڵام... مەبەستم، تەواو، ئەوەی لە دڵتدا بوو گوتت؟!'

پاشـــان ســـەری داخســـت و بۆنی بە ڕێحانەکەی دەســـتییەوە کرد، وەک شـــتێکی بیر کەوتبێتەوە، بێ ئەوەی لە بەهار بڕوانێت، لە ژێر لێوەوە و خێرا گوتی: 'بەڵێ، بەڵێ، ئەوەی ویستم پێم گوتی.' زیاتر لە بەهار دوور کەوتەوە.

'مامۆستا تۆ ئەوە ئەزانیت، کە مرۆڤ تەنیا یەک دڵی هەیە؟!'

'حەتمەن.'

'باشە مامۆستا، منیش قەدری ڕازی دڵی تۆ دەگرم!'

وەڵامی نەدایەوە و پشـــتی کردە بەهار و خێرا دەســـتە ڕاســـتی شۆستەکەی گرتە بەر. خێرا دەڕۆیشت و هەندێک جار ڕێکردنەکەی

له ڕاکردن دەچوو، کاتێک گەیشـــتە کۆتایی کۆڵانەکە، پێش ئەوەی ئاوڕ بداتەوە، بیری لەو قســـەیەی کردەوە، کە بە بەهاری گوتبوو، پاشـــان لە بەر خۆیەوە و بە دەنگی بەرز چەند جارێک گوتی: 'نیازی دڵی خۆم پێ گوت.'

ئاوڕێکی دایەوە و خێرا دەســـتێکی بۆ بەهار بەرز کردەوە، کە تا ئەو کاتە هێشتا لە ناو دەرگەکەدا ڕاوەستابوو.

سـەر شیوی قازیی بەجێ هێشت، وەک بڵێیت کەسێک بە دوایەوە بێت، یان لە ترسی شتێک بیەوێت ڕا بکات، لەوێ ڕانەوەستا و تا بەر دووکانەکانی سەعید تەها کۆیی ڕای کرد، هەناسەبڕکێی پێ کەوتبوو، بەردەوام هەنگـاوەکـانی خێرا دەکرد و زووزوو ئـاوڕی دەدایەوە. کاتێک گەیشـتە سـەر جادەی مەولەوی، هەسـتی کرد سـەرمایەتی و بەردەوام دەلەرزی.

چووە ناو چایخانەکە و سـڵاوی کرد، عوسـمانی چایچیی وەڵامی سـڵاوەکەی نەدایەوە، پاشـان وەکوو چۆن پێشـتر بڕیاری ئەوەی دابوو، کە ئیتر زۆر قسـە لەگەڵ عوسـمانە شـەلی چایچیدا نەکات، کە مشـتەرییەکانی ناویان لێ نابوو عوسـە عەبووس. پاشـان جێگەی دانیشـتنەکەی بگۆڕێت و وەک مامۆسـتا هەڵسـوکەوت بکات. چوو لەسەر کورسیی ژێر ڕادیۆ گرۆندیگەکەدا دانیشت، ڕادیۆکە لەو کاتەدا گۆرانییەکی عەلی مەردانی لێ دەدا، بێجگە لە عوسمانە شەلی چایچیی چوار کەسـی تریش لە کورسـییەک لەولای ئەوەوە سـەریان بە سـەر یاریی تاوڵەکانیاندا شۆڕ کربووەوە. کاتێک مامۆسـتا یاسین سڵاوی لێ کردن، ئەوانیش وەڵامیان نەدایەوە، بانگی لە عوسـمانە شـەلی چایچیی کرد و داوای چایەکی کرد، عوسـمانی چایچیی لێی ڕوانی و پاشـان چایەکی هێنا و دوای ئەوەی ژێرپیاڵەکەی دانا و لەسـەر

مێزەکە خولایەوە، پیاڵەکەی بە تووڕەییییەوە لەســـەر دانا. مامۆســـتا یاسـین خۆی ڕاسـت کردەوە و لێی ڕوانی، لێوی جووڵاند و ویسـتی پێی بڵێت: 'ئەوە بۆ وەڵامی سڵاوم نادەیتەوە؟'

هەناسـەی توند بووبوو، قسـەی بۆ نەکرا و سـەری داخسـت و لە ژێر لێوەوە وەکوو لەگەڵ خۆیدا بدوێت، قسەکەی گۆڕی و پێی گوت: 'بووم بە ئەندامی یەدەکی کارگێڕیی یانەی وەرزشیی سلێمانی.'

'ئیتر خودای ئەکرد ئەبوویت بە موتەســـەریفی ئەم شـــارە، ئەوە کەیفی خۆتە و بە ڕێگەی خۆت، بەڵام ڕازی نـابم منـداڵی فەقیر و هەژاری ســـەرشـــەقـام و چواربـاخ بۆ تۆپتۆپێن و خوێڕێتی هەڵبخەڵەتێنیت!'

کاتێک عوسـمانە شـەلی چایچیی ئەمەی دەگوت، دەسـتی لەسـەر مێزەکەی بەردەم مامۆســـتا یاســـین دانابوو، ئەوەندە درێژ بوو، لە ناوقەدییەوە چەمابووەوە و لووتە زل و چاوە ڕەشـــە زەقەکانی لێ نزیک کردبووەوە، عوســـمانە شـــەل ئەمەی ئەوەندە بە تووڕەییییەوە گوت، ئەو چوار کەســـەی تر، هاتبوون و لە لایانەوە ڕاوەســـتابوون، پاشـــان عوســـمان بەردەوام بوو، گوتی: 'ئەی ئەڵێن، بەیانی زوو تا درەنگانی ئێوارە تۆ لەو مەلعەبەی ئیدارە مەحەلییت؟!'

'ئێ، خۆم ئەوێ بەڕێوە ئەبەم!'

'کوڕە بە خودا برا مەگەر تۆ و ڕەفیقەکانت بۆ خوێڕێتی لەوێ بن، مەگەر تۆش ڕەفیقی کوڕانی میرزا کەریم نەبیت؟!'

'بۆ، ئەو کوڕانە چ زەرەرێکیان لە جەنابت یاوە؟!'

'مەگەر شیوعی نەبن!'

'دە وەرە ئەم کەرە تێ بگەیەنە!' یاســـین ئەمەی لە ژێر لێوەوە گوت.

عوسمانه شەل بینیبووی، کە یاسین هاتوچۆی ماڵی میرزا کەریم دەکات و لەگەڵ جەلالدا گەلێک جار بینیبووی. هەروەها هەر کاتێک عوسمانە شەلی چایچیی پرسیاری لە عەلیی کوڕی دەکرد: 'لە کوێ بوویت؟'

کوڕەکەی لە وەڵامدا دەیگوت: 'لەگەڵ مامۆستا یاسین بووم.'

چەند مانگێک پێش ئەو ڕۆژە عوسمانە شەل بە مامۆستا یاسین و حەمەبۆر و دوو هاوڕێی تری گوتبوو: 'ڕازی نیم و ئێوە بۆتان نییە بێنە چایخانەکەم.'

لەو کاتەدا ڕەحیم موکریانی پەیدا دەبێت، وەکوو گوێی لە هەموو قسەکانی عوسمان بووبێت، وەڵامی دەداتەوە: 'دەی خاڵە گیان، گەنجی ئەم شارە ڕوو بکەنە کوێ، مزگەوت و کەسابەت، وەک جەنابت بکڕووزێنەوە و بڵێن پەنا بە خودای. ئەدی دوای ئەوە، ئێوەی کۆنەپەرست بە هیچ ڕازی نابن.'

ڕەحیم و یاسین بە توورەییەوە لە چایخانەکە دێنە دەرەوە، ڕەحیم بە دەم ڕێگەوە، دەڵێت: 'ئاوها من نەبام، ئەتۆ هیچ وەڵامێکت پێ نەدەبوو.'

'ئەی چۆن ڕەحیم گیان، خۆ بە کاڵتە من و تۆ ڕەفیق نیین!'

پاشان کاتێک گەیشتنەوە گەڕەکی سەرشەقام و بەرامبەر خانەقای مەحوی، ڕەحیم هەواڵی جەلالی لە یاسین پرسی و پێش ئەوەی یاسین هیچ بڵێت، ڕەحیم گوتی کە بۆ ماڵی میرزا کەریم دەچێت و خۆی لەوێ هەواڵی جەلال دەپرسێت، پاشان لێک جیا بوونەوە. کاتێک یاسین چووە ژوورەوە، دایکی بەردەوام بە دوایەوە بوو، چوو لە بەر تەنکی ئاوی حەوشەکەیاندا دەموچاوی بە سابوونی ڕەقی شووشت،

دایکی دەســـتی بە پشـــتیدا هێنا، بە دەســـتەکەی تری خاولییەکی بۆ ڕاگرتبوو، دوای ئەوەی خۆی گۆڕی و ویســـــتی بڕوات، دایکی پێی گوت: 'دوو کوڕ ئەو گوێنییەیان هێنابوو، گوتیان ئەوە ئەمانەتییەکەی یاسینە و پێی بڵێ؛ کە ڕەنگەکەیان بە دڵ نەبووە!'

وەڵامی دایکی نەدایەوە و تەنیـا لە گوێنییە بۆرەکەی ڕوانی، کە ئاسەواری بۆیاخێکی سووری پێوە بوو، لە خەیاڵی خۆیدا بیری لەوە دەکردەوە و بەردەوام ئەو قســـەیەی دەگوتەوە: 'ڕەنگەکەیان بە دڵ نەبووە!'

دایکی پرسیاری ئەوەی لێ کرد، کە ئاخۆ لە پاڵ مامۆستایەتییەکەیدا ئیشـــی تر دەکات، بەڵام ئەو ئەوەندە خەیاڵی تێک چووبوو، گوێی لە قسەکانی دایکی نەبوو.

## ١١

له شـــاری بیســـمارک، ئەو ئەپارتمانەی ماڵەکەمی لێ بوو دوو قات بوو، ژمارەی خانووەکەی من، ژمارە ســـێ بوو. بە ڕیزی مندا و لە دەســـتی چەپمەوە خانووی ژمارەی پێنج، ژن و پیاوێک دەژیان و چەند ســـاڵێک بوو لە دوورەوە ســـڵاومان لە یەک دەکرد، بەڵام نەمدەزانی خەڵکی کوێن و لە کوێوە هاتوون، ئەوەندە نەبێت هەستێک لە لام هەبوو کە پێ دەچێت ئەم ژن و پیاوە تورک بن. هەردووکیان باڵایان بەرز و پێســـتســـپیی و چاوکاڵ بوون. پێ نەدەچوو منداڵیان هەبێت. ئەو ڕۆژە کتێبی ســـەربازی کۆمـارم بە دەســـتەوە بوو، ماوەیەک بوو لە بیرم چووبووەوە، چەندان جار لە وێنەکانم ڕوانیبوو، مەراقم بوو بزانم چیی تێدا نووســـراوە، بێجگە لە ناونیشـــانەکەی کە خەلیل حەمدانی هاوڕێم پێی گوتبووم واتای چییە. ئەوەم بە خەیاڵدا هات؛ کە نیشانی ئەو ژن و پیاوەی دراوسێمیان بدەم، بەو نیازەوە لە پەنجەرەی ژوورەکەمەوە چاوەڕوانیان بووم.

هەرچەندە ئەو ڕۆژە یادی کوژرانی ڕەحیم موکریانی بوو، کە لە کاتی خوێندنەوەی بەیانی یازدەی ئازاری ســـاڵی ١٩٧٠دا، لە نزیک باخی گشـتی لە ئۆتۆمبێلێکی ســەربازییەوە تەقەیان لێ کردبوو. ئەوە لە کاتێکدا دەبێت، کە لەگەڵ بیســتنی هەواڵی بەیاننامەکەدا ڕەحیم دڵی گەرم دەبێت و بە بەرد هێرش دەکاتە سەر ئەو ئۆتۆمبێلە سەربازییەی بە ڕێکەوت لەوێوە تێ دەپەڕێـت. بە داخەوەم من لە کـاتێکـدا ئەو هەواڵەم بیســـت، کە مانگێکی بە ســـەردا تێپەڕی بوو. دواتر چووم و

ســـــۆراخی گۆڕەکەیم کرد، بەڵام لەبەر ئەوەی ڕەحیم موکریانی، لە هیچ جێگەیەک ناوی تۆمار نەکردبوو، ئەو ساڵانەی لە سلێمانی بوو، هەر بێ شـــوناس مابووەوە، لەبەر ئەوە شـــارەوانی بە ناشـــتنی تەرمەکەی هەستابوون و گۆڕی ئەو هاوڕێیەمیان لێ ون کردم.

منیش ســـاڵانە یادی ڕەحیم دەکەمەوە، هاوڕێیەکی ڕۆحیم بوو. پێش ئەو ڕۆژانە بە ڕێکەوت لە سلێمانی بووم و داوای لێ کردم؛ کە لەگەڵ خۆم بۆ بەغدای ببەم، بە داخەوەم، کە ئەو ڕۆژە بە گوێم نەکرد. لەکاتێکدا دەمزانی، دڵیان شـــکاندووە و لە خەڵکی ئەو شـــارە توورەیە، دوای ئەوەی دوو کەسی نەناس، پەلاماری دەدەن و بە زۆر لاقەی دەکەن. یادکردنەوەی من بۆ ڕەحیمە شـــێت، یان وەک خۆی حەزی دەکرد پێی بڵێین ڕەحیم موکریانی، داگیرســـاندنی مۆمێک و خوێندنەوەی ئەو شـــیعرانەیە، کە ئەو حەزی لێیان بوو. بەبیرم دێت ســـاڵی ١٩٥٧ لە لافاوەکەدا، ڕەحیم بێســـەروشـــوێن بوو، ناومان لە لیســـتی ونبووندا تۆمـار کرد و پرســـەمـان بۆ گرت، بەڵام دوای هەفتەیەک لە نیوەی شـــەودا لە دەرگەی ماڵی ئێمەی دا، پێی پەتی و جلەکانی قوڕاوی بوون، پێی گوتین گوایە لافاوەکە ئەوەندەی دوور بردووە، هەفتەیەکی پێ چووە تاوەکوو بە پێ گەیشتووەتەوە شـاری ســـلێمانی. ســـاڵی ١٩٧٥ لە زۆربەی شـــار و گوندەکانی ناوچەی موکریان پرسیاری ناو و ناونیشـانیم کرد، بەڵام کەس ڕەحیم سـابیر موکریانی نە دەناسی.

هێشـــتا خەیاڵم لای یادەوەرییەکانی ڕەحیم بوو، چاوم لێ بوو، دراوســـێکەمان ئۆتۆمبێلەکەیان ڕاگرت و دابەزین. چوومە دەرەوە و بەرەو ڕوویان چووم، کتێبەکەی سەربازی کۆمارم بە دەستەوە بوو، دوای ئەوەی ســـڵاوم لێ کردن، بە ئینگلیزی پرســـیم کە ئایا ئێوە

تورکن. له یەک کاتدا... پیاوەکە گوتی بەڵێ و ژنەکە گوتی نەخێر کوردین.

منیش پێکەنیم و پێم گوتن: 'ئێستا ئێوە تورکن یان کوردن؟ خۆتان یەکلایی بکەنەوە و دڵنیا بن کورد بن یان تورک هیچ مەبەستێکی خراپم نییە.'

'بەڵێ، کوردی تورکیاین.'

کاتێک پیاوەکە ئەمەی گوت، لە ژنەکەی دەڕوانی، ژنەکەش پرسیی: 'دیارە تۆش کوردیت؟'

'بەڵێ کوردم.'

'ئەوە ئێمە گفتی ئەوەمان بە یەک دابوو، نەڵێین کوردین، تا لەگەڵ کەس تووشی نیقاش و گرفت نەبین!' پیاوەکە ئەمەی بە کوردی گوت.

'ئەی مەگەر ئێستا تۆ لە ئەمریکای ئازاددا ناژییت، خۆ لە تورکیا نیت و پێویست ناکات ترست لە هیچ کەسێک هەبێت، ئەوە مافی خۆتە لێرە بە ئاشکرا بڵێیت کوردم.'

'حەمید لەوە دەترسێت بەرەو ڕووی تورکان ببێتەوە، دەڵێت تاقەتی شەڕم نییە.'

ژنەکە ئاوای گوت و پیاوەکە دەستی بۆ درێژ کردم و گوتی: 'من ناوم حەمیدە.'

ژنەکەش گوتی: 'منیش زەکییە.'

'جەلال میرزا کەریم.'

کتێبەکەم بەرەو ڕوویان ڕاگرت: 'ئێوە ئەزانن نووسینی تورکی بخوێننەوە.'

پێکەوە و لە یەک کاتدا: 'بەڵێ.'

کتێبەکەم دایە دەستـــی پیاوەکە: 'ئەگەر هاوکاریم بکەن و هەندێک لە نووسینەکانی نێو ئەم کتێبەم بۆ بکەن بە کوردی.'

دوای ئەوەی چاوی بە نێو لاپەڕەکانی کتێبەکەدا گێڕا، گوتی: 'ئەوە یادەوەریی جەندرمەی تورکانە.'

'لەوە ئەچێت، ئینجا منیش لەبەر ئەوە ئەمەوێت بزانم.'

'دەی پســـــام بۆچی نەچین لە ماڵی ئێمە چایی بخۆینەوە و بە ئیسـراحەت پێکەوە سـەیری بکەین.' حەمید ئەمەی گوت و پێشـمان کەوت.

منیش لە دواوە بانگم لێ کرد: 'ماڵی من نزیکترە، بە دەســـتووری کوردەواریش بێت، نابێت بە سەر ماڵەکەی مندا هەنگاو بنێین و بچین بۆ ماڵی ئێوە.'

زەکییە پێی گوتم: 'دەی برا، ئەو مـاڵەی ئێمە کـەیـبانووی لێیە و ئاوەدانە.' پێکەوە پێکەنیین.

حەمید و زەکییە، بێجگە لەوەی باســـی دەردیســـەری خۆیانیان بۆ کردم، پوورزای یەک بوون و خەڵکی شـــاری وان بوون. زیاتر لە بیســت سـاڵ پێکەوە لە زیندان بووبوون. زەکییە کراسـەکەی بەری هەڵماڵی و سـینگی پێ نیشـان دام، لە زیندان سـەر گۆی هەردوو مەمکیان بڕیبوو. حەمید کابرایەکی کەمدوو بوو. زەکییە ئەوەشـی پێ گوتم، کە پیاوەکەیان خەسـاندووە. مەبەسـتی لەوە بوو... کە هەردوو هێلکەگونی حەمیدیشیان دەرهێناوە. پێیان گوتبوون... با ئێوە نەوەتان لە دوا بەجێ نەمێنێت. بە پێکەنینەوە باســیان لێوە دەکرد، پاشـان حەمید گوتی: 'خۆ پێویسـتیی بەوە نەدەکرد، چونکە خۆمان بە نیازی وەچەخستنەوە نەبووین!'

قسه و باسمان چەندان ڕۆژ و شەوی خایاند، کە هەستم کرد کاریگەرییان لەسەر باری دەروونیم کردبوو، یان دەتوانم بڵێم لە چاو ئەو چیرۆکانەی ئەوان دەربارەی ڕژێمەکانی تورکیا باسیان لێوە دەکرد، ڕژێمە یەک بە دوای یەکەکانی عێراق لە چاویاندا فریشتە بوون.

پاشان حەمید و زەکییە ئاوا کتێبەکەی سەربازی کۆماریان بۆ کردم بە کوردی کورمانجی، ئەوان بە دەمی واتاکانیان پێ دەگوتم و منیش لە دەفتەرێکدا دەمنووسینەوە.

ئەوەی سەرنجی ڕاکێشام و لە بینینی یەکەم وێنەی سەر بەرگەکەیەوە لێی بە گومان بووم ڕاست دەرچوو. هاتنەسەردەسەڵاتی بەعسییەکان و دواتر عەبدولسەلام عارف و ئەو تاوانانەی ساڵی ١٩٦٣ لە کوردستان ڕوویان دا، بە تایبەتی لە سلێمانی، کە دەستی تورکیای تێدا بووە، بەڵکوو بە کردار و تەنانەت هاوکاریی سەربازییشیان کردووە. ئێمە لە سلێمانی تەنیا ناوی زەعیم سدیقمان بیستبوو، هەروەها ئەم دوو ئەفسەرە پلەدارە کوردە: نورەدین مەحموود و فوئاد عارف، کە هاوڕێی نزیکی عەبدولسەلام عارف بوون و بە نهێنی لە گەلێک تاواندا بەشدار بوون، بەڵکوو نەماندەزانی، کە زەعیم سدیقەکان زۆر بوون.

چەند یادەوەرییەکم لە کتێبەکەی سەربازی کۆمارەوە وەک خۆی لەسەر چەند پەڕەیەک نووسیبوو، کە ئەمە نموونەیەکیەتی:

'بیستی مانگی چواری ساڵی ١٩٦٣ بوو، سەعات یازدەی تەواوی شەو بە دوو فڕۆکەی مەدەنی گەیشتینە فڕۆکەخانەی بەغدا، ژمارەی ئەوانەی لە فڕۆکەکان دابەزین شەست و پێنج کەس بووین، کە

هەموومان جلی ئاساییمان لە بەردا بوو، دوای ئەوەی بە ڕیز چووین و لە ناو پاسەکاندا دانیشتین. کەلوپەلەکانمان لە فڕۆکەکان داگیران و لە دوو سەیارەی بارهەڵگری سەربازی بارکران و بە جیا بەرەو وەزارەتی بەرگری بەڕێ کەوتن.

دەرەوە و ناو هۆڵی فڕۆکەخانەکە بێجگە لە سەربازی تایبەت کەسی تری لێ نەبوو، لە هۆڵی چاوەڕوانیدا خواردنمان بۆ ئامادە کرابوو، بە جۆرێک، وەک ئاهەنگی ڕۆژی لەدایکبوونمان بێت. دوای نانخواردن بە چوار ئۆتۆمبێل بەڕێ کەوتین، گەیشتینە ئەپارتمانێک، چاوساغەکانمان پێیان گوتین، ئەمە وەزارەتی بەرگریی عێراقە.

وەکوو چۆن لە ئەنقەرەوە لەسەر ئەوە ڕێک کەوتبووین، کە ئێمە لەگەڵ هیچ کەسێک بێجگە لە هاوڕێکانی خۆمان پەیوەندی نەگرین و قسە نەکەین، ئەگەر ڕێک کەوت و پەیوەندی دروست بوو، لە کورتی دەیبڕیتەوە یان باسی فیلم و ئەدەب و مۆسیقا و دین دەکەین. ئێمە بە سەر چوار گرووپدا دابەش بووبووین، کە هەر گرووپە و کەسێک یان دووان سەرپەرشتی و ڕێنماییان دەکردین، چاوساغەکانمان زمانی عەرەبییان باش دەزانی. کە ژمارەیان هەشت کەس، دووانی تورکمانی و شەشیان کورد بوون.

لە ئەپارتمانی وەزارەتی بەرگری لە نهۆمی سێ، جێگەمان بۆ ئامادە کرابوو، دوای ئەوەی چوار شەو لەوێ ماینەوە، جلی سەربازی عێراقییان بە سەردا دابەش کردین و کلاشینکۆف و پێداویستییان پێ داین، پاشان بە قافڵەیەکی سەربازی بەرەو کەرکووک بە ڕێ کەوتین، دوای چوار سەعات گەیشتینە خوارووی کەرکووک و لە سەربازگەیەک دابەزین، کە پێنج کیلۆمەترێک لە کەرکووکەوە دوور بوو.

لەوێ تێکەڵ بە سەربازە عێراقییەکان بووین، کەس نەیدەزانی کە ئێمە لە تورکیاوە هاتووین و لە ڕاستیدا ئەفسەر و میتی وڵاتی تورکیاین. ئێمە بۆ ئەوە هاتبووین؛ تاوەکوو ئەفسەر و کەسانی هەواڵگری ڕژێمی نوێی عێراق ڕابهێنین و مەشقیان پێ بکەین، کە بۆ دوو مانگێک دەبوو دەسەڵاتیان گرتبووە دەست. کاتێک ئێمە گەیشتین، تیمێک پێش ئێمە و لە ڕۆژانی ڕاپەڕینی بەعسییەکاندا بە نهێنی لە هەمان سەربازگە بووبوون، نزیکەی دە ئەفسەر و سەربازی ئەمریکایی و ئینگلیز بوون، کە هاوکار بوون بۆ لابردنی دەسەڵاتی عەبدولکەریم قاسم، کە دۆست و هاوپەیمانی ڕووسیا بوو. ئەوەی لەو سەربازگەیەدا دەگوزەرا دەبووایە نهێنی بووایە، شوێنێکی تایبەت و سەربازی ئاسایی لێ نەبوو. ئێمە و عێراقییەکان لەوێ هەموو ئەفسەری دەرەجەدار بووین.

ئەوەی ئێمەی گەیاندبووە عێراق، سەرهەڵدانی کوردەکان بوو، هەروەها ڕێنمایی ڕژێمی نوێ بۆ بەرەنگاربوونەوەی کۆمۆنیستەکان، کە بە قسەی ڕژێمی نوێی عێراق لایەنگریان لە سەددا شەست بۆ حەفتای خەڵک هەبوو. وەکی تر حکومەتی نوێ دەسەڵاتی بە سەر تەواوی عێراقدا گرتبوو، تەنیا ناوچە کوردییەکان نەبێت، ئەوسا ئاوایان لە ئێمە گەیاند. کە لە هەموو شار و گوندە کوردنشینەکان حکومەت هیچ دەسەڵاتێکی نییە و چەکدارە جووداخوازەکان، هەموو دامودەزگە حکومییەکانیان تاڵان کردووە و لە کاتی گۆڕینی دەسەڵاتدا دەستیان بە سەر هەموو سەروەت و سامانی بانکی عێراقدا گرتووە.

دوای مانگ و نیوێک لێدوان و ڕاهێنان؛ کە لەو ماوەیەدا دەسەڵات لە عێراق گۆڕا... بەڵام ئێمە دواتر دەربارەی ئەوە بیستمان، کە هیچ

کاریگەریی لەسەر سیاسەت و پلانەکانی ئێمە و دەزگەی سەربازیی عێراقیش نەبوو.

لە ڕۆژی هەژدەی مانگی شەشی ١٩٦٣دا دابەش بووین بە سەر دە گرووپدا، من و پێنج هاوڕێم بەرەو شاری سلێمانی بەڕێ کراین، هاوەڵەکانی ترم بۆ شار و شارۆچکەی تری ناوچە کوردنشینەکان چووبوون. ئەو شەوەی گەیشتینە سەربازگەیەک لە ناو شاری سلێمانی، لە گەلێک جێگە تاوەکوو بەیانی دەنگی تەقە دەبیستران.

کاتێک جێگەیان بۆ دابین کردین، خێمەیەک بوو لەسەر دیوی ناوەوەی نووسرابوو: 'ژیانی سەرباز هیچ نهێنییەکی تێدا نییە.'

هاوەڵەکەمان کە عەرەبیی دەزانی بۆی کردین بە تورکی، شەش کەس بووین، یەکەم شەو، کە لە کەرکووکەوە بۆ ئەو سەربازگەیەی سلێمانی هاتبووین، ئەو دێڕەمان لەسەر چادرەکەمان بینی، چەند جارێک نووسینەکەمان خوێندەوە، لە نێو خۆماندا گوتمان، کە واتە ژیانی سەرباز لە تورکیا جیاوازە، چونکە ئێمە دەڵێین: 'ژیانی سەرباز پڕە لە نهێنی.'

زۆر ماندوو بووین، لەسەر جێگەی خەوەکانمان شەڕمان بوو، هەموومان پەناگەیەکمان دەویست و کەسمان نەیدەویست لە پەڕەوە بێت، نەوەک هێرش بکەنە سەرمان، وەک چۆن پێمان گوترابوو، کە شارەکە پڕە لە چەکدار یان خۆتان دەزانن و ئەزموونتان لەگەڵ کورداندا هەیە... کە ژن و پیاو و منداڵ و بگرە پیرەکانیشیان چەکدار و شەڕکەرن. کاتی خواردنوەرگرتن بۆمان دەرکەوت کە لەسەر چادرەکانی تر نووسینی لەو جۆرە نووسرابوون، بۆ نموونە: 'چەکەکەت زمانتە و ویژدانتە!'

ڕۆژی بیستی شەش قەدەخەی هاتوچۆ ڕاگەیەنرا، پێش ئەوەی لە سەربازگەکەمان دەربچین، هەموو ئەفسەر و سەربازەکانیان کۆ کردنەوە و ئەفسەرێکی دەرەجەدار، بە ناوی سدیق مستەفا قسەی بۆ کردین، ئەوەندە بە تووڕەیی و بە پەلە قسەی دەکرد هاوەڵەکەمان فریای وەرگێڕانی نەدەکەوت، لە کاتێکدا کە مەجبوور بوو بە چپە چپ بە ئێمە بڵێت، من ئەوەندەی تێی گەیشتم، کە ئەویش لە کۆتایی قسەکانیدا بوو: 'ئێوە، ئەرکی سەربازیی خۆتان بەرامبەر بە دوژمن جێبەجێ دەکەن.'

هاوەڵێکم گوتی: 'تەواوە قوربان، دوژمنی ئێوە، دوژمنی ئێمەشە، دەی بۆ وەستاوین؟ با بیاننێرین بۆ جەهەننەم.'

دوای سەعاتێک، من و دوو هاوەڵم لەگەڵ قافڵەیەک، کە نزیکەی سەد کەس دەبووین، بە چواردەوری شاردا و پاشان بە ناو شاردا گەڕاین. دوای لێدوان و وەرگرتنی ڕای ئێمە، بە ئەفسەری لێپرسراومان گوت؛ کە هەموو ئەو کۆڵانانەی دەکەونە سەر شەقامە سەرەکییەکان، سەربازیان لێ دابنرێت، تاوەکوو شار بە سەر چەندان ناوچەدا دابەش بکەن، پاشان چاودێریی تەواوی دەرەوەی شار بکرێت و کەس نەتوانێت لێی دەربچێت و هێزی چەکداریش ڕێگەی هاتنی بۆ ناو شاری نەبێت. دوای ئەوە گەڕەکەکان بە گوێرەی ئەو شەقامانەی پێیاندا تێپەڕ دەبن، پەلامار بدرێن.

لەو کاتەدا بێجگە لەو سەربازانەی لە چواردەوری شار بوون، یان لە هەندێک جێگە بنکەیان دامەزراندبوو، لە ناو شاردا هەرپێنج ماڵ و سەربازێکی بەردەکەوت، پاشان من و هاوەڵەکانم لەگەڵ چەند ئەفسەرێکدا لە ناوەڕاستی شار بووین و بە شانی یەکەوە

ڕاوەستابووین. لە چەند جێگەیەکی دوور دەنگی گوللە دەبیسترا، هەر جارێک ســـەربازەکانی چواردەورمان گوێیان لە دەنگی گوللەکان دەبوو... بە تایبەتی کە لە نزیکمان دەتەقێنران، ڕاســـت دەبوونەوە و دەســـتیان بە تفەنگەکانەوە بەرز دەکردەوە، چاوەڕوانی فەرمانی فەرماندەکەیان بوون، تا لەوێوە بۆ ناو کۆڵانەکان بچن، کە زیاتر لە هەزار سەرباز دەبوون و کرابوون بە گرووپی دە کەسییەوە و ئامادە بوون. ســـەربازەکان لە نێوان خۆیاندا چپە چپیان بوو، وەک خۆیان یەکلایی کردبێتەوە ئاخۆ چی بکەن.

من و هاوەڵەکانم هەموو شـــارە کوردنشـــینەکان چووبووین. ئێمە هەردەم ئەوەمان دەزانی، کە چی بکەین و چۆن هەڵســـوکەوت بکەین، پێویســـتمان بە فەرمانی کەس نەبوو، ئەوە یاســـایەکی نەگۆڕ بوو، هەموو سەربازێک دەبووایە بیزانێت.

دوو هاوڕێکەم خەڵکی سێواس و بە مەزهەب عەلەوی بوون، دەنیز و عەلییـــان نـــاو بوو، بەڵام ئەوە تەنیـــا من دەمزانی، منیش بیرات مســـتەفا، کوڕی مەلایەکی حەنەفی مەزهەبی خەڵکی ئیزمیرم، ئەوە تەنیا نهێنیی نێوان ئێمە بوو.

باش بە بیرم دێت؛ هەموو جارێک پێش ئەنجامدانی کارێک، گاڵتە و گەپمان دەکرد... ئیتر نازانم لە ترســـاندا بوو یان چی بوو. دەنیز لە نێوانماندا بوو، لە بەر خۆیەوە گوتی: 'کوڕینە، گریمان... ئەگەر ئێســـتا ئێمە بۆمان هەبێت و لەگەڵ ئەو ســـەربازانەدا بدەین بە ســـەر ئەو ماڵانەدا چی دەکەین؟'

عەلی گوتی: 'ئەگەر تفەنگمان لە ماڵەکەدا دۆزییەوە، بەو بیانووەوە گەورە و بچووکیان دەکوژین!'

دەنیز، زۆر جار دەیکردە قۆشمە و پێکەنین، گوتی: 'هەر لەگەڵ لە ماڵەکەدا خاچتان بینی، دایکیان بگێن.'

تاوێک بەو قسەیەی لە ژێر لێوەوە پێکەنین، منیش گوتم: 'ئەی ئەگەر ئەو ماڵەی ئێمە بۆمان دەستنیشان کراوە، چۆڵ بێت؟!'

لە دوای ئەمەوە بێدەنگ لە منیان ڕوانی، وەکوو بیانەوێت ڕای منیش وەربگرن، منیش بێ ئەوەی بیرم لێ کردبێتەوە شتێک بڵێم: 'بوتڵێک شەراب لە قونیشماندا بێت بیشارینەوە بۆ ئەمشەو، بۆ دوای کوشتارەکە!'

هەردووکیان بۆ چەند هەناسەیەک بە بێدەنگی لێیان ڕوانیم، منیش ڕووم لێ وەرگێڕان و لە شووشەی ڕەنگاوڕەنگی دووکانی شەربەتچییەکم ڕوانی، کە شووشەکانی شکێنرابوو. کاتێک من پشتم لێیان بوو، عەلی گوتی: 'ئێوە پێتان وایە کە ژیانی سەرباز نهێنیی تێدایە؟'

ئاوڕم دایەوە، دەنیز بە چپە گوتی: 'کوڕە چۆن نهێنی تێدا نییە، بەڵام ئیتر خۆت و بەختی خۆت.'

منیش گوتم: 'دەستکەوتی زێڕ و پارەت مەبەستە؟! یان...'

عەلی: 'زۆر شت، ژن و کچەکانیان؟'

دەنیز: 'بە سەرە سواریان دەبین.'

عەلی: 'دەی نابێتە زینا؟'!

منیش پێم گوتن: 'ئەرێ، جەنگاوەرەکانی ئیسلام لە کاتی غەزادا چ ئایەتێکیان دەخوێند!'

دەنیز: 'ئێ ئینجا ئەو ئایەتە بۆ شیعەمەزهەبیش دروستە؟!'

عەلی: 'بەڵێ، بەڵێ، خودا بۆ هەموو موسڵمانانی بە یەکسانی ناردووەتە خوارەوە.'

هەردووکیان لە منیان ڕوانی و دەنیز گوتی: 'دەی فەرموو، مەگەر تۆ کوڕی مەلا نەبیت؟'

'دەی ئێوە چۆن جەنگاوەرێکن، بۆ دوای ئەو هەموو سـاڵە و سەدان فتووحات چۆن ئەو ئایەتە نازانن؟!'

کاتێک ئێمە لەم قسـانەدا بووین، سـەربازەکانیان بانگ کرد و بە گەڕەکانی شـاردا بڵاو بوونەوە. ئێمەش لە بێئیشـیدا گوێمان لە تەقەکان دەگرت و بە دەم قسەکردنەوە کاتمان دەبردە سەر.

## ١٢

له کاتێکی چاوەڕواننەکراودا خۆی کرد بە ماڵی کەمالی حازم بەگدا، لەو کاتەدا بە ڕێکەوت دەرگەکەیان لەسەر پشت بوو، دوو ڕۆژ بوو بە زۆربەی هاوڕێکانیاندا هەواڵی بۆ ناردبوو، کاتێک چووە ناو حەوشەکە کەمال لە ژێر سێبەری دارمێوەکە دانیشتبوو: 'یاسین، تۆ ئەندامێکی زۆر کەمتەرخەمیت!'

کاتێک کەمالی حازم بەگ ئەمەی بە مامۆستا یاسین گوت، هێشتا ئەو بە پێوە بوو، دوای ئەوەی چوو لە شانیەوە لەسەر کورسییەکی حەسیر دانیشت، سڵاوی کرد و ویستی وەڵامی بداتەوە، بەڵام کەمال بەردەوام بوو، گوتی: 'پێویستە تۆ زیاتر گرنگی بە کاری سیاسی و بەرژەوەندیی پارتەکەت بدەیت، ئیشوکاری حیزبی ئاوا بەڕێوە ناچێت!'

مامۆستا یاسین بە سەرنجەوە لێی ڕوانی و پرسیی: 'بۆ، کاک کەمال، خودانەخواستە هیچ ڕووی داوە؟!'

'نەخێر، بەڵام ئەبێت ئێمە هەوڵ بدەین هیچ ڕوو نەدات و ئەندامەکانمان تووشی گرتن و کوشتن نەبن، ئەوەتا تۆ و هاوڕێکانت ئێستا لە لێواری حەپسکردندان و خەریکە تووشی بەڵایەک ئەبین!'

'کاک کەمال ڕجات لێ ئەکەم، خودا نەکا شتی ئاوا ڕوو بدات.'

'تۆ و حەمەبۆر پێویست بوو لەو ڕووداوەی ئەو شەوە دەستبەجێ منتان ئاگادار بکردایەتەوە، ئەگەر لە کاتی خۆیدا بمانزانیایە ئەوا

خەممان ئەخوارد، بەڵام تازە هیچ ناکرێت و ئەوەتا ناوی تۆ و حەمەبۆر لە چەند جێگەیەک هێنراوە.'

'چۆن؟ لە کوێ ناومان هێنراوە؟'

'جا برا بڵێم لە کوێ، ئەوەندەی من خەبەرم هەبێت لە گەلێک شوێن، ئێوە ئەو شەوە ئەبووایە بنووسن، بڕووخێت حیزبی بەعس، تا قورس بەر گوێی ڕژێم بکەوێتەوە و لای کەس ئاشکرا نەبن، بەڵام ئەوەی تۆ نووسیبووت، بژی کوردستان، ئەوە نەک هەر لای ڕژێم بەڵکوو شیوعییەکانیشی تەنگەتاو کردووە، جا جەنابتان چوون بە ڕەنگی سوور نووسیووتانە، ئیتر ئەوەندەی تر برادەرانی شیوعی هار کردووە.'

'ئەی باشە ئەوان ئەوەیان چۆن زانیوە؟!'

'کە ئێوە لە دیواری قوتابخانەی جمهووریتان نووسیوە؟'

'بەڵێ، جا چوزانن ئێمە نووسیومانە؟!'

'چۆن نازانن، ئەو کەسەی بینیبوونی، ئیخباری لێ داون!'

'کوڕە کاک کەمال وا نەڵێیت! خۆ ئەو کەسەی بینینی، نەخوێندەوارە!'

'یانی جەنابت زانیبووت کێیە؟'

'بەڵێ.'

'ئێ باشە، بۆ منتان ئاگادار نەکردەوە؟!'

'لە ڕاستیدا وام زانی پیاوێکی فەلاحە و ئەچێت بە لای کاری خۆیەوە و ئیخباریمان ناکات.'

'نەخێر، ئەو پیاوە فەلاحەی تۆ باسی لێوە ئەکەیت، هەر ئەو شەوە، بە ناخێری گیانتان چیتان لێ بەجێ مابوو، بۆ مەخفەری پۆلیسی سەرشەقامی بردبوو.'

'پێم گوتی، دوو کەســـــی نەنــاس، وا بزانم پۆلیس بووبوون، گوێنییەکەیان بۆ ماڵی ئێمە بردبوو.'

'بەڵێ، هەروەها غالب عەربەتیی شـــیوعی، کە بە قســـــەی تۆ ئەو پیاوە نەخوێندەوارە، بە حیســـــاب وای زانیبوو کە ئێوە ناوی تیپی دووگوڵییەکەتان، خەبات، لەســـەر ئەو دیوارە نووســیبوو، بەڵام ناوی تۆ و حەمەبۆری لای ئەو دوو پۆلیسە گوتبوو، من هەرچەند بیری لێ ئەکەمەوە، هەست ئەکەم غالب عەربەتی بە دەسیسە ئەوەی کردبێت. چونکە ئەو پیاوە سەروقنگی لەگەڵ کوڕانی میرزا کەریمدا تێکەڵە.'

'باشـــە کاک کەمال، کێی تر ئەزانێت، کە من و حەمەبۆر ئەو کارەمان کردووە؟!'

'ئەو دوو پۆلیســـــە یەکێکیان پارتییە و لایەنگری خۆمانە، ئەوی تریان قوبادی جەمال کەرکووکییە و شـــیوعییە، لە ڕاســـتیدا قوبادی پۆلیس لایەنگری ئەو کەســــەیە کە نان و کەبابێکی بۆ بکڕێت، ئیتر هەرچی کەسـێک و لایەنێک بێت، خۆ ئەو دوو پۆلیســە کاتێک دەزانن لەســـەر دیوارەکەی مەکتەبی جمهووری چی نووســـراوە، گوێنییەکە دەشــارنەوە و لای کەس قســە ناکەن، بەڵام ڕۆژی دوای ئەو شــەوە خەڵکی تر خەبەر دەدەن، کە چی لەسـەر دیواری مەکتەبی جمهووری نووسراوە، ئیتر زەنگی مەترسییەکە دەگاتە هەموو جێگەیەک، تەنانەت موتەسەڕیفیش بەوەی زانیوە. ئەو بەیانییە خێرا دەچن و دەیسڕنەوە، شـــۆفێری پاســـێک گێڕابوویەوە، گوایە دوو ئۆتۆمبێلیان لە بەر دیوارەکەدا ڕاگرتبوو، تا کەس نەیخوێنێتەوە.'

'کاک کەمال، ئێستا چی بکەین؟!'

'جەنابی مامۆســـتا یاســـین، من داوام لێ کردن کە بنووســـن، بڕووخێت حیزبی بەعس، بەڵام... باشـــتر ئەوەتان نەنووســـی، ئەگینا

هەموومانیان لە بن ئەو دیوارەدا ڕەمی ئەکرد، ئێســـتاش نازانین چی ڕوو ئەدات.'

'ئینجا لەمەولا بترسین؟!'

'ئەبێت بترسین. دەی مەگەر ئێمە دوژمنی ڕژێم نەبین؟!'

کەمالی حازم بەگ دەستی خستبووە سەر شانی مامۆستا یاسین، تۆنی دەنگی گۆڕی و گوتی: 'پێویستە ئەم ماوەیە تۆ و حەمەبۆر زۆر ئاگاتان لە خۆتان بێت، ئێســـتا لێرە ئەڕۆیت و ئەچیت حەمەبۆر و هاوڕێکانی ترت ئاگادار ئەکەیتەوە، کە پێویســتە بۆ ماوەیەک، تا خۆم ئاگادارتان ئەکەمەوە نەکەونە پێش چاو.'

'کاک کەمال پرسـیارێک، ئایا لەســەر ئەوە بووبوو غالب عەربەتی تەقەی لێ کرا و ئێستا بێسەروشوێنە؟'

دوای ئەمە کەمالی حازم بەگ پشــت دەکاتە مامۆســتا یاســین و دەچێتە ژوورەوە. ئەویش لە ماڵەکە دێتە دەرەوە و دەرگەکە بە توندی بە دوای خۆیدا دادەخات. بە دەســتەڕاســتدا ئەو کۆڵانە دەگرێتە بەر، بە نووکی پێکانی هێواش خڕە بەردێک پێش خۆی دەدات، ســەری بە سەردا شۆڕ دەکاتەوە و لێی دەڕوانێت. بیرکردنەوە لە بەهار خەیاڵی داگیر دەکەن و بواری ئەوەی پێ نادەن، تاوەکوو قســـەکانی کەمالی حازم بەگ بە هەند وەربگرێت. لەوێوە بۆ پشتی باخی گشتی دەچێت و لە بەردەم ماڵی ســوهەیبە عەرەبدا ڕادەوەســتێت، پێش ئەوەی لە دەرگەکە بدات، لە ڕاستەوە بۆ چەپ بە سەر شۆستەی بەر ماڵەکەدا پیاســـە دەکات، وەکوو لە بەر خۆیەوە بدوێت، لە ژێر لێوەوە چرپە چرپی بوو، دەســتی کردبوو بەنێو گیرفانی شــەرواڵەکەیدا و ســەری شــۆڕ کردبووەوە. وەڵامنەدانەوەی کەمالی حازم بەگ و بیرکردنەوە لە غالب عەربەتی خەیاڵیان شـــێواندبوو. چووە بەردەم دەرگەکە،

هەناسـەیەکی قووڵی هەڵکێشـا و لە بەر خۆیەوە گوتی: 'چی بەو هەتیوە بڵێم؟ چۆن ڕازیی بکەم؟!'

تاوەکوو لە دەرگەکەشیدا هێشتا نەیدەزانی چۆن داوا لە سوهەیبە عەرەب بکات، بەڵکوو بێت و بۆ تیپی خەبات یاری بکات. ئەو هێشـتا نەیبینیبوو، بەڵام کەمال سـەلیمی هاوڕێی ئەوەندەی باس کردبوو، گوتبووی: 'بە خودا ئەو هەتیوە عەرەبە بۆ هەرچی تیپێک یاری بکات، ئیتر ئەو تیپە قەت نادۆڕێن!'

ئەویش بە کەمال سەلیمی گوتبوو: 'سوهەیبە عەرەب ئەهێنمە تیپی خەباتەوە.'

ماڵی سـوهەیب حەسـەن خەڵەف دوو هەفتە دەبوو، لە شـاری بەغداوە بۆ شاری سلێمانی هاتبوون، حەسەن خەڵەفی باوکی ئەفسەر بوو لە فیرقەیەکی تایبەت لە لیوای بیست، ئەو لیوایەی زەعیم سدیق ئامرلیوای بوو، یەکێک بوو لەو حەرەسـقەومییانەی لەو مانگەدا بۆ کوردسـتان و بە تایبەتی شـاری سـلێمانی نێردرابوون، چەند ئەفسـەرێکی دەرەجەدار بوون و لە گەڕەکی عەقاری خانوویان بۆ چۆڵ کرابوو، تاوەکوو بتوانن خێزانەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بهێنن.

مامۆسـتا یاسـین، کاتێک لە دەرگەی دا، خۆیی بۆ ئەوە ئامادە کردبوو، کە بە زمانی عەرەبی قسەی لەگەڵ بکات، لە خەیاڵیدا ویستی ئەوە بە سـوهەیب بڵێت، ئەگەر بێتوو بۆ تیپی خەبات یاری بکات، جووتێک پێڵاوی بە دیاری بۆ دەکڕن.

سـوهەیب خۆی دەرگەکەی کردەوە، مامۆستا یاسین پەشـۆکا و پرسیاری سوهەیبی لێ کرد، کوڕێکی قژلوولی چاوڕەشی باریکەلانە بوو، لە وەڵامدا بە مامۆسـتا یاسـینی گوت: 'من سـوهەیب حەسـەن خەڵەفم.'

'تۆ یاریزانیت، وا نییه؟'

'بەڵێ، له بەغدا، له یانەی پۆلیس یاریم کردووه!'

'یانەی پۆلیس؟! ئێمه تیپێکی زۆر باشمان هەیه و پێویستمان به یاریزانێکی وەک تۆ هەیه، ئەتەوێت بێیت و یاریمان بۆ بکەیت؟'

'له کوێ؟!'

'له یاریگەی ئیداره مەحەلی.'

'بۆچی نا!'

'ڕازیت؟'

'بەڵێ، بەڵێ.'

'ئێمه جل و پێڵاوت بۆ ئەکڕین.'

'یانەکەتان، ناوی چی بوو؟'

'خەبات.'

'ئێ، ئێ!'

دوو سەرباز له پشتیەوه پەیدا بوون و یەکێکیان دەستی خسته سەر شانی و پرسیی: 'تۆ چی دەکەیت لێره؟'

مامۆستا یاسین به پەشۆکاوییەوه ئاوڕی لێ دانەوه و گوتی: 'وەرزش، یاریی، تۆپتۆپێن.'

یاسین له سەربازەکانی دەڕوانی، دەنگی داخستنی دەرگه ئاسنینەکه ڕایچڵەکاند، سەربازەکه هێشتا دەستی لەسەر شانی دانەگرتبوو، توند سەر شانی گوشی و پێی گوت: 'تۆ لێره هیچ کارێکت نییه!'

'بەڵێ، بەڵێ.'

ئەمەی بە ترســەوە بە ســەربازەکان گوت، ویســتی لە دەرگەکەی ماڵی ســـوهەیب بداتەوە و پرســـیاری ئەوەی لێ بکات، کەی بێت بە شوێنیدا و پێکەوە بچن بۆ یاریگەی ئیدارە مەحەلی!

ســەربازەکان بێدەنگ لێیان دەڕوانی، پاشــان دەســتی داگرتەوە و خێرا چەند هەنگاوێک لە ســـەربازەکان دوور کەوتەوە، ڕووی لە سەربازەکان کرد: 'من وەرزەشەوانم، نادیی سلێمانی، یاریزانی نادیی سلێمانیم!'

ئەمەی پێ گوتن، ســـەربازەکان هیچ وەڵامیان نەدایەوە، پاشـــان ئەویش پشــتی تێ کردن و خێرا لە ســەری کۆڵانەکەوە خۆی گەیاندە ناو باخی گشتی و خۆی لە ناو دارەکاندا ون کرد.

زیاتر لە سەعاتێک لەوێ لەسەر کورسییەک دانیشتبوو، قورسایی ترســـێک هەناســـەی توند کردبوو، بنباڵەکانی ئارەقیان لێ دەچۆڕا، بەردەوام هەناســەی قووڵی هەڵدەکێشــا. خەیاڵی شــێوابوو، نەیدەزانی بیر لە چی بکاتەوە، هەوا و هەوەســـی وەرزش لە پێش عەشـــق و ترسـەوە بوون، هەرچییەکی دەکرد نەیدەتوانی دەســتبەرداریان ببێت، هەســـتی بە جەنجاڵیی ناو خەیاڵەکانی دەکرد، بە خۆیی گوت: 'دڵم بووە بە چەندین پارچەوە!'

لەســەر کورســیی ناو باخەکە ئەژنۆکانی بە ســینگەوە گرتبوون، خەیاڵی بۆ لای ئەو شـــەوە گەڕایەوە، کە لەگەڵ حەمەبۆر لەســـەر دیواری قوتـابخـانـەی جمهووری نووســـیبوویـان، بە خۆیی گوت: 'پێویســتی نەئەکرد ئەوەندە ترســنۆک بوومایە، ئەگەر ڕام نەکردایە، ئەوا لە غالب عەربەتیی باوکی بەهارم ئەگەیاند، کە مەسەلەکە چییە و ئەوان خەریکی چین، باوەڕ ناکەم ئەو پیاوە لاریی لەوە هەبووایە، خۆ غالب عەربەتییش کوردپەروەرە، ئەویش بە هۆی ئێمەوە تووشی ئەو

بەلایە بوو. هەســـت ئەکەم لەوەتەی عاشــقی بەهار بووم، هەرچی غیرەت هەیە تێمدا نەماوە! خەمیشـــمە، نازانم ســـبەینێ چی وەلامی جەلالی میرزا کەریم بەمەوە!'

بە دەم ئەم خەیالانەوە گەیشتبووەوە گەڕەکی سـەرشـەقام و بەردەم مزگەوتی مەحوی، لە مـاڵی خۆیانی ڕوانی و هەنـاســـەیەکی قووڵی هەڵکێشـا، کاتێک چاوی چووە سـەر دەرگە شـینەکەیان، ئەو خانووەی دە ســـاڵ پێش ئەو ڕۆژە حاجی ئەحە کریس و میرزا کەریم بۆیان بەکرێ گرتبوون، دوای ئـەوەی حـاجی ئـەحـە کریس ئـەو خـانووەی ئەوان و ســێ ماڵی تری تێدا دەبن، تێک دەدات و ڕیزێک دووکانی لێ درووست دەکات.

تەزوویەکی سارد بە جەستەیدا هات، پاشان بەو مانگی حوزەیرانە وەک ســـەرمای بێت، هەڵدەلەرزی. پاشـــان چوو لە ئاودەســـتی مزگەوتەکەدا دەرگاکەی لەســـەر خۆی داخســـت و چیچکەی کرد، بێ ئەوەی پانتۆڵەکەی هێنابێتە خوار، کـاغەزێکی پێچراوەی لە گیرفانی دەرهێنـا، ئەو کـاغەزەی هەموو شـــەوێک جـارێک دەیخوێندەوە، هاوڕێکانی هەموویان بینیبوویان، تەنیا هەندێک وشـــەی لێ گۆڕیبوو، کۆپیی نـامەکەی جەلالی میرزا کـەریمی کردبوو، نـاوی خۆیی لە خوارەوە نووســیبوو. ئەو لە خۆی دوودڵ بوو، چونکە هاوڕێکانی بە نامەکە زۆر ســـەرســـام بوون، یەکیەک داوایان لێ کردبوو، لە بەری بنووسنەوە و ئەوانیش بۆ دڵخوازەکانیانی بنێرن، کە جەلال شاعیرانە لەو نامەیەدا باســـی لە جوانی بەهار کردبوو، لە کۆتایی نامەکەدا، داوای لە بەهار دەکرد ئاخۆ ڕازی دەبێت ببێتە هاوژینی.

کاغەزەکەی خستە ناو ئاوەڕۆی ئاودەستخانەکە، خێرا گەڕایەوە بۆ ماڵەوە و دەفتەری شیعرەکانی جەلالی خستە بەر باخەڵی و چوو بۆ ماڵی بەهار.

لە بەردەم ماڵی غالب عەربەتیدا تووشی مالیکی مام مستەفا و ڕەحیم موکریانی بوو، سڵاویان لێ نەکرد، مالیک یەخەی گرت و بێدەنگ لەچاوی ڕوانی، بە دیواری حەوشەکەی ماڵی بەهارەوە نووساندی. ڕەحیم کەوتە نێوانیان و لێکی جیا کردنەوە، مالیک نووزە نووزێکی لێوە هات و بە دەستێکی ئاماژەی بە شتێک کرد. کاتێک دەستی لێ بەر دا، مامۆستا یاسین هەناسەی لە بەر بڕابوو. چەند هەناسەیەکی پێ چوو تاوەکوو هاتەوە سەر خۆی. یاسین، مالیکی لە منداڵییەوە دەناسی، لێی تێ گەیشت دەیەوێت چیی پێ بڵێت. مالیک هەڕەشەی لێ کرد کە ئەوەندە دەوروخولی ماڵی بەهار نەدات. ڕەحیم هیچی نەگوت و لەگەڵ مالیک ڕۆیشتن.

کاتێک یاسین چووە ژوورەوە، بینیی؛ بەهار لەگەڵ دایکیدا گریابوو، چاویان سوور هەڵگەڕابوو، دەنگیان نووسابوو. بێ ئەوەی شەرم لە حەلیمەی دایکی بکات، دەفتەری شیعرەکانی جەلالی بەرەو ڕووی بەهار ڕاگرت و پێی گوت: 'ئەوە ئەمانەتی جەلالە، با لای تۆ بێت، باشترە!'

ویستی بڕوات، گەڕایەوە و لە بەهاری ڕوانی و گوتی: 'جەلال نامەیەکی بۆ نووسیبوویت، لە قسوورم عافووم بکە، کە پێم نەگەیاندیت! بەڕاستی...'

بەهار لێی چووە پێشەوە و دەستی خستە سەرشانی و قسەکەی پێ بڕی: 'هەموو شتێک ئەزانم، تۆ خۆت سەغڵەت مەکە و ئاگات لە

دڵی خۆت بێت، هاوڕێکانت و دەیان کوڕی تری ئەو شارە، هاوشێوەی ئەو نامەیەیان فڕێ دابووە حەوشەکەمان، هەموو نامەکان لە یەک ئەچوون، زانیم، چونکە پێشتر ئەو قسانەم لە جەلال بیستبوو.'

## ١٣

شەوی هەشت لەسەر نۆی شەشی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ فەوجی پێنج لە لیوای سەر بە پارێزگای تکریت بۆ سلێمانی هێنرابوون، سەربازەکان لە نیوەشەودا گەیشتنە ناو سەربازگەی حامییە، سەعاتێک پێش ئەوەی فەرمانیان پێ بکرێت و بە دەوری شاردا بڵاو ببنەوە، لە ناو حەوشەی سەربازگەی حامییەی سلێمانیدا لە خۆئامادەکردندا بوون، پاشان عەمید سەلامی فەرماندە، کە خۆی خەڵکی سلێمانی بوو، بە شێخ سەلام عیزەدین بەرزنجی ناسرابوو، سەربازەکانی کۆ کردەوە و قسەی بۆ کردن، کە لە دەوری شار بڵاو دەبنەوە و لە کەمیندا دەبن، ئەوەی دووبارە کردەوە، کە دەست لە هیچ ڕۆحلەبەرێک ناپارێزن، باڵداریش بە سەرتاندا فڕی تەقەی لێ بکەن، ئێوە نەهاتوون تاوەکوو خەڵکم بۆ بە دیل بگرن، ئەوەی کەسێک بریندار بکات، ئەو کەسە خراپترین نیشانەشکێنی ئەم فەوجەیە، ئێمە ئەمشەو دیوارێکی پۆلایین بە دەوری شاردا دروست دەکەین، ئەمە فەرمانە و پێویستە هەمووتان جێبەجێی بکەن.

شێخ سەلام عیزەدین بەرزنجی ئەو ڕۆژە بۆ تۆڵەسەندنەوەی باوکی هاتبوو بۆ سلێمانی، لە کاتێکدا شێخ سەلام پەیوەندی نزیکی لەگەڵ ئامرلیوای بیستی سلێمانی زەعیم سدیق مستەفادا هەبوو، لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسم لە لیوای بیستی مووسڵ پێکەوە فەرماندەی فەوج بوون.

سـالی ١٩٦١ شـێخ عیزەدین بەرزنجی لە ماڵەکەی خۆیدا لە گەڕەکی سـەرشـەقام دەکوژرێت، حکومەت حەمەڕەشـید خانەقینی بە تۆمەتی کوشـتنی شـێخ عیزەدین دەسـتگیر دەکات، پاشـان تۆمەتەکە دەخەنە پاڵ پـارتیی دیموکرات، بەو جۆرە کوڕەکـانی شـــێخ عیزەدین، کە هەرسـێکیان لە ڕیزی سـوپادا فەرماندە بوون، بەردەوام لە هەوڵی تۆڵەسەندنەوەی باوکیاندا بوون.

ئەم فەوجە سەربازییە لەو ساڵەدا بۆ زۆربەی دێهاتەکانی ناوچەی گەرمیان و شـوان چووبوون، وەک هێزێکی پەلاماردەر لەگەڵ لیوای پێنجی مووسـڵ، کە زەعیم سـدیق مسـتەفا ئامرلیوا بووبوو، بۆ خانەقینیش دەچن، سـەربازەکان لە ناو خۆیاندا باسـیان لەوە دەکرد، کێ چەند کەسـی کوشـتووە، هەندێک لە سـەربازەکان دەفتەری بەر باخەڵیان پێ بوو، هەرکەسێکیان دەکوشت، کات و شوێن و ڕەگەزی کوژراوەکەیان تۆمار دەکرد.

سەعات دووی شەو سەربازەکانی فەرماندە شێخ سەلام بەرزنجی بە دەوری شاردا بڵاو بوونەوە، هەموو ڕێگە سەرەکی و تەنانەت لەسەر توولەڕێگەکانی دەرەوەی شاریش بۆسەیان دانابوو، لە سەعات سێی تەواودا یەکەم گوللە تەقێنرا، خەڵکی شـــار لە دوورونزیک لە دەنگی دەســـترێژی گوللەکان لەخەو هەســـتان، یەکەم گوللە لە بەکرەجۆ تەقێنرا، سەربازەکان ئەوەندە لە نزیک ماڵەکان بۆسەیان دانابوو، هەر کە جووتیارەکان لە ماڵەکانیان هاتبوونە دەرەوە، لە بەر دەرگە و تەنانەت لە ناو حەوشەی ماڵەکانیاندا کوشتبوونیان.

ئەو ڕۆژە هەموو شـەقامەکانی شـار؛ بە تایبەتی پیرەمێرد و سـالم و کاوە و نالی زیاتر لە پێنج هەزار سـەربازیان تێدا بڵاو بووبوونەوە،

به جۆرێک، که لەسەر شۆستەی شەقامە سەرەکییەکان هەر دە مەتر و سەربازێک بە تفەنگەوە ڕاوەستابوو.

لەو کاتەدا چوار منداڵ چووبوون لەســـەر گومەزی مرووڕەکەی ناوەڕاســتی گۆڕەپانی ســەرا دانیشــتبوون، چوار منداڵ بوون و جلی ڕانکوچۆخەی خــاکییــان لــە بــەردا بوو، لە دوورەوە وەک چۆلەکە پاســـاری دەهاتنە پێش چاو، یەکێک لە منداڵەکان لەو کاتەدا بە پێوە ڕاوەستابوو، دەزووی کۆلارەیەکی بە دەستەوە بوو، پاشان یەکیەک شـــوێنەکەیــان دەگۆڕی و بە نۆبە لەنگەری کۆلارەکەیــان دەگرت، کۆلارەکەیان زیاتر لە ســـەد مەترێک بە بەرزیی گۆڕەپانی ســـەراوە لەنگەری گرتبوو.

ســـەربازەکان بێجگە لە چاوســـاغە کوردەکانیان هەموویان یەکەم جاریان بوو شـــاری ســـلێمانی ببینن، زەعیم ســـدیق ئەو بەیانییە تاریکوڕوون خۆی دێت بۆ بەر دەرکی ســـەرا و پاشـــان لە ناو حەوشـــەی ســـەرادا قســـە بۆ چەند ئەفســـەرێک دەکات، کە ئەو ڕۆژە ســـەرپەرشــتیی هێزی ناوشـــاریان دەکرد، زەعیم ســـدیق ئەوەی بە ســـەربازە عەرەبەکان گوتبوو، کە هەموو ماڵێکی ئەم شـــارە یاخییەک یان مســـتەفا بارزانییەکی تێدایە، یان هەموو نێرێکی ئەم شـــارە پێدە چێت سەر بە یاخیبووان بێت.

لە ســـەروو ســـجنی گەورەوە بە جادەی پیرەمێرددا بۆ خوارەوە، تاوەکوو دەگەیشتە بەر خانەقا و ناو حەوشـــەی مەکتەبی جمهووری، پاشـــان تاوەکوو ناو دێی حاجی ئاوا بە ڕیز ســـەرباز ڕاوەســـتابوون، ئەو ڕاســـتە شـــەقامەی شـــاری دەکرد بە دوو بەشـــەوە، ئۆتۆمبێلی سەربازی ڕەشاشیان لەسەر دابەسترابوون و بەردەوام دەگەڕان.

ڕۆژی پێشـــوو بە فەرمانی زەعیم ســـدیق و پارێزگاری ســـلێمانی عەبدولهادی ســـــالح هەموو پۆلیســـــی مەخفەرەکان و فەرمانگە حکومییەکان چەک دەکرێن و بۆ دە ڕۆژ ئیجازە دەدرێن، لە جێگەیان ئەو پۆلیسانە دادەنرێن کە لە ئەنبار و مووسڵ و تکریتەوە بە تایبەتی بۆ کاتێکی نادیار بۆ ســلێمانی هێنرابوون، هەندێک پۆلیس بۆ حامییە بانگ کرابوون، کە ژمارەیان بیســـت کەســـێک دەبوون، داوایان لێ کردبوون لەناو شـاردا بێ چەک چاوســاغیی ســەربازەکان بکەن. لە کاتێکدا پشکنینی ماڵەکان دەستی پێ دەکرد، کە بە نیاز بوون ماڵ بە ماڵی هەموو گەڕەکانی شـــار بگەڕێن، داوایان لە پۆلیســـە کوردەکان کردبوو، بە تـایبەتی بۆ ئەو ڕۆژە جلی کوردی لـە بـەر بکەن، ئەو بەیانییە، وەک دیارییەک، هەر پۆلیسێک و بیست دیناری وەرگرت.

سەرلەبەیانیی هەمان ڕۆژی یەکشەممە نۆی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٣ دوو جێبی پڕ لە ســـەرباز و لۆرییەکی ســـەربازیی پڕ لە کەلوپەل لە ســەربازگەی حامییەوە بەرەو یاریگەی مەعاریف لە گەڕەکی چوارباخ کەوتنە ڕێ، سەربازەکان ژمارەیان لە بیست زیاتر بوو، بە مەبەستی ئەوە بنکەیەک لە خوارووی گەڕەکی چوارباخ و لە یاریگەی مەعاریفدا دابنێن، کە لە خوارووی شار بوو.

مامۆســتا یاسـین و سـێ هاوڕێی لە ژوورێکی خۆکۆڕێندا لەســەر بەتانییەک دانیشـــتبوون و دۆمینەیان دەکرد، ئاگایان لەوە نەبوو، کە ســەربازەکان لە بەر دەرگەی ژوورەکەدا ڕاوەســتاون، ســەربازەکان گوێیان لە دەنگە دەنگ و لێدوانی ئەوان دەبێت، لوولەی تفەنگەکانیان نابوو بە دەرگەکەوە، کاتێک لە دەرگەکەیان دا، مامۆستا ئیسماعیل لێ کردنەوە، لەو کاتەدا ئەوان چاوەڕوانی ئەوە بوون ڕەحیم موکریانی

نانیان بۆ بهێنێت. مامۆستا یاسین ئەو بەیانییە بە ڕەحیمدا هەواڵی بۆ حەپســـەی دایکی ناردبوو، داوای ئەوەی لێ کردبوو خواردنیان بۆ بنێرێت، کاتێک ســـەربازەکان خۆیان کرد بە ژووردا، هەموو لوولەی تفەنگەکانیان تێ کردبوون، خێرا لە جێگەی خۆیان ڕاســت بوونەوە و چاویان بە سـەر سەربازەکاندا گێڕا، هەر ئەوەندە دەرفەتیان پێ دان، کە لێیان پرســـین ئایا ئێوە چی دەکەن لێرە، بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵامیان لێ بکەن پەلاماریان دان و باڵبەســـتیان کردن و لەگەڵ خۆیاندا بردنیان.

لە بەردەم دەرگەی یاریگاکەدا لەسـەر شـەقامە گشتییەکە، سواری یەکێک لە جێبەکانیان کردن، ســـەربازەکان بە پارچە بەتانییەکی ســـەوزی دڕاو چاویان بەســتن، مامۆســـتا یاســین کاتێک بەرچاوی تاریک بوو، خەیاڵی لای ڕەحیم بوو، خەمی ئەوەی بوو ئەگەر ئەو بە تەنیا بۆ یاریگەکە بگەڕێتەوە، ســـەربازەکان گێچەڵی پێ دەکەن و دەیگرن، بێجگە لەوە بەرامبەر هاوڕێکانی هەســـتی بە خەتا و پەشـــیمانی دەکرد، چونکە ئەوان لەســـەر داوای ئەو بۆ ئەو جێگەیە هاتبوون، کە هیچیان پەیوەندییان بە یاریگە و تۆپێنەوە نەبوو، حەمەبۆر هەندێک جار لەگەڵ مامۆســـتا یاســـین باســـکەی دەکرد، مامۆستا ئیسـماعیلی ئیبراهیمی بەلووعەچی جار جار سـەیری یاریی تۆپی پێی دەکرد، ئەویش لەبەر خاتری مامۆسـتا یاسـین بوو، ئەنوەر دارتاش لەگەڵ ئەوەدا کە ســـەرۆکشـــانەیان بوو، بێجگە لە باســـی شیعرەکانی نالی، مەگەر بە ڕێکەوت باسی وەرزشی بکردایە. ئەنوەر و یاسـین چەند سـاڵێک بوو پەیوەندییان لەگەڵ جەلالدا هەبوو. ئەوان بە یاســـینیان دەگوت: 'وەرزش خوویەکە و لە کاتی بێکاریدا ئەکرێت، بەڵام لە یاریی دۆمینە و تاوڵە باشترە.'

یاسین لە ژێر لێوەوە ناوی هاوڕێکانی دەهێنا، کەسیان وەڵامیان نەدەدایەوە، تەنیا ئەوەندە نەبێت یەکێک لە سەربازەکان بانگی لێ کرد: 'بێدەنگ بە هەتیو!'

یاسین بە خەیاڵ بۆ لای باسوخواستی منداڵانی قوتابخانە گەڕایەوە، کاتێک ئەو باسی یاریی تۆپتۆپێنی بۆ دەکردن، منداڵەکانیش بەردەوام پرسیاریان لەسەر ئەو یارییە لێ دەکرد، کە چوار ساڵێک پێش ئەو ڕۆژانە یانەی سلێمانی لەگەڵ هەڵبژاردەی جەزائیردا کردبوویان، پێی گوتبوون؛ ئەوان یازدە گوڵیان لە ئێمە کرد، بەڵام ئەوەتان لە بیر نەچێت، کە ئێمەش گوڵێکمان لێ کردن. منداڵەکان بەو قسەیەی مامۆستا یاسین قاقایان لێدەدا و پێدەکەنین، هەمان ئەو قسەوباسانەی زیاتر لە دە جار بۆ گێڕابوونەوە. پاشان قوتابییەکانی پرسیاریان لێ کردبوو، کە تیپێک لە چەند یاریزان پێک هاتووە؟ ئەویش لەسەر تەختە ڕەشی پۆلەکە وێنەی یاریگەیەکیان بۆ دەکێشێت و لە گۆڵچییەوە تا هێرشبەر بۆیان دەستنیشان دەکات، پاشان تیپی بەرامبەر و ڕاهێنەر و یاریزانانی یەدەگ. لە کاتێکدا کە زەنگی قوتابخانەیان دەبیست، هێشتا ئەوان سەرقاڵی خوێندنی وانەی یاریی تۆپی پێ دەبن، پاشان پەیمانی ئەوەی بە قوتابییەکانی دابوو ڕۆژێک بیانبات بۆ یاریگەی مەعاریف و پێکەوە سەیری یارییەک بکەن.

لە خەیاڵیدا دەنگی باوکی بیر کەوتەوە، تەزوویەک بە لەشیدا هات، پێی دەگوت: 'بە هیچ جۆرێک تەداخولی سیاسەت نەکەیت.'

گوێی لێ بوو، سەربازەکان باسی شەوانی چوونەدەرەوەی ناو شاری بەغدایان دەکرد، سەربازێکی باڵابەرزی ڕەشتاڵە لە ناو دەرگەکەدا دانیشتبوو، ئەو زیاتر لە هەمووان قسەی دەکرد و جگەرەیەکی داگیرساند و دایە دەستی سەربازەکانی تر، ئەنوەر

دارتاش کاتێک بۆنی دووکەڵی جگەرەکەی کرد، سەری هەڵبڕی و هەناسەیەکی قووڵی هەڵمژی، کە لە ناویاندا تەنیا ئەو جگەرەی دەکێشا.

کاتێک گەیشتنە ناو سەربازگەی حامییە، لە جێیەکە دایانگرتبوون و زیاتر لە سەعاتێک لەسەر شۆستەی بەردەم تەویلەی ئەسپەکاندا ڕایانگرتبوون، مامۆستا یاسین بۆ ئەوەی ئەو ساتە لە بیر خۆی بباتەوە و گوێی لە لێدوانی سەربازە عەرەبەکان نەبێت، دیمەنی پۆلێک قوتابیی هێنایە پێش چاوی خۆی و لە ژێر لێوەوە و بە نووزە نووز دەیژماردن، کاتێک دوو سەرباز باڵیان گرت، ئەو نزیکی بیست قوتابیی ژماردبوو، پاشان لە نێوانی دوو سەربازدا دەڕۆیشت و زووزوو قاچی لە قەراخی شۆستەکان هەڵدەکەوت. گەیاندیانە ناو حەوشەی پشتەوەی حامییە، بێ ئەوەی هیچ ببینێت سەری بەرز کردەوە و دەستی کردەوە بە ناوهێنانی قوتابییەکانی قوتابخانەی ئەیوبییە: 'وەهاب سالح، جەلال کەریم، سمکۆ ئەحمەد، مالیک مستەفا...' کاتێک سەربازەکان ڕایانگرت و دەستیان لە باڵی کردەوە، بۆنی چیمەنێکی تەڕ سییەکانیان پڕ کرد، ویستی دابنەوێتەوە و دەست بە گیای چیمەنەکەدا بهێنێت، لە دەنگی هاوارێک ڕاچڵەکی و دیسان ڕاست لە شوێنی خۆی وەستا، دیسان دەستی کردەوە بە ناوهێنانی هاوڕێکانی سەردەمی منداڵی، ئەم جارەیان بە دەنگێکی بەرزتر ناویانی دەهێنا. دەنگێک لای چەپییەوە لە خەیاڵەکەی دایبڕی و بانگی لێ کرد: 'یاسین، یاسین، کوڕە من ئیسماعیلم، سمکۆی چی و جەلالی چی؟ بۆ ئەمشەو کێی تریان گرتووە؟'

'جا کێیان نەگرتووە، بە خودا لەوە ئەچێت شـــار کەســـی تێدا نەمابێت!'

دەنگێکی گڕ لای ڕاستیەوە بانگی کرد: 'یاسین، من ئەنوەرم، دەڵێم چیمان لێ ئەکەن، خۆ ڕەمیمان ناکەن؟!'

حەمەبۆر بە دەســـت دوو ســـەربازەوە بوو، بۆ ڕیزەکەی ئەوانیان دەهێنا، پڕ بە قورگی هاواری دەکرد: 'ئێوە بە ناحەق منتان گرتووە!'

ئەنوەر لای ڕاستیەوە لە بەر خۆیەوە گوتی: 'ئەمانە نیازیان خراپە و تازە ژیان دەرنابەین!'

'ئێ، چی بکەین، ئەنوەر ڕا کەین؟!'

ئیســـماعیل لە لای چەپیەوە بە دەنگێکی تێکشـــکاوەوە، کە زیاتر لە نووزە نووز دەچوو، گوتی: 'کوڕە برا کوشتنی چی! نا نا باوەڕ ناکەم، تۆ بڵێیت ئەوەندە ناعینســـــان بن، تەنانەت بێتاوانێکی وەک ئێمەش بکوژن؟!'

ســـــەربازەکان بە چواردەوریاندا بڵاو بوونەوە، هەرچواریان لە شـانی یەکەوە وەستابوون و نزیکی مەترێک لە یەکەوە دوور بوون، لە بەر خۆیانەوە قسـەیان دەکرد، کات درێژەی کێشـا و زیاتر لە دوو ســـەعات لەوێدا ڕایانگرتبوون، حەمەبۆر بە دەنگی بەرز و بە زمانی عەرەبی بەردەوام ئەوەی دەگوت: 'ئێمە ئاشتیخوازین، ئێمە بێتاوانین.'

ئیســـماعیل چەند جارێک بانگی لە یاســـین کرد و لێی پرســـی: 'یاسین، چیمان لێ ئەکەن؟'

یاسـین لە بەر خۆیەوە دەسـتی کردەوە بە ناوهێنانی قوتابییەکانی و بە جۆرێک لەناو خەیاڵەکانیدا بوو، ئاگای لە چواردەوری نەمابوو، هەســـتی بە جۆرێک لە پەشـــیمانی دەکرد و نەیدەویســـت بیری لێ بکاتەوە. تەزوویەک لە ســـــەریەوە تاوەکوو نووکی پێی چوو، وەک

کارەبا لێی دابێت، دڵی کەوتە پەلە پەل و هەناسەی لە سینگیدا گیری خوارد، گەیشتە ئەوەی بوو بە گریان و پاشان لە ژێر لێوەوە، وەکو بیەوێت کەس دەنگی نەبیستێت: 'ئەمە کۆتاییە، ئەوە بوو ژیان یاسین، ئیتر ئەوانەی خۆشم ئەوێن نایانبینمەوە.' بەردەوام ئەمەی لە بەر خۆیەوە دەگوتەوە.

بە خەیاڵ لە بەر دەرگەی ماڵی غالب عەربەتیدا بوو، کاتێک بەهار دەرگەی لێ کردەوە و دەستی گرت و بردیە ئەودیو دەرگە سەوزە ئاسنەکەوە، خۆیی لێ نزیک کردەوە و بۆنی بە گەردنیەوە کرد، بە بەهاری گوت، کە خۆشی دەوێت، پاشان ویستی ئەوەی پێ بڵێت، کە دەمێکە نامەیەکی بۆ نووسیوە، بەڵام دەرفەت نەبووە پێی بدات، لەو خەیاڵەیدا بەهار لێی دەپرسیی، ئاخۆ چی لە نامەکەیدا نووسراوە، مامۆستا یاسین تەنیا ئەوەندەی بە بەهار گوت.

پاشان لە ناکاو گوێی لە دەنگی میلهێنانەوەی تفەنگ بوو، لەو خەیاڵەی دابڕا، شڵەژا و کەوتە دەستجووڵاندن، بانگی لە هاوڕێکانی چواردەوری کرد و یەکیەک ناوی دەهێنان و داوای لێ دەکردن، کە تا لە توانایاندا هەیە ڕا بکەن، خۆیشی بەردەوام بە دەوری خۆیدا دەخولایەوە، بێئاگا بوو لەوەی لە کوێیە و چەند سەرباز لە چواردەوریان بە چەکەوە ڕاوەستابوون، هێشتا ناوی بەهاری لەسەر زار بوو.

ئەو ڕۆژە کەمالی حازم بەگ یەکێک بوو لەوانەی هاتە بەرامبەر مامۆستا یاسین و هاوڕێکانی، کە ئەوان ئاگایان لەوە نەبوو، دوو ئەفسەر و چوار سەربازی لەگەڵدا بوو، کەمال دەستنیشانی هەرچی کەسێکی دەکرد، سەربازەکان باڵیان دەگرت و جیایان دەکردەوە،

ئەوانەی جیا کرانەوە زیاتر لە سەد و شەست کەس بوون و پاشان بۆ دەرەوەی شار بران.

لە پشتی بەرزاییەکانی زەرگەتەوە، دیسان یاسین و هاوڕێکانی لە شانی یەکەوە ڕیز کرابوون، گوێی لە میلهێنانەوەی سەربازەکان بوو. دەنگی گوللەکان هاتن و وەخت بوو پەردەی گوێی بدڕێ، بە درێژاییی تەمەنی دوورونزیک گوێی لە دەنگی گوللە بووبوو، بەڵام هەستی دەکرد ئەمەیان زۆر نزیکە و ئیتر ڕۆحی لە جەستەیدا توانای ئارامگرتنی نەماوە، ئەژنۆکانی کەوتنە لەرزین و نێو لەپی پڕ بووبوون لە ئارەقێکی سارد، لەگەڵ بەردەوام بوونی دەنگی گوللەکاندا وەختە بوو دڵی لە قەفەسەی سینگیدا بفڕێ. بۆنی بارووتی دەکرد، دەنگی گوللەکان تاوەکوو دەهات نزیک دەبووەوە. بانگی کرد: 'هاوڕێیان، ئەنوەر، سمە گیان، حەمەبۆر... مەترسن، مردن وا خەریکە دەگات.'

سینگی پڕ بووبوو لە بۆنی بارووت و گڕ، ئەژنۆی دادایە سەر زەوی و لە خەیاڵی خۆیدا گوتی: 'مام زامن، خۆزگە دەنگی شریخەی ئەو گوللانە کۆتاییان ئەهات!'

# ١٤

پاییزی ســـاڵی ١٩٦٣ بوو، ئەو ڕۆژانەی گوڕە بە کۆمەڵەکانیان لە دەرەوەی شار دۆزییەوە، من دوو ڕۆژ بوو گەیشتبوومەوە سلێمانی، یان باشـــترە بڵێم؛ چەند ڕۆژێک بوو لە بەندیخانە ئازاد کرابووم، کاتێک گەیشـــتمەوە ماڵەوە، هەموو بێدەنگ و خەمبار دیار بوون، عەزیزی برام باوەشی پێدا کردم و هەواڵی مردنی دایکمی پێ گوتم و چیرۆکی مردنەکەی بۆ گێڕامەوە. دوای بیســـتنی ئەو هەواڵە، بە تەنیا لە گەڕەکی قەزازەکانەوە بۆ ســـەرشـــەقام و ماڵە کۆنەکەمان چووم، بەردەوام دەگریـام و نـازانم بۆچی ڕام دەکرد. کـاتێـک گەیشـــتمە گەڕەکی سەرشەقام، یەکیەک دەستم لە بەرد و خشتەکان دەدا، چەند جارێک ســـینگم توند بە دیواری ماڵە ڕووخاوەکەمانەوە نووســـاند. زیاتر لە سێ سەعات لە نێو داروپەردووی ئەو ماڵەدا بووم، هەستم دەکرد هێشـــتا ڕۆحییانەتی حەلاوەخانی دایکم لەوێ بێت. هەناســـەم لەبەر بڕابوو، لە پاڵ دیوارە ڕووخاوەکانیدا دانیشتم و سەرم نایە نێو ئەژنۆکانم، نازانم چاوم چووبوونە خەو یان لە هۆش خۆم چووبووم، کەسێک دەستی گرتم و بە هێزێک هەڵی سانمە سەر پێ، کاتێک چاوم کردەوە، بەهارم بینی، ڕەنگی گۆڕابوو، یان باشـترە ئەو ڕاسـتییە بڵێم کە ڕوخســـاری شـــێوابوو، قژی بەســـەرەوە نەمابوو، نەمناســـییەوە، تاوەکوو پێی گوتم: 'جەلال گیان، نیازێک بخەرە دڵتەوە، کە منم، کە ژیانیش کۆتایی هات، وەعدبێت منیش لێرە چاوەڕێتم؟'

سەرم داخستبوو، نەمتوانی لێی بڕوانم، هەروەها وەڵامیشم نەدایەوە.

ئێوارەی ئەو ڕۆژە ئەوەم بیست؛ کە ڕۆژی مەنعەتەجەولەکە هەواڵی ئەوە لە گەڕەکی سەرشەقام بڵاو بووەوە، کە کچ و دایکێک خۆیان سووتاندووە. خەڵکی لەبەر بارگرانی و ترس، کەس نەیپەرژابووە سەر ئەوەی، کە بە دوای ئەو هەواڵەدا بچێت. ئەو ماڵەش ماڵی غالب عەربەتی بووبوو، کە تاوەکوو خانووەکەیان خاپوور دەبێت کەس بە هانایانەوە ناچێت. هەرچەندە بەهار بە سووتاوی خۆی لە پەنجەرەوە ڕزگار دەکات و بە گڕەوە بە کۆڵانەکانی گەڕەکی سەرشەقامدا ڕا دەکات. تەنیا سەرباز و پۆلیس چاویان لێی دەبێت، دواتر یەکێک لە پۆلیسەکان بە جەلال دەڵێت؛ کە ڕووتوقووت بوو. تەنیا ژێرکراسێکی لە بەردا بوو، کە ئەویش بە سەر پێستیدا توابووەوە.

'بەهار و حەلیمەی دایکی لە ڕۆژی مەنعەتەجەولەکەدا خۆیان سووتاند!' خەڵکی گەڕەک وایان دەگوت. قەدرییەی ژنی حەمەدەمینە سووری دراوسێیان دەیگوت: 'پێش ئاگرەکە گوێم لە دەنگی چەند پیاوێک بوو، ئیتر نازانم کێ بوون، دواتر قیژەی بەهار و دایکی ڕۆژەڕێیەک ئەڕۆیشت، دەی ڕۆڵە گیان، ئەبێت کێ دەرگەکەیانی شکاندبێت؟! نازانم، خۆ ئەو ڕۆژە قیامەت هەستابوو.'

'ئەو خەڵکە نەیاندەویست هیچ لەبارەی سووتانی بەهار و دایکییەوە بڵێن، وەک بڵێیت لەسەر جەستەی هەموویان برینێک هەبێت و لەگەڵ هێنانی ناوی ئەواندا بکولێتەوە. ئەو ڕۆژانە ڕەحیم موکریانی و مالیک وەکوو سێبەرەکەم بەردەوام بێدەنگ بە دوامەوە بوون، زووزوو لێم نزیک دەبوونەوە و باوەشیان پێدا دەکردم. کاتێک گوێم لێ دەبوو، کە بەهار و دایکی خۆیان سووتاندووە، ئەو قسەیەی مام زامنم بیر دەکەوتەوە، کە دەیگوت: "ژنەکان ئەبەد خۆیان ناسووتێنن، ئەوە درۆی پیاوەکانە، چونکە ژن لە سروشتیدا مەرگدۆست نەبووە!"

پاشـــــان ئەوەم بیســـــت؛ کە بەهـاری غـالب عەربەتی مـاوە و لە نەخۆشـــخانەیە، نازانم تا چەند ئەوە ڕاســـت بوو، لەگەڵ مـالیک ئافرەتێکی ســـووتاومان لە ناو جێگەدا بینی، هیچ جێگەیەکی ســاغی نەمابوو تاوەکوو بیناســـمەوە. کاتێک دکتۆرەکان پێیان گوتین، کە هەموو هەوڵێکیان لەگەڵی داوە و بەختی ژیانی زۆر کەمە، منیش خێرا نەخۆشخانەکەم بەجێ هێشت.

ئەو ڕۆژە پێنج شـەممە بوو، شـار کشـومات و هەموو ڕەشپۆش و دڵشـــکـاو دیـار بوون، تـاوەکوو ڕۆژی دواتر؛ لە مزگەوتەکـانەوە گوتارخوێنەکان هەموو ئەوانەیان بە شـــەهید ناو برد، کە لە ســـێ مانگی ڕابردوودا کوژرابوون یان هێشـــتا بێســـەروشـــوێن بوون. لە دوای ئەمەوە ئیتر خەڵکی شـار سـوکنایی بە دڵیاندا هات. وەکوو بڵێی دڵنیا بووبن لەوەی کوژراوەکان ژیانی ئەبەدی و بەهەشـــتییان پێ براببێت، ئیتر بۆ هەرگیز و بە درێژاییی تەمەنیان باســـی ژمارەی کوژراو و گەورەیی تـاوانەکـانیـان نەکردەوە. ڕۆحی کوژراوانیش جارێکی تر بۆ ئەو شـــارە نەگەڕانەوە. تەنانەت نووســـەرەکانی هاوڕێشم، ئەو تاوانانەیان لە بیر چووەوە و دەربارەی نەیان نووسی، پاشـان ئەوانەی لە سـەربازگەی حامییە گیرابوون، دوای شـەش مانگ ئازاد کران و گەڕابوونەوە ماڵەوە، بۆ چەند مانگێک لە ناو جێگەدا بوون. هەندێکیان تووشـی سـیل بووبوون، یان لە برسـاندا ئەوەندە وشک هەڵهاتبوون، بە تەمەنیان نەهاتنەوە سەر خۆیان.

پێم وا بێت لە بێزاری و تووڕەبوونمەوە بوو، لە یانەی فەرمانبەران لەگەڵ کامەران موکری و حسـێن عارف دانیشـتبووم، پێم گوتن: 'پێ دەچێت خەڵکی ئەم شـــارە لە لایەن پیاوچاکێکی وەک مام زامنەوە

لەســـەر هەڵەیەکیان یان تاوانی ژن ســـووتاندن نزایان لێ کرابێت.'
هەردووکیان بەو قسەیەم پێکەنین.

دوای چەند مانگێک، هەندێک لە نەتەوەیی و شـــەلاتییەکانی شـــار بووبوون بە بەکرێگیراوی حکومەت و مـاڵ بە مـاڵ بە دوای شـــیوعییەکاندا دەگەڕان. بنکەکەی جارانیان لە کانی ماســـی لە خواروی شار ئاوەدان کردبووەوە، هەرچی کەسێکیان دەگرت، تەنیا بە کوشتن وازیان لێ نەدەهێنا، بەڵکوو وەک جەمالی سـەگ، لەپێشدا تا مرۆڤانە هەســـتیان بریندار دەکرد، ســـواری دەبوون، میزیان پێدا دەکرد، پاشان بە زیندوویی ئاگریان لە جەستەی بەر دەدا.

دوای نیوەڕۆیەک لەگەڵ ڕەحیم موکریـانی لە کتێبخـانەی ئەوقـاف بووین، کاتێک هاتینە دەرەوە ڕەحیم پێی گوتم، کە ئەو دوو کەســـە چاودێریمـان دەکەن. لەو کاتەدا ڕەحیم ئاوڕی دابووەوە و دەســـتی بەرەو ڕووی دوو پیاوی گەنجی کورتەباڵا ڕاکێشا، کاتێک لێم ڕوانین، کەســـیانم نەناســـی. وا بزانم بە ڕەحیمم گوت، کە لێیان نەڕوانێت. لەگەڵ ڕەحیم بە نیـاز بووین، بۆ مـاڵی مـامە عەبدوڵڵام لە گەڕەکی ســـەرشـــەقام بڕۆین. لە ژێر پردەکەی شـــەقامی مەولەوییەوە بەرەو مەیدانی ماستەکە داگەڕاین، لەگەڵ ڕەحیم باسی شیعرمان دەکرد، کە کەمالی حازم بەگ بەرەو ڕووم هـات و بەبێ ئەوەی چۆنی چاکیم لەگەڵدا بکات، گوتی: 'ئەوە ماویت، تۆش لە توخماتی دڕک و داڵیت لەناو ناچیت!'

بێدەنگ لێم ڕوانی، نازانم بۆچی وەڵامم نەدایەوە، پاشان تێپەڕی و ئێمە گەیشتبووینە خوار مەیدانی ماستەکە، ڕەحیم گوتی: 'جەلال بە دوامانەوەن.'

من ئاوڕم نەدایەوە و لەبەر خۆمەوە بە ڕەحیمم گوت: 'خێرا بڕۆ، لە سەرشەقام خۆمانیان لێ ون دەکەین.'

گەیشتبووینە سەر شیوی قازی و نزیک ماڵی بەهاری غالب عەربەتی، ڕەحیم بەردەوام ئاوڕی دەدایەوە، گوتی: 'جەلال، وا بزانم کۆڵیان لێ داین.'

نازانم لەوێوە پەیدا بوون، لە چەند هەناسەیەکدا، کەمالی حازم بەگ و سێ کەسی تر چواردەوریان گرتین، ڕووم لە کەمال کرد و پێم گوت: 'چیتان لێمان دەوێت؟'

یەکێکیان پێی گوتم: 'شیوعیی خوێڕی، منداڵی سەر بێشکەتان ئەگێین!'

'بێڕەوشت، هەموو شتێکتان لەدەست دێت!'

من ئەمەم گوت و کەمال لوولەی دەمانچەکەی خستە سەر سینگم، نازانم چۆن ڕەحیم فریا کەوت، پەلاماری دا و ڕووی دەستی پێ گۆڕی، کەمال دوو فیشەکی تەقاند، ویستم ڕا بکەم بەڵام کە ڕەحیمم بینی لەگەڵ کەمال کەوتبووە زۆرانگرتن، خێرا پەشیمان بوومەوە، یەکێک لەو سیانەی لەگەڵ کەمالدا بوو، کەوتە شەق تێهەڵدانی ڕەحیم، دووانەکەی تر پەلاماری منیان دا، یەکێکیان دەمانچەی دەرهێنا، کاتێک دەستی هەڵبڕی و بەرەو ڕووم ڕایگرت، لە پشتمەوە، گوێم لە دەنگی کاکە عەزیزم بوو: 'نەکەیت، دەستت داگرە هەتیو.'

کەمال و هاوڕێکەی دەستیان لە یەخەی ڕەحیم بەر دابوو، کاتێک کاکە عەزیز و سمایل پاڵەوان و کەریمی عەبەخڕە گەیشتن، خێرا

هاتنە بەردەمی من ڕاوەستان، ڕەحیم ئەوەندە تووڕە بوو، بەردەوام جنێوی پێ دەدان و تفی لێ دەکردن. ئەوان چوار و ئێمە پێنج کەس، وەکوو بڵێی لە دوورەوە چاودێرییان کردبین، جێبێک هات و لە پشتیانەوە ڕاوەستا، پشتاوپشت چوونە دواوە، کاتێک ویستیان سواری جێبەکە ببن، کەمال و یەکێکی دریژی ڕەقەڵەیان تەقەیان لێ کردین، لە نێواندا بەتایبەتی لە من دەگەڕان، دەتوانم بڵێم سمایل پاڵەوان و کەریمی عەبەخڕە خۆیان بۆ من کرد بە قەڵغان، کە سمایل دوو فیشەک و کەریم سێ فیشەکی بەر کەوتبوو. ئەوان سواری جێبەکە بوون و ڕۆیشتن، من و کاکە عەزیزم بە دیاریانەوە بووین و ڕەحیم بە ڕاکردن بۆ فولکەکەی خانەقا چوو، تاوەکوو ئۆتۆمبێلێک بهێنێت و بیانگەیەنینە نەخۆشخانە. هەردووکیان بە سەختی بریندار بوون، لە حەوشەی نەخۆشخانە، لە کاکە عەزیزم پرسی: 'ئەوانە کێ بوون؟'

'کەمالی حازم بەگ، عوسەی ئامەدرێژ، مچەی بابەگەورە، قالە تەگەرانی.'

'تەنیا کەمالی حازم بەگ دەناسم.'

درەنگانی شەو، من لە ماڵی مامە عەبدوڵلام بووم، کاکە غەفوورم هات، بێزار دیار بوو، دەستی هەڵدەگلۆفین و بەردەوام لە ڕاستەوە بۆ چەپ دەچوو، لەبەر خۆیەوە گوتی: 'ئەمڕۆ بە بەرچاوی شارێکەوە زیاتر لە دە کەسایەتی بێتاوان و کاسبکاری شیوعییان کوشتووە. کە زۆر بەیان لەسەر وەختی پەیداکردنی بژێویدا، لە کرێکاری و دووکانەکانیاندا کوژراون. ئەوپەڕی شەرمەزارییە.'

من ویســـتم هەواڵی بریندارکردنی ســـمایل پاڵەوان و کەریمی عەبەخڕەی پێ بڵێم، بەڵام کە ئەوەم لێ بیست، لێم پرسیی: 'کاکە چی بووە؟'

'ئینجـا چی نەبووە، ئەمڕۆ و تـاوەکوو ئەم دەقەیە، زۆربەی هاوڕێکانمانیان کوشتووە.'

'تا ئەم دەقەیە کێ کوژراوە؟'

'جاری ڕوون نییە و نازانم.'

کاکە غەفوورم ئەوەندەی گوت، پاشـــان تاوەکوو خەوی لێ کەوت هیچی نەگوت.

ڕۆژی دواتر کاکە عەزیزم هات و من و کاکە غەفوورمی لە ڕێگەی دەربەنـدیخـانەوە بە لۆرییەکەی بەرەو بەغـدادا دەربـاز کرد، لە سەرەتاوە ئەوەی پێ گوتین، کە سمایل پاڵەوان و کەریمی هاوڕێی لە خەســـتەخانە بە برینداری گواســـتووەتەوە بۆ ماڵی شـــێخ عەلی بەرزنجی، چونکە لەوێش گیـانیـان پـارێزراو نەبووە و بەردەوام چاودێرییان کردوون.

کاکە غەفوورم بە درێژاییی ئەو ڕێگەیە بێدەنگ بوو، ئەوەندە نەبێت پرسیی: 'عەزیز کێ کوژراوە؟'

'ئەوەندەی من بزانم؛ هەردوو برا ساڵح و عەبدوڵڵای میرزا دوێنێ بەیانییەکەی کە لە هەویریان دەشێلاندا، عوسمان سەیوانی بەرگدروو، عومەری مام عەلی لە ناو دووکانەکەی و لە حاجی حان، ئەوڕەحمانی ساڵحی خلە و مەلا عەلی، مەلا حەمەئەمین ئەویش لە ناو دووکانەکەیدا کوژراوە، عارفی وەســـتا حەســـەن کۆپاندروو، لەگەڵ کاک نووری حەمە عەلی.'

لە کاکە عەزیزمم پرسی: 'تۆ بڵێیت بکوژەکان هەر ئەوانە بووبن کە دوێنێ تەقەیان لە ئێمە کرد؟'

'نا، بێقەزا بیت، کەمالی حازم بەگ، قالە تەگەرانی، سالەی قالە حەلاو (سالەپیر)، حەمەی عەزیز، عەلی ئیبراهیم دەرویش، عوسەی ئامەدرێژ، عەبدوڵڵا قەرەتۆغانی، مچەی بابەگەورە، عەبە لالە، کەمال بەرقی، حەمەڕەشیدی ئەحە شانە و کەریم ددانزێڕ، ئەوانەن بینراون و ناویان زانراوە، بەڵام دەستەیەکی تریش هەن و سەرپەرشتیی ئەم تاوانبارانە ئەکەن. ئیتر کێن مەگەر خوا بۆ خۆی بزانێت.'

لە دوای ئەمەوە، هەرسێکمان بێدەنگ بووین و بۆ ماوەی چەند سەعاتێک تەنیا گوێم لە گرمەی مەکینەی لۆرییەکەی کاکە عەزیزم بوو، لە خەیاڵی خۆمدا بیرم لەو دوو ساڵەی ڕابردوو دەکردەوە. ئەو ڕۆژانەی لە بەندیخانە ئازاد کرابووم، هەندێک کەس پێیان گوتم؛ بەختدار بوویت کە لە مەنعەتەجەولەکەدا لێرە نەبوویت. بەڵام نەیاندەزانی لەدەستدانی هاوڕێکانم و بەهار، بە تایبەتی حەلاوەخانی دایکم، برینێکی ئەوەندە قووڵیان لەسەر ڕۆحم بە جێ هێشتبوو کە بە درێژاییی تەمەنم سارێژ نەدەبوو. لەدەستدانی ئەوان، بۆشاییییەکی ئەوەندە گەورەیان لەو شارەدا لە دوای خۆیان بەجێ هێشتبوو، کە من وام دەزانی تەنیا بە نووسینی شیعر دەتوانم پڕیان بکەمەوە. هەروەها فەوتانی دەفتەری شیعرەکانم، کە پێش گیرانم، لە لای مامۆستا یاسین دامنابوو، دوای ڕووداوەکان بۆماڵیان چووم، بەڵام کاتێک کەسوکاری مامۆستا یاسینم بینی، کە بە نەمانی کوڕەکەیان چەند دڵشکاون، ئیتر باسی دەفتەری شیعرەکەمم لەگەڵدا نەکردن.

چەند جارێک ویستم بۆ لای مام زامن بچم و وەکوو هەموو جارەکانی تر دەردە دڵی خۆم لە لای ئەو فریادڕەسەم بکەم، بەڵام

هەرچەندم کرد، ڕێگەم نەدەکەوتەوە سەر دووکانەکەی. لە دوای ئەو ڕۆژەوە لەو شارەدا خۆم بە غەریب دەزانی.

کاتێک لەگەڵ کاکە غەفوورم و عەزیز سلێمانیم بەجێ هێشت، هەستم دەکرد ئەو شارە جێگەیەکی بۆ من تێدا نەماوە. ڕۆحم لەژێر کاریگەریی بیستنی ئەو جنێو و تاوانانەدا وردە وردە خەریک بوو سرووشتی خۆی لەدەست دەدا و بە ڕق بارگاوی دەبوو. ئەوەش تەنیا شت بوو، کە هەردەم لێی دەترسام.

## ١٥

دوای ئەوەی جەلال سلێمانیی بەجێ هێشت، لە شاری بەغدا، لە یانەی ئەلوەن لەگەڵ فەلاح مستەفای شاعیردا دانیشتبوو، لەبەر ئەوەی جاری یەکەمیان بوو یەک ببینن، هیچیان بە ڕوونی و دڵکراوەیی باسیان لە توانای خۆیان لە بواری نووسیندا نەدەکرد، تەنیا ئەوەندە نەبێت، هەردووکیان وا قسەیان دەکرد، کە ئەوان دواهەمین کۆمۆنیستی عێراق بن. ڕێکخستنەکانی ئەو پارتەیان لە بەسرەوە تاوەکوو زاخۆ سەرلەنوێ شاعیرانە دامەزراندەوە. دوای ئەوەی پێکەوە دوو لیتر عارەقیان خواردەوە، باسی سەردەمی سەرهەڵدانی شیعری ئازادیان لە عێراق کرد، جەلال باسی ئەو نامیلکە شیعرییەی بلند ئیبراهیم حەیدەریی کرد، کە ساڵی ١٩٤٦ نووسیبووی. پێی گوت؛ ئەو شاعیرە کوردە یەکێکە لە ڕابەرانی شیعری ئازادی عێراقی کە بە عەرەبی نووسرابێت. دوای ئەوە فەلاح مستەفا شیعرێکی خۆیی بۆ خوێندەوە، جەلال لە کاتی خوێندنەوەی شیعرەکەدا دوو جار پێی بڕی، جارێک داوای پارمەتیی لێ کرد و چوو بۆ ئاودەست. جاری دووەم، بانگی لە شاگردێک کرد. بەڵام دڵی نەهات ئەوە بە فەلاح مستەفا بڵێت، کە ئەو شیعرە دەقاودەق شیعرێکی نازک مەلائیکەیە و ئەو تەنیا لێرە و لەوێ چەند وشەیەکی گۆڕیوە.

دوای ئەمە، ڕوخسەتی لە فەلاح مستەفا خواست و بەجێی هێشت. میوانەکەی بێدەنگ بە سەرسوورمانەوە لێی دەڕوانی. فەلاح مستەفا لە عەمارەوە بە تایبەتی بۆ لای جەلالی میرزا هاتبوو.

ئەو مانگە دڵی هەموو برا و هاوڕێکانی، بێجگە لە مالیک، لە خۆی ئێشـــاندبوو، چونکە نەیدەتوانی ئازاری برینەکانی ســـەر دڵی لە بیر بکات. بەردەوام بیری لێ دەکردەوە و قســـەکانی دایکی و بەهار لە خەیاڵیدا دووبارە دەبوونەوە.

کاتێک لە یانەی ئەڵوەن هاتە دەرەوە، نەیزانی دەســـتی چەپی یان ڕاستی شـەقامەکە بگرێتە بەر، وەک پیشـەیەکی بەردەوامی ئەو چەند هەفتەیەی ڕابردووی، کاشـیی سـەر شـۆسـتەکەی ژمارد. تاوەکوو ژمارە یازدەی دەژمارد، دوای ئەوە، بەردەوام ئەو ژمارەیەی دووبارە دەکردەوە، لەســـەر ڕاســـتە هێڵێک پێی بە دوای یەکدا دادەنا، تاوەکوو بزانێت، خواردنەوەکە چەند کاریگەریی هەبووە، لە خەیاڵی خۆیدا ئەوەی بە خۆی گوت، دەبێت شـیعرێک بۆ بەهار بنووسـم، پاشـان لە ژێر لێوەوە:

'شیعرێک بۆ خەزان!' ناوی بەهاری گۆڕیبوو بە خەزان.

تەنیا ئەوەندە، پاشـــان هەناســـەی لە بەر بڕا و لە جێگەی خۆی ڕاوەســـتا و دەســـتی کرد بە کۆکین. لە دوای ئەو ڕووداوەوە چەند شـــیعرێکیشـــی بە ناوی خەزان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاو کردبووەوە، لە بەر خۆیەوە گوتی:

"گیانە نەمویست

بەم چەند دێڕە

لاڵ و کوێرە،

بڵێم: تۆم ویست

چونکە هەرچی وزە و توانای

شیعرە هەمە.

هەڵیرێژم. بۆتی بڵێم

هێشتا کەمە."

ئەم چەند دێرە هەفتەیەک بوو لەســـەر زاری بوو، نەیتوانیبوو بیخاتە سەر کاغەز. ڕقێک لە دڵیدا بوو، بەرامبەر بەوانەی زوڵمیان لێ کردبوو، بەڵام نەیدەویست خۆی ڕادەستی ئەو ڕق و تووڕەبوونەی بکات.

دوای ئەوەی شـەقامی سـەعدوون کۆتاییی هات، بە هەمان ڕێگەدا گەڕایەوە. ئەوســـا زانیی، کاتێک لە کافتریای ئەڵوەن دێتە دەر، ئەگەر بیەوێت سەر لە دایکی بدات، دەبێت بە دەستەڕاستدا بڕوات.

لە شەقامی سەعدوونەوە بۆ گۆڕستانی شێخ مارفی کەرخی چوو. بۆ ســــەر گۆڕی حەلاوەخانی دایکی، کە لەو ڕۆژەوەی بۆ بەغدا گەڕابووەوە لە ماڵەکەی خۆی زیاتر بۆی دەچوو. چەند جارێکیش لەوێ بە شەو مابووەوە و بە دیار گۆڕەکەیەوە خەوی لێ کەوتبوو.

درەنگانی شەو گەیشتە بەردەمی سینەما غەرناتە، لە شەقامی بەتاوین، وەکوو خوویەکی ڕۆژانەی لە پۆســــتەری فیلمەکانی ڕوانی، تەواو ماندوو بووبوو، ســـەعاتەکەی دەســتی، دووی شـەوی نیشـان دەدا. ئەپارتمانەکەی دەکەوتە پشـــتی ســـینەمـا غەرنـاتە و بەرامبەر هۆڵی کۆڵبەنکیان. کـاتێـک ویســـتی دەرگەی ئەپارتمانەکەی بکاتەوە، ســــەبیحە خەلدوونی دراوســــێی هاتە دەرەوە و لە دواوە سـڵاوی لێ کرد، سـەبیحە پێش جەلال و چوار سـاڵ پێش ئەو ڕۆژە لەگەڵ مێردەکەی لە بەســـرەوە هاتبوونە ئەو ئەپارتمانە، بۆ ســـاڵێک دەچوو حەمید ساڵحی مێردی لە بەندیخانە بوو، کە دوای تەواوکردنی خوێندن لە بەسرەوە دێنە بەغدا، چونکە لە پۆلیسـی بەسـرە فەرمانی گرتنیان دەردەچێت.

سـەبیحە خەلدوون هەموو ڕۆژێک چەند جارێک لە دەرگەکەی جەلالی دەدا و هەرچی خواردنێکی دروسـت دەکرد بەشـی ئەوی دەبرد، وەک هەموو جارەکانی تر دەیگوت: 'هەموو هیوام تۆیت، کە هەواڵێکی حەمیدم بۆ بزانیت.'

بەڵام تاوەکوو ئەو شـەوە جەلال پێی نەخسـتبووە ناو دەرگەی ماڵەکەی و هەروەها ڕێگەی نەدابوو سـەبیحە خەلـدوون نـاو ئەپارتمانەکەی ئەو ببینێت.

جەلال کلیلەکانی بە دەسـتیەوە بوو، سـەبیحە بە دوایدا هاتبوو، پاشـان دەسـتێکی بە شـانی جەلالەوە گرت و بە دەسـتەکەی تری کلیلەکانی لە دەسـتی وەرگرت، وەک بڵێیت لە پشـتەوە لە باوەشـی گرتبێت، کاتێک جەلال خۆی ڕاسـت کردەوە و ویسـتی ئاوڕی لێ بداتەوە، سـەبیحە گۆی مەمکە قوتەکانی توند نووسـاندبوو بە ناو شانیەوە، جەلال ئاوڕی لێ دایەوە و دەموچاوی چووە سەر سینگ و نـاو قژی، دەرگەکە کرایـەوە، کە تەنیـا جووت کرابوو، قوفڵـەکـەی شـکابوو. سـەبیحە لە دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژەوە چاوەڕوانی جەلال بوو، کە ئەو هەواڵەی پێ ڕابگەیەنێت.

لەگەڵ خۆیدا بردییە ژوورەوە و دەرگەکەی بە دوای خۆیدا جووت کرد، جەلال ویسـتی خۆی لێ دوور بخاتەوە، بەڵام ئەوەندە مەسـت بوو، نەیتوانی دەسـت بەرز بکاتەوە، باڵەکانی وەک دوو پارچە پەڕۆ بەملاولایدا بەر بووبوونەوە، لـە سـەبیحـەی ڕوانی و خۆی پێوە نووساند، لە بەر خۆیەوە گوتی:

"ئازیزەکەم

من ئەمەوێ هەر وەکوو شێت

ڕێ بگرم لێت

هەرچیم بویّ
داوای کەم لیّت.
من ئەمەویّ گوڵی ئاگر
لەجیاتیی زێڕی سارد و سڕ
بکەم بە قژی ژاکاوتا
بە بەرۆکی وەک هەتاوتا."

سەبیحە زەردەخەنەیەکی بۆ کرد، دەستی کردە ملی، بە نازەوە پێی گوت: 'چیت گوت؟ بۆ شیعرێکم بە عەرەبی بۆ ناخوێنیتەوە؟'

گەیاندییە سەر قەنەفە درێژکۆڵە ڕەنگسەوزە سیّ نەفەرییەکەی، هێشتا دەستی لە ملیدا بوو، لەسەر قەنەفەکە ڕاکشا، پێی گوت: 'ئوستاز جەلال، هەواڵی حەمید نەبوو؟'

جەلال هەوڵی دەدا دەست بە دەموچاویدا بێنێت، وەک هەڵبڕینی چاوەکانی پێویستیان بە هاوکاریی سەری پەنجەکانی بێت. سەبیحە قەیتانی پێڵاوەکانی بۆ کردەوە، بەجێی هێشت و گەڕایەوە بۆ ئەپارتمانەکەی خۆی.

جەلال دەستی لەسەر دەموچاوی دانابوو، گڵۆپی سەر جادەکە، ناو ماڵەکەی ڕووناک دەکردەوە، باڵای دارگڵۆپەکان تاوەکوو قاتی دووی ئەو ئەپارتمانە هەڵچووبوون.

کاتێک سەبیحە گەڕایەوە، قاپێکی فافۆن و زەرفێکی بۆری پیّ بوو، تەپڵەکێکی لاکێشەی ڕاکێشایە بەردەم قەنەفەکە و قاپەکەی لەسەر دانا، نانێکی لە زەرفەکەدا دەرهێنا، پاشان لە تەنیشت ڕانی جەلالەوە دانیشت: 'دەی ئوستاز جەلال، تۆزێک نان بخۆ.'

جەلال لە بەر خۆیەوە گوتی: 'چۆن گیرم خواردووە!'

ســـەبیحە لە بەر ئەو بەلوعەیەی لە ســـووچێکی ژوورەکەدا بوو، لچکی ماکســـییەکەی تەڕ کرد، دەموچاوی بۆ ســـڕی، دوای ئەوەی جەلال چاوی کردەوە، دەســتی بۆ لای ســـەبیحە درێژ کرد، ســـەبیحە دەستی گرت و نای بە سینگی خۆیەوە. لەســەر مەمکی ڕاستی داینا: 'فەرموو ئوستاز.'

'سەبیحە، خۆزگە بەختێکت بۆ ئەگرتمەوە!'

'چییە ئوستاز گیان؟!'

'تۆ بەختت بۆ لایەک لەو شـــاری بەغدایە گرتووەتەوە، دەی بزانە من چیم لە چارەدا نووسراوە؟!'

'مادام تۆش، کۆمۆنیستیت، ئەمشـەو دواشـەوی تەمەنتە، ئیتر وەک ئەو مێردە قوڕبەسەرەی من...'

'چۆن، مەبەستت چییە؟'

'ئەوە نییە دەرگەی ماڵەکەتیان شـــکاندووە! ئیتر تۆش دەڕۆیت و لەم وڵاتەدا ئاسەوارت نامێنێت!'

'کێ، بۆچی؟'

'ئەمڕۆ پۆلیســەکان هاتن و دەرگەی ماڵەکەتیان شـکاند، ئوسـتاز دڵنیام بۆ گرتنت هاتبوون.'

'تۆ بەختێکم بۆ بگرەوە؟'

'ئێ ئەوە بەختی تۆیە، ئیتر لەوە زیاتر چیت پێ بڵێم.'

'بۆچی خۆ تۆ هێشتا لە نێو لەپمت نەڕوانیوە؟'

'لە دوای نیوەڕۆوە پۆلیســەکان ســێ جار هاتوونەتەوە، تا تۆزێک لەمەوپێش یەکێکیــان بەو نــاوەدا دەخولایەوە و نــازانم چۆن نەیانگرتوویت؟'

'لێم بگەڕێ، زۆر ماندووم، نازانم باسی چی ئەکەیت!'

'تکات لێ دەکەم ئوســـتاز جەلال، با تۆش وەک حەمید نەگیرێیت، وەرە لای خۆم بتشارمەوە!'

ســەبیحە دەســتی خســتە ژێر پشــتی و لەســەر قەنەفەکە ڕاســتی کردەوە، قاپە فافۆنەکەی لەسەر ڕانی خۆی دانا و شلەی فاسۆلیاکەی تێکەڵی برنجەکە کرد، هەوڵی دا بیکـات بە دەمیـەوە، هێشـــتـا کەوچکەکەی بەرەو ڕووی ڕاگرتبوو، جەلال گوتی: 'دوایی بەختێکم بۆ بگرەوە!'

'خێرا دوو کەوچک بخۆ و با بچین بۆ لای من، نەوەک پۆلیســەکان بێنەوە.'

'لە دەفتەرەکەی ســەر ئەو مێزەدا شــیعرێکی عەرەبیم نووســیبوو، ویستم بۆت بخوێنمەوە!'

'دەفتەری چی؟ دەی من لەوســـاوە باســـی چیت بۆ دەکەم، باوەڕ ناکەمماڵەکەت لەم قەنەفە و تەپڵەکە زیاتری تێدا مابێت.'

کاتێک ســـەبیحە ئەمەی پێ گوت، لە بەر خۆیەوە: 'چۆن؟ دیســـان، ئەو شیعرانەیشم تیا چوون؟'

'چیت گوت ئوستاز؟'

'ســـــەبیحە، خۆزگە جارێک لە بەختی منت ئەڕوانی، بەڵام زۆر بە ڕاستگۆیی پێت ئەگوتم، کە چیم لە چارەدا نووسراوە!'

'دڵم دەڵێت، دەڕۆیت و ئاسەوارت نامێنێت!'

'خوا تۆش بگرێت!'

جەلال تاوێک بێدەنگ بوو، سەری بۆ ڕانەدەگیرا و هێواش هێواش خواردنەکەی دەجوی، ســـــەبیحە کەوچکێکی پڕی بەرەو ڕووی ڕاگرتبوو. هێزی تێدا نەمابوو و بەردەوام بە لادا دەهات. پاشـــــان

قاپەکە و پێڵاوەکانی برد و خێرا گەڕایەوە، جەلالی ڕاست کردەوە و چووە ژێر باڵی و بردی بۆ ئەپارتمانەکەی خۆی.

باڵای لە باڵای جەلال بەرزتر بوو، ئافرەتێکی قژکورتی باڵابەرزی گەنمڕەنگ بوو، چاوی گەورە و ڕەش بوو، ڕۆژانە بە بازاڕدا دەگەڕا و بەختی بۆ خەڵکی دەگرتەوە، دەستی پیاوانی دەگرت، هەندێک لەبەر جوانییەکەی ڕۆژی چەند جارێک بەختییان لە لا دەگرتەوە.

دوای ئەوەی جەلالی لە ناو جێگەکەی خۆیدا پاڵ خست، دەستی گرت و بۆ یەکەم جار تەماشای نێو لەپی کرد، پاشان جلەکانی لە بەر داکەند و بە زەیتی زەیتوون شێلای، چووە باوەشییەوە و تەنیا سێ سەعات پێکەوە نووستن.

تیشکی خۆرەکە لەسەر جێگەکەی دابوون، جەلال لەسەر جێگەکە دانیشتبوو، بێدەنگ لە سمت و ڕانی ڕووتی سەبیحەی دەڕوانی، دەستی بە پشتیدا گێڕا و خۆیی بە سەردا درێژ کرد، دەموچاوی خستە نێو قژییەوە، دیار بوو سەبیحە بە ئاگا هاتبوو: 'ئوستاز تۆ بە دەستی کچێکی لاو دەکوژرێیت!'

'ئەو کچە مرد!'

'دەی کە واتە ئەو بە مردووییش وازت لێ ناهێنێت.'

## ١٦

سەعات دەی سەرلەبەیانی گەیشتمە ئۆفیسی ڕادیۆی بەغدا، شەوی پێش ئەو ڕۆژە نەخەوتبووم، مالیک و قادری برام میوانم بوون، پێکەوە باسی ئەوەمان کرد، کە تاوەکوو ئەو ڕۆژە چەند جار گیراو یان دەستبەسەر کراوین، لەبەر خاتری مالیک لێدوانەکانمان بە ئاماژە یان لەسەر کاغەز دەنووسی. بەگوێرەی زانیارییەکانی مالیک، کە هەمووی نووسیبوونەوە، هەرسێکمان پێکەوە بیست و حەوت جار سجن یان دەستبەسەر کرابووین، کە بە هەرسێکمان یازدە ساڵی دەکرد، پاشان قادری برام گوتی: 'کاکە غەفوورم ئەوەندە سجن کرا و خۆی شاردەوە، کاتێک دەهاتەوە ماڵەکەی خۆی، منداڵەکانی گومانیان لێ دەکرد و وایان دەزانی دایکیان پیاوی غەیرە دەهێنێتەوە ماڵەکەی.'
لە کۆتاییدا من پێم گوتن: 'بەردەوام لە خەونەکانمدا لە سجنم و گوللەم پێوە دەنێن و خوێنم لێ نایەت!'
هەردووکیان پێم پێکەنین، قادری برام پێی گوتم: 'دە برا گیان شاعیر نەبوویتایە.'
پاشان بۆ ڕازی کردنی دڵی مالیک پرسیاری ئەوەم لە قادری برام کرد: 'بۆچی بوویت بە پارتی؟'

قادر لە وەڵامدا گوتی: 'کاتێک من چاوەڕوانی ئەوەم دەکرد کە پێویست بوو شیوعییەکانی کوردستان، لە جوڵانەوەی ڕزگاریی کوردستاندا ڕۆڵی سەرەکی بگێڕن، بەڵام هەمیشە ڕۆڵی لاوەکییان گێڕاوە. لە هیچ کاتێکدا خانەخوێ نەبوون، من چاوەڕان بووم

شـيوعييەكان دەسـتپێشـخەریی بکەن، پێش سـەردەمەکەی خۆیان بکـەون، وەک چۆن لـە جیهـانـدا نموونـەکەی دەبینین، لـە پێش ڕووداوەکانەوە بن و زووتر گوێیان لە زەنگی مەترسـییەکان ببێت، هەمیشە پاشکۆی ڕووداوەکان بوون. سەرکردایەتیی حیزبی شیوعی سی ساڵە شـیوعییەکان لە تێکشـکانێکەوە بەرەو تێکشـکانێکی دیکە دەبەن، بەڵام قەت ئەوەندە لەخۆبووردە نەبوون، تەنیا جارێک ددان بە لێنەهاتوویی خۆیاندا بنێن و هەر هیچ نەبێت دەست لە کار بکێشنەوە. ئەگەرچی حیزبە شـیوعییەکان لە تەواوی جیهاندا بۆ شـەڕی پیرۆزی چینایەتی لەدایک دەبن، بەڵام حیزبی شیوعیی لای خۆمان هەمیشە بە دوای سـازشـدا گەڕاوە و خۆیی لە شـەڕ دزیوەتەوە، چونکە هەرگیز خۆی بۆ هیچ شـەڕێک ئامادە نەکردووە، هەر کە تووشـی شـەڕیش هـاتووە، گـەورەترین زەبری بـەر کـەوتووە. دەزانم هـەمیشـە لـە سـەنگەری داکۆکیکردندا بووە، هەرگیز هێرشـی نەبردووە. بەڵام هەمیشـە دەسـتی بە کڵاوی خۆیەوە گرتووە و تاوەکوو با نەیبات. ئەوەیە جەلال گیان کە من پێم ئەزم ناکرێت![1]

ئەو بەیانییە کاتێک لە ماڵ دەرچووم قادر و مالیک هەریەکەیان و لە سووچێکەوە لێی نووستبوون.

لە ئۆفیسـی ڕۆژنامەی هاوکاری لە وەزیرییە عەبدوڵڵا عەباس و نیهایەت جەلال گلەییی ئەوەیان لێ کردم، کە بۆ چەند مانگێک دەچێت من هیچ گرنگی بە کاروباری ڕادیۆکە نادەم، مەبەسـتیان لە دەنگی ڕادیۆی کوردی بەغدا بوو، کە ئەو کاتە هەرسـێکمان پێکەوە لەوێ

کارمەند بووین، لە وەڵامدا پێم گوتن: 'قسەکەتان ڕاستە و ئێوە لەسەر حەقن.'

دوو مانگ پێش ئەو ڕۆژە لەگەڵ سەعدوڵڵا پەرۆش لە هەولێر بووم، من میوانی جەمیل ڕەنجبەر بووم، پاشان پێکەوە بۆ کۆیە چووین. لەو سەفەرەمدا هەستم بەوە کردبوو، لێکچوونێک لە نێوان من و جەمیلدا هەبوو. کاتێک پێم گوت، ئەو گوتی: 'جەلال، باشتر کە هەردووکمان خەڵکی یەک شار نین، ئەگین ڕقمان لە یەک دەبوو!'

لە چایخانەکەی عوسمان دەرگەڵەیی لەگەڵ: عەبدوڵلا پەشێو و جەمیل ڕەنجبەر، جەوهەر کورمانج و هیوا سەرهەنگ، سامی شۆڕش و محەممەد مەنگوڕی دانیشتبووین. پێش ئەوەی بچین بۆ ئەو چایخانەیە لە چاپخانەی سۆلاف کتێبێکی شیعری سەعدوڵڵا پەرۆشمان بە ناونیشانی کۆشی ئارام وەرگرتەوە. لەو کاتەدا کتێبی کۆشکی ئارام لەسەر مێزەکەمان بوو، دوای ئەوەی یەکیەک بە دەستمانەوە گرت و لێمان ڕوانی، من پرسیاری خوێنەری شیعرم لێ کردن. لە کاتێکدا دەمزانی کۆشکی ئارام ئەو کتێبەی بەردەستمان، کە تەنیا دووسەد و پەنجا دانەی لێ چاپ کرابوو، نووسەرەکەی کە سەعدوڵڵا پەرۆش بوو، بە قەرز چاپی کردبوو. بەڵام کەسیان وەڵامیان بۆ ئەو پرسیارەی من پێ نەبوو، یان من ئەو ڕۆژە بە وەڵامەکانی ئەوان ڕازی نەبووم.

لەو سەفەرەمدا پرسیارم لە هەرچی کەسێک دەکرد، خوێندەوار و نەخوێندەوار، بێجگە لە خوێندنەوەی شیعر گوایە گوێ لە ڕادیۆی کوردی بەغدا دەگرن؟ هەندێک جار لەسەر شەقامەکانیش ئەو

پرســـیارەم لە خەڵکی ئەو شـــارە دەکرد، ڕێکەوتی کەسـێکم نەکرد، گوێی لەو ڕادیۆیە گرتبێت. وا بزانم لە کۆیەش بە هەمان شـــێوە ئەو پرسیارەم لە چەند کەسێک کرد، کە ئەوانیش هەمان وەڵامیان دامەوە، ئیتر لە دوای ئەو ڕۆژانەوە هەسـتێکی نەخوازراوم لا دروسـت بوو، کە بێهیوای کردم و توانای کارکردنم لە ڕادیۆی دەنگی کوردیی بەغدا نەما.

مەبەســـتی چوونم بۆ هەولێر، بێجگە لە میوانداری هاوڕێکانم، بە تایبەتی جەمیل ڕەنجبەر، گۆڕینەوەی بیر و ڕا بوو دەربارەی بیری ڕوانگە، کە تـاوەکوو ئەو ڕۆژانە تەنیـا خەیـاڵ بوو، هەروەهـا بۆ سۆراخی کتێبەکەی عەبدوڵڵا گۆران، سروشت و دەروون بوو، سێ ســـەد دانەمان بۆ کتێبخانەکانی هەولێر ناردبوو، لەگەڵ ئەژی گۆران بە دەسـتییەوە هیلاک بووین و لە سـلێمانی چاپ کرا، دواتر لە ئەژی گۆرانم بیستەوە، بە هەمووی بیست دانەی لێ فرۆشرابوو، ئەژی بە نیاز بوو، بە پارەی فرۆشـــی کتێبەکە تێچووی چاپخانەی کامەرانی بدات.

پێم وا بێت ئەوەش هۆکارێکی تری بێزاری و سـاردبوونەوەم بوو لە کارکردن و چاپکردنی ئەو دیوانە شـــیعرییەی چەند مانگێک بوو ڕەشنووسـەکەیم پێ بوو. کە دواتر لە چاپخانەیەک بەجێم هێشت و ناچار لە بەغدا هەڵهاتم.

ئەو ڕۆژە بیســـت خولەکێک لە ئۆفیســـی ڕادیۆ مامەوە، هیچم بە هاوڕێکانم نەگوت و دیسان کارەکانم بە سەریاندا بەجێ هێشت.

'دە وەرە کابرا تۆ مێژوونووس بیت و چوار ســـاڵ لە بەغدا و هەشت ساڵ لە مۆسکۆ خوێندبێتت و ئەوە عەقڵ و ئیدراکت بێت!'

ئەوەم لە خەیاڵدا بوو، بەڵام پێم نەگوت، ڕەشنووسی دوو کتێبی پێ بوو، لەسەر مێژووی دژایەتیکردنی بنەماڵەی عەلیی کوڕی ئەبووتالیب، وەک خۆی دەیگوت، کەس پێشتر ئەو مێژووەی نەبیستووە، هەردوو ڕەشنووسەکەی خستبووە بەر دەستم و منیش لە بەر خاتری دڵی ئەو چاوم بە لاپەڕەکانیدا دەخشاند، بێ ئەوەی بتوانم یەک وشە چییە لێی بخوێنمەوە، پاشان لەبەر خۆمەوە پێم گوت: 'مێژوونووس دەبێت، پێش هەمووشتێک مێژووی خۆی و نەتەوەکەی خۆی بنووسێتەوە!'

'ئەی ئەگەر نەتەوەکەی خۆت مێژوویەکی سەرنجڕاکێشی نەبوو؟!'

'جا توو ویژدانت ئەوە قسەیە، جا مێژوونووسێک یەک تۆز مەعریفەی هەبێت، دەربارەی خۆی ئەنووسێت، ئیتر خوای دەکرد خۆی سەر بە تیرەوتایەفەی حوشترەکانی بیابان ئەبوو!'

'من باس لە مێژوویەکی ڕاستەقینە و سەرنجڕاکێش دەکەم!'

'ئینجا تۆ کوردێکی فەیلیت، ئایا زانیاریت لەسەر ئەوە هەیە، کە لە ساڵی ١٩٤٨وە بە شێوەیەکی سیستەماتیک عەرەبی شۆڤێنیست خەریکی سڕینەوەی کوردانی فەیلی بوون، بزانە ڕژێمی پادشایەتی، ئەو سیاسەتەی پێڕەو کرد و تا ئەمڕۆش بەردەوامە، تەنانەت ئەو چەند ساڵەی عەبدولکەریم قاسمیش لەسەر حوکم بوو.'

'ئێ، کاکە جەلال، خۆ من ئەوە دەزانم، بەڵام کێ خۆی لە قەرەی ئەو دەردیسەرییە دەدات، خۆ من نایەم بە دەستی خۆم کفن بۆ خۆم بدرووم، ئەوە دەزانم، من کەسوکارم یان ڕایان کردووە یان بێسەروشوێنن.'

'ئێ ئیتر تۆ چیت داوە لە بەزمی شیوەنگێڕان بۆ عەلی؟!'

لەگەڵ دوکتۆر سەباح عەلی لە چایخانەی ئەربیل دانیشتبووین، لە کاتێکدا من ئەمەم پێ گوت، سەری لێ ڕاوەشاندم و وەڵامی نەدامەوە، منیش لەبەر ئەوەی دڵی ئەو لە خۆم ڕازی بکەم، بێ ئەوەی بیرم لێ کردبێتەوە: 'دوای عەلی ئەتوانیت مێژووی حیزبی بەعسیش بنووسیتەوە!'

دوای ئەوەی ئەمەم پێ گوت، بێ ئەوەی لێم بڕوانێت، تەنانەت ماڵئاواییشی لێ نەکردم، بێدەنگ لە چایخانەکە چووە دەرەوە.

لە ڕابردوودا زیاتر لە بیست جار ڕێکەوتیم کردبوو، هەندێک جار هەوڵم دەدا بتوانم دڵی ڕازی بکەم، بەڵام هەوڵەکانم بێسود بوون، کە هەموو جارێک بە ڕێکەوت تووشم دەبوو.

دوای نیوەڕۆی ئەو ڕۆژە و سەعات سێی ڕێک، لەو چایخانەیە لەگەڵ شاسوار جەلال و فازیلی مەلا مەحموود قەرار بوو یەک ببینین، کاتێک ئەوان هاتن من هەستابووم و بە نیاز بووم بڕۆم، چونکە سەعاتێک دواکەوتبوون.

هەردووکیان ئەوەندە ڕەقەڵە و بۆر هەڵگەڕابوون نەمناسینەوە، فازیل گوتی: 'ئەگەر پێمان نەڵێیت لە سیاسەت دوور کەوتوومەتەوە و تەنیا خۆمم بۆ ئەدەب تەرخان کردووە!'

'لە کوێ میللەتەکەم پێویستیان بە من بێت، بە مەرجێک...'

ئارام نەیهێشت قسەکەم تەواو بکەم: 'ئێ کەواتە کاتی دامەزراندنی پارتێکی چەپی کوردستانییە!

'ئارام، پارتێکی چەپی کوردیی عێراقی.'

'بۆ جارێکا ئێوە لەسەر کورد و کوردستان و عێراقچێتی خۆتان ساخ نەکردۆتەوە؟'

'کاک جەلال، تۆ ئەزموونت لە هەمووومان زیاترە، بۆ ئەوەی هیچ هەنگاوێکی کرداریمان نابێت، لە ڕێوە بۆ لای تۆ هاتووین.'

فازیل ئەمەی گوت و دەستێکی بەرەو ڕووی چایچییەکە هەڵبڕی، تاوەکوو چایچییەکە سێ پیاڵە چایی خستە بەردەممان بێدەنگ بووین، یان باشترە بڵێم، من بێدەنگ بووم و لە خەیاڵی خۆمدا لە وەڵام دەگەڕام، لەو ڕۆژانەدا و بگرە لە ساڵی ١٩٦٣وە بڕیاری کۆتاییم دابوو، کە خۆم بۆ نووسین و کاری میدیا تەرخان بکەم و بە کردار بەشداری لە هیچ کارێکی سیاسیدا نەکەم. بەڵام نازانم بۆچی پێم گوتن: 'هاوڕێیان، من وەک ڕاوێژ و ڕاگۆڕینەوە ئامادەم، بە مەرجێک من لە پشتی پەردەوە بم و بە هیچ جۆرێک دەرنەکەوم و ناوم نەهێنرێت.'

'ئێمەیش تەنیا ئەوەندەمان بەسە.' ئارام وای گوت.

'ئینجا ئەگەر تۆ لەو ڕێگەیەوە هاوکارمان بیت بەسە، ئەوە تەنیا بەینی خۆمان بێت.'

فازیل ئەمەی گوت و ئارام سەری بۆ لەقاند و لە ژێر لێوەوە گوتی: 'بە دڵنیاییەوە ناوت نابەین.'

'ئەگەر ئێوە خەیاڵتان لە لای شۆڕشێکی سیاسیی چینایەتییە، ئەوا من بۆ کۆمەڵگەی کوردی شۆڕشێکی کولتووری و فەرهەنگیی زیاتر بە پێویست ئەزانم. چونکە لەم دە ساڵەی دواییدا کۆمەڵگەی کوردی لە ژێر کاریگەریی سەرهەڵدانی چەکداری و پەتای نەتەوەییدا فەرهەنگ و زمانیان فەرامۆش کردووە. دەبێت ئێوە ئەوە باش بزانن؛ گەنجی کورد ئەمڕۆ وا هەست دەکات کە تفەنگێکی هەبێت بەسە، هەروەها ئێستا هەموو ماڵێکی کورد پێی دەچێت تفەنگێکی هەبێت، بەڵام بە ناوازە و تاکە تاکە ماڵێک کتێبی تێدا بێت، هاوڕێیان ئەزانن

سـاڵی پەنجاکان بە پێچەوانەوە بوو! بە تایبەتی شـارەکان، کە ئەوەش کۆسپە لە بەردەم سەرهەڵدانی ڕەوتێکی نوێی چەپدا. نەک تەنیا بیری چەپ، نەخوێندەواری کۆسـپە لە ڕێگەی هەموو شـۆڕشـێکی بیری نوێدا. نازانم، ئایا ئێوە خوێندنەوەتان بۆ میللەتەکەی خۆتان کردووە؟'

## ١٧

'کاکە عەزیز نەخۆشە و ئەبێت بۆ ڕۆژێکیش بووە، خۆت بگەیەنیتەوە سلێمانی.'

کاتێک ئازادی مام مستەفام ئەمەی بە تەلەفۆن پێ گوتم، ئارەقێکی ساردم کرد و بێزاری دایگرتم، نەک تەنیا لەبەر ئەوەی عەزیزی برام نەخۆش بوو، بەڵکوو زیاتر لە ترسی گەڕانەوەم بوو بۆ سلێمانی، کە زۆر بە لامەوە گران بوو.

ئەو شەوە من و شوکر مستەفا عەبدوڵڵا و جەمیل ڕۆژبەیانی میوانی عەلائەدین سەجادی بووین، باسی دامەزراندنی کۆڕی زانیاریی کوردیان بۆ کردم، داوایان لێ کردم، کە لەگەڵیاندا بەشدار بم و تەنانەت ببمە ئەندامیش، منیش باسی بزووتنەوەی ڕوانگەم بۆ کردن، عەلائەدین سەجادی گوتی: 'ئەگەر ئەوە سەر بگرێت خەونی هەمووومان دێتە دی، دەی کەواتە پێکەوە ئیشمان زۆرن.'

پرسیاری دەفتەرە شیعرییەکەی باوکمم لێ کرد، عەلائەدین سەجادی گوتی: 'ئەوە زۆر ئستیفادەم لێ کردووە، ڕەحمەت لە باوک و باپیرت، بۆ کارێک کردوویانە، ئێستا لە لای جەمیلە.'

'بەڵێ، لای منە و هەر ئەوەندەی دەستم بپەرژێت، جارێکی تر لێی دەڕوانم و لە داهاتوودا کەی ڕێگەت کەوتە ماڵمان، ئەوە ئەمانەتە و پارێزراوە.'

ڕۆژی دواتر چووم بۆ لای کاکە غەفوورم و باســـی حاڵی خۆم و نەخۆشـــییەکەی عەزیزی برامانم بۆ کرد، ئەویش وەکوو بڵێی شـتێک هەبێت لە منی بشـــارێتەوە، بێدەنگ خۆی کۆ کِردەوە و وەک منداڵ پێش خۆی دام و پێکەوە دوای سـاڵانێک بۆ سـلێمانی گەڕاینەوە، بە بیرم دێت لە ڕێگە نەمتوانی وەکوو هـاوەڵێکی کاکە غەفوورم ببم و دوو قســـەی لەگەڵدا بکەم، تەنیا ئەوەندە نەبێت، لێم پرســـی: 'کاکە تۆ کاتی خۆی لە نێوان نووسین و خەباتدا، چۆن خۆتت یەکلایی کردەوە و بۆچی ڕێگەی خەباتت هەڵبژارد؟'

لە وەڵامدا گوتی: 'ئەوەی میللەتی کورد ئەوســـا و ئێســـتاش پێش هەموو شـــتێک پێویســـتی پێیەتی، ئازادییە، ڕزگاربوونییەتی لە ژێردەستەیی و زوڵم و زۆر!'

دوای تاوێک بێدەنگی لێی پرســـیم: 'ئەرێ جەلال پێم ناڵێیت تۆ بۆ دڵت لەو شارە ڕەنجاوە؟'

وا بزانم هەر ئەوەندەم وەڵام دایەوە، کە خۆشـــم هۆکارەکەی پێ نازانم.

ئەوســـا ماڵمان لە گەڕەکی قەزازەکان بوو، میرزا کەریمی باوکم دوو ســـاڵ دوای مردنی دایکم بەرگەی تەنیایی و هەژاری نەگرت و زۆر خێرا بەجێی هێشـــتین، قادری برام گوتی؛ کە دواســـاڵی تەمەنی هەموو ڕۆژێک بۆ گەڕەکی سـەرشـەقام و ماڵە کۆنەکەمان دەچوو، بە جۆرێک بووبوو بە هاوڕێ و دۆســتی پۆلیســـەکان. زۆر بە داخەوەم، کە من دوای هەفتەیەک بە مردنەکەیم زانی. ئەو خانووەی لە کۆڵانی قەزازەکان تێیدا بووین، لە عوسمان فایەقی هاوڕێی بە کرێی گرتبوو، کە عوسـمان خۆی لە بەغدا دادەنیشـت. مانگانە من و کاکە غەفوورم

کرێکەمان بۆ دەبرد. ئەو ساڵانە باوکم هەژار کەوتبوو، بە هەمووومان و هەندێک جاریش بە یارمەتیی مامەکانم کرێی خانووەکەمان دەدا.

لە گەڕانەوەمدا، کە کاکە عەزیزم بینی، دەستی کرد بە پێکەنین و پێی گوتم: 'ئاوا، مەگەر فێڵت لێ بکەین ئەگینا تۆ ڕێگەت ناکەوێتەوە سەر ماڵەکەی خۆت!'

کاتێک دەستی لە ملم کرد، ئەوسا زانیم ئەو چەند ساڵە چیم لەدەست چووە، ئەگەر تاوەکوو ئەو ڕۆژە خۆمم بە دڵشکاو دەزانی و ڕێگەی گەڕانەوەم بۆ سلێمانی پێ دوور بوو، کاکە عەزیزم و خوشکەکانم... ڕووناک، پەروین و ژیان، لەگەڵ منداڵەکانیان لە یەک ساتدا بۆیان کورت کردمەوە و قەرزداریشیان کردم، هەر وەکوو چۆن پێشتر و دواتریش ئەوان چۆڵەوانی ناو ڕۆحمیان ئاوەدان دەکردەوە. ئەو ڕۆژانە و بە تایبەتی دوای مردنی حەلاوەخانی دایکم هەستم کرد بەدیعەی ژنی کاکە غەفوورم، کە کچی مامە مستەفام بوو، لەگەڵ فائیزەی ژنی قادری برام و براژنە شیرینم بۆنی دایکمیان لێ دەهات و وەک ئەو نازیان هەڵدەگرتم.

بە نیازی نووسین بووم، پێویستیم بەوە بوو لە جێگەیەکی بێدەنگ دانیشم، کاتێک ناوی چەند جێگەیەکم هێنا، کاکە غەفوورم پێی گوتم: 'نەکەیت، شتی وا نەکەیت، وەزعەکە باش نییە و شار نائارامە، با تووشی سەرئێشە نەبیت.'

ماڵی قادری برام و کاکە غەفوورم و منداڵەکانیان، هەرچەندە لەو ڕۆژانەدا کاکە عەزیزم بۆ ماڵی مامە عەبدوڵلای مێردی پوورە ئافتاوی خوشکی دایکم گواستبوویەوە، بەڵام ئەو ئێوارەیە بۆ

پێشـــوازیی من هەموو لەوێ بوون، غەفووری برام پێی گوتم، منیش بۆماڵی مامە عەبدوڵلام بچم چونکە ئەوان جێگەیان زۆرە.

دوای نـانخواردن لە کۆلانی قەزازەکـانەوە بە تەنیـا بۆ گەڕەکی سـەرشـەقام چووم، لە نێوان ئەو دوو گەڕەکەدا بە خەیـاڵیش نەچوومەوە سـەر هیچ جێپێیەکی خۆم و هاوڕێ کۆنەکانم، هەروەها لە ڕێگەیەش کەسـی ناسـراوم نەبینی. بێجگە لەوەی مالیکی مام مستەفام دووراودوور بە دوامەوە بوو، ئەوەی ڕاستی بێت بە خەیاڵی جارانەوە بۆ بەردەم ماڵی بەهاری غالب عەربەتی چووم، ماڵەکەیان لە پێش چاومدا وەک جاران بوو، دەرگەکەیان لەسـەر پشـت بوو، لە دەرگەی حەوشەکەوە سەرم بردە ژوورەوە، بینیم ژنێک و دوو منداڵ لە بەر هەیوانەکەدا دانیشتبوون.

باوەشـێک گۆڤار و ڕۆژنامەم بە دەسـتەوە بوو، کە لە هەموویاندا شـیعرم بڵاو کردبووەوە، دەمویسـت ئەوە بە بەهار بڵێم: 'فەرموو خانم ئەوە ئێسـتا تۆ بە بارتەقای باڵای خۆت ماچی من قەرزداریت. ئەوەتانێ، بیانبینە، ڕۆژنامە و گۆڤار نەماوە لە وڵاتدا من شیعری تێدا بڵاو نەکەمەوە.'

بەردەوام ئەو پرسـیارەیشـم لە خۆم کردووە، ئایا هەڵپەی من بۆ زووزوو بڵاو کردنەوەی شـیعرەکانم تەنیا لەبەر خاتری ئەو گفتە بوو، کە کاتی خۆی بەهار پێی دام و گوتی: 'هەر کات شـیعرت بڵاو بووەوە، من ماچێکی تۆ قەرزدارم.'

پـاشـان چووم بۆ مەڵکەنـدی و بە خەیـاڵی خۆم بۆ بەردەم دووکانەکەی مام زامن، بووبوو بە کەلاوە و خەڵکی ئەو گەڕەکە خۆڵ و خاشـاکیان تێدا فڕێ دابوو. پاشـان بۆ ڕازیکردنی دڵی خۆم،

دەمگوت، پێ دەچێت زۆر ماندوو بم و ڕێگەم نەکەوێتەوە سەر ماڵەکانیان.

ئەو شەوە تاوەکوو بەیانی نەنووستم. لە قاتی سەرەوەی ماڵی مامم، حاجی عەبدوڵڵای جگەرەچی، لە یەکێک لەو سێ ژوورەی قاتی سەرەوە، کە ژووری عرووسییان پێ دەگوت، دوو ژوورەکەی تر ماڵی خاڵە تۆفیقم بوو، یان باشترە بڵێم؛ ماڵی مەلا تۆفیقە بێچاوی شاعیر، وەک چۆن خۆی شانازیی پێوە دەکرد و ئاوای پێ بڵێن؛ مەلا تۆفیقی شاعیر.

مالیک دوو جار هات، بێ ئەوەی لێم بڕوانێت، چاوی بە کاغەزەکانی بەردەممدا گێڕا، وەک ڕای کردبێت، بەردەوام هەناسەبڕکێی بوو، دەمزانی لێم تووڕەیە، بە تایبەتی لەو ڕۆژەوەی زانیبووی، وازم لە هەموو کارێکی سیاسی هێنابوو، دواجار کاتێک بەجێی هێشتم، یەخەی گرتم و ئاماژەی بەوە کرد: 'تۆ خەریکی چییت؟ ئەو میللەتە لێقەوماوە، پێویستیان بە کەسانی شۆڕشگێڕی وەکوو من و تۆیە، چیی لە شیعری حیز بکەن، خەڵکی نەخوێندەوارە و نانی نییە بیخوات.'

مالیک چاوی پڕ بووبوو لە فرمێسک، نەمزانی چی وەڵام بدەمەوە، کاتێک ئەو بەجێی هێشتم، ئاکۆی کوڕی عەزیزی برام بە درێژاییی ئەو شەوە سەرەتاتکێی لەگەڵدا دەکردم، هەرچەندە دەرمدەکرد کۆڵی نەدەدا و زووزوو لە بەردەممدا قووت دەبووەوە و دەیپرسی: 'مامە جەلال، ئەوە چی ئەنووسیت؟'

کاتێک دەمبینی، منداڵیی خۆمم بیر دەکەوتەوە، ئەوسا منیش وەک ئاکۆ لووتژەن بووم و حەزم دەکرد هەموو شتێک بزانم.

ڕۆژ بووەوە، مونیرە خـانی ژنی خـاڵە تۆفیقم تـازە چـایەکی بۆ هێنابووم، بە سـەر پێوە لێی پرسـیم: 'جەلال گیان نانی بەیانیت خواردووە؟'

وا بزانم لە وەلامدا پێم گوت: بەڵێ، بەڵێ، سـوپاسـت دەکەم خاڵۆژن.' تەنیا بۆ ئەوەی بەڕێی بکەم.

کاتێک مونیرە خان ڕۆیشـت، ڕەحیم موکریانیم لە حەوشـەکەدا بینی. پەنجەرەکەم لە گەرماندا خستبووە سەرپشت و گوێم لە دەنگی هەناسەبڕکێی ڕەحیم بوو، قاتێک ڕانکوچۆخەی ڕەشی لە بەردا بوو، مشکییەکی ڕەشی لە ملی پێچابوو، توێشەبەرەیەکی ڕاست و چەپ لە شـاندا بوو، بوخچەیەکی لە کۆڵ بەسـتبوو، قۆرییەکی ڕەش و دۆلکەیەکی فافۆنی بە بەر پشـتێنەکەیدا بەر دابووەوە. گوێم لێی بوو: 'خاوەنماڵ.'

دوای ئەوە کاکە عەزیز و شـیرینی خێزانی بەرەو پیریی ڕەحیم چوون، دیـاربوو هەموو گوێیـان لە دەنگی ڕەحیم بووبوو. کوڕانی حاجی عەبدوڵلا جگەرەچی و تەواوی ئەو سێ ماڵەی لەو ماڵەدا بوون دەوریان لە ڕەحیم دابوو، گوێم لێ بوو کاکە عەزیز پرسـیی: 'ئەوە چییە ڕەحیم، ئەڵێیت بۆ تڕ خۆت بەستووە؟!'

'بە نیـازم بڕۆم، لە جەلال گەڕام، کوتیـان لە مـاڵە مەلا تۆفیقـە، هاتووم ماڵاواییتان لێ بکەم و بگەڕێمەوە موکریان!'

براژنە شیرینم لێی پرسیی: 'موکریان؟'

'ئادێ.'

'کارێ باش ئەکەیت ڕەحیم گیان.'

'دەچمـەوە بۆ وڵات، بۆ کن خزمـان و کەسـوکـاران، چیی دی حەوسەڵەی غەریبیم نەماوە!'

کاکە عەزیزم دەستی خستە سەرشانی: 'پێویستیی ڕێگەت پێیە؟'

'بەڵێ، ماڵتان ئاوەدان بێ، ئەو بوخچەیەیان بۆ پڕ کردووم لە نان و کەرە و چایی و کەلوپەل، چم ئیحتیاج نابێ.'

پوورە ئافتاوم گوتی: 'دەستیان خۆش بێت.'

'گەر تەمەن باقی بێ، سەرد لێ دەدەمەوە.'

دوای ئەوەی ڕەحیم دانەوییەوە و دەستی پوورە ئافتاوی ماچ کرد، وەک بڵێیت لە پەنجەرەکەوە منی بینیبێت، دەســـتێکی بۆ هەڵبڕیم و بانگی کردم: 'جەلال گیان، بە دووعا، دەچم.'

لەو کاتەدا فازیلی پوورە ئافتاوم پێی گوت: 'ئەی کێ لەگەڵم بێت بۆ مەلعەبەکە و جانتا و جلی یارییەکانم بۆ هەڵبگرێت، ئەوە سبەینێش یاریمان هەیە و بە داخەوەم... کە ئەڕۆیت.'

'دەنا چ بکەم خاڵە فازیل، مەجبوورم ئەتۆ و حەموو هاوڕێکانم جێ بێڵم، هەرچەند دەزانم زۆرتان بیر دەکەم.'

'ئێمەش ڕەحیم گیان.' فازیل ئاوای بە ڕەحیم گوت.

لەسـەر کورسـییەک دانیشـتبووم و تەپڵەکێکم لە بەردەمدا بوو، لێم دەڕوانین، بە سکی ناشتا و برسـێتی جگەرەم دەکێشـا و هێشـتا قومم لە چاییەکەم نەدابوو، کۆمەڵێک کاغەز لەســـەر ڕانم بوون، چەند ڕۆژێک بوو خەریکی نووســـینی بەیاننامەی ڕوانگە بووم، کە هەمان ڕۆژ لەگەڵ حوسێن عارف و کاکە مەم بۆتانی بۆ ئەو مەبەستە بڕیار بوو یەک ببینین. بێجگـە لـەوان لـە بـەغـدا چـاوم بـە زۆربـەی هونەرمەندانی شـــێوەکار، شـــانۆکار و موزیکژەنەکان کەوت، بەو مەبەســـتەی ئەوانیش لەگەڵماندا بەشـــدار بن. دوای ئەوەی ڕەحیم یەکیەک تەوقەی لەگەڵ کردن و ئەملاولای هەنـدێکیـانی مـاچ کرد.

گوێم لێی بوو به قادرمەکاندا بۆ لای من ســـەر کەوت، بێ ئەوەی سڵاوم لێ بکات گوتی: 'جەلال دەچم.'

لێم نەڕوانی: 'گوێم لێت بوو، ناچیت ڕەحیم گیان، تۆ ناچیت.'

'ئەو عەرز و ئاسمانیش وێک بکەون، هەر دەچم!'

'من ئەڵێم وا باشە نەچیت!'

'جەلال، ئەمنیش دەڵێم بۆکان شـاری دڵ و باغ و گوڵسـتانمە، چیی دی لەم غەریبستانە هەڵ ناکەم و لازمە بچم.'

'ئێ ڕەحیم گیان، کەچی... عەقڵ ئەڵێ نا، قەســـەبەی شـــۆڕشـــی مەستانە، نەچی.'

'ئەتۆ چ دەڵێی جەلال؟ دەسـا ئەو شـیعرەی سـەید کامیلی ئیمامییت لە بەرە؟'

'کام شـــیعر، ســـەید کامیل کێیە؟ کوڕە ڕەحیم من تەنیا وەڵامی قسەکانی تۆ ئەیەمەوە!'

'دە باشە، من دەڵێم نوختەیی ئەو ڕەوزەیی ڕیزوانە، دەچم.'

'من ئەڵێم نا، ڕەشە، جێڕاوگەیی شەیتانە، نەچی.'

'ئەرێ جەلال برا بۆ شـێتم دەکەی، دەی، دەی، من دەڵێم مەسـکەن و ئارامگەیی جانانە، دەچم.'

'بۆ کوێ... بۆکان؟ من دەڵێم ســـەربەســـەری تێک چووە، وێرانە، نەچی.'

'جەلال، کەسـێک لەم شـارەدا نەبوو، دێڕێک شـیعری سـەید کامیل بەڵەد بێ، بگرە هەر ناشیناسن!'

'لە تۆوە ڕەحیم، لە تۆوە فێربووین.'

'چۆناوچۆن؟ باوەڕ ناکەم، چونکێ، ئاخر ئەمن قەت دێڕێکیشـــم بۆ نەکوتووی!'

'ئەی مەگەر تۆ ئەو شیعرەی سەید کامیلت لە بەر نەبێت؟!'

'ئەدی چۆن جەلال گیان، ئەو شـــیعرەی شـــاری دڵ و چەندان شیعری دیکەیشم لە بەرن.'

'شیعرەکەی شاری دڵ لە خەیاڵی تۆدایە و هەستی پێ ئەکەم، ئەی بۆیە منیش، بە قەولی خۆت ئەو شـــیعرەی ســـەید کامیلی ئیمامی بەڵەدم.'

'ئەتۆ شـــۆخیم لەگەڵ دەکەی، چ بکەم ناچارم باوەڕت بێ بکەم، ئەوە هـاتووم پێـت بڵێم دەچم: من دەڵێم جێگەیی هەر شـــێت و جنوونانە، دەچم.'

'نا ڕەحیم گیان، من دەڵێم نا، زەدەیی پەنجەیی پەرییانە، نەچی.'

'جەلال، ئەو شیعرەت لە کوێ بیستووە؟ هێندەی ئەمن بزانم سەید کامیل تازەی نووسیوە!'

'کام شیعر، سەید کامیل کێیە؟!'

'دەســـا ئەمن لە بەر ئەو ئەتوارەی خەڵکی ئەو شـــارەی دەچم، بە خودای جەلال، بەرد لە جێی خۆی ســـەنگینە و موکریـان بۆ ئـەمن وەکی ســـلێمانییە بۆ ئەتۆ، من دەڵێم مەرکەزی ئەســـراری حەریفانە، دەچم.'

'بە داخەوەم، کە ئێرە و ئەوێش، جێ تەمەعی چاوی حەســـوودانە، نەچی.'

'پیر بووم و نۆبەی مردنمە، لـە بـەر ئەوەی؛ من دەڵێم وەختی خەتەر مەئمەن و قەڵغانە، دەچم.'

'ئەوە بۆ بیست و پێنج ساڵە لەم شارەیت و ئەوەندەی من بتناسم، ناتوانیت ڕۆژێک لەم شـارە بڕۆیت، بێجگە لەوەی کە تازە ئەم شـارە

جادووی لێ کردوویت، دەی مەگەر تۆش تامی نوقڵەکانی مام زامنت نەکردبێت. من دەڵێم کونکونە، جێگەی سەرەپەیکانە، نەچی.'

'دەک گەردنی ئەو مام زامنەی ئازاد نەبێ، ئەو سەبەب بوو، ئەو جادووی لێ کردم، ئیدی نازانم جەلال گیان، لەو هەموو چوون و نەچوونەی سەرم سوور ماوە. من دەڵێم پێویستە بچم، تۆ دەڵێیت وا باشە، نەچی!'

دوای ئەمە ڕەحیم بە دەنگی بەرز دەستی کرد بە گریان، ئەوەندە دەنگی لێ هەڵبڕی، پوورە ئافتاو یەکەم کەس بوو گەیشتە لامان، پاشان مام مستەفام و ئەوانی تر، کە لەو کاتەدا لەوێ بوون، نازانم مام مستەفام لە کوێوە پەیدا بوو، چونکە ئاگام لە هاتنی نەبوو. هەرچەندە ماڵی پوورە ئافتاو و حاجی عەبدوڵڵای جگەرەچیی مێردی، بێجگە لە خۆیان کە خاوەنی حەوت کوڕی جاحێڵ و دوو کچ بوون، جێگەی ماڵی خاڵە تۆفیق و مونیرە خانی ژنیشی بە سێ منداڵەوە کردبووەوە، هەروەها کاتێک کاکە عەزیزم لە بەندیخانە بوو، براژنە شیرین و منداڵەکانیان هێنانە لای خۆیان. هەموو وایان زانی من دڵیم شکاندووە، بە تایبەتی کاکە عەزیزی برام و مام مستەفام، کە ڕەحیمیان زۆر خۆش دەویست.

تاوەکوو ئەو کاتەی ڕەحیم پێی گوتن: 'جەلال لە گەڕانەوەم بۆ موکریان پەشیمانی کردمەوە!'

دیار بوو کەسیان لەو قسەیەی ڕەحیم حاڵی نەبووبوون، بەڵکوو پێی پێکەنین. کاتێک ئەوان لە قاقای پێکەنیندا بوون، من و ڕەحیم بێدەنگ لە یەکتریمان دەڕوانی، کاکە عەزیزم پێی گوت: 'ئەی ڕەحیم گیان، ئەگەر بە نیازی چوونیت، خۆم هەتا شاری بانە یان مەریوانت ئەبەم.'

ڕەحیم بێ ئەوەی لێی بڕوانێت، گوتی: 'کاکە عەزیز، بە خودای جەلال ڕاست دەکا، ئەم شارە ئیدی بۆتە وەتەن و مەنزڵگەم، ناتوانم چی دی بەجێی بێڵم.'

'ئەی کە واتە ناچیت؟'

عەزیز و مام مستەفا دەوریان لە ڕەحیم دابوو، کاتێک کاکە عەزیزم دەستی کردبووە ملی، ڕەحیم قوڕگی پڕ بووبوو لە گریان، هەناسەی لە بەر بڕابوو، لە ژێر لێوەوە گوتی: 'خۆیشم نازانم، لە مابەینی چوون و نەچووندا سەرم لێ شێواوە.'

# ١٨

چوارشـــەممەی ڕۆژێکی هاوین بوو، جەمال بەختیار تەلەفۆنی بۆ کردم و پێی گوتم؛ شـــێرکۆ بێکەس دێت بۆ ئەمریکا، پێیان خۆش دەبێت، ئەگەر تۆش لێرە بیت. دوای ئەوەی ئامادەیی خۆمم دەبڕی و پێم گوت: 'بەڵێ، ئامادە دەبم.' پاشان لێدوانی نێوانمان زۆر لە کورتی بڕییەوە.

ئەوە بەڕێکەوت نەبوو، هۆکارەکەی بۆ ئەوە دەگەڕایەوە، کە من ساڵانێک پێش ئەو ڕۆژە بە نیاز بووم بچمە داخوازیی ڕووناکی کچی جەمال بەختیار، بەڵام لەبەر هۆکارێک بێدەنگیم هەڵبژارد.

ڕووناکم لە ئاهەنگێکی کوردانی دانیشـــتووی ئەمریکا بینی. کاتێک من هۆڵی ئاهەنگ و کۆبوونەوەکەم بەجێ هێشـــت و بۆ ماوەی ســـەعاتێک بە تەنیا لە دەرەوەی هۆڵەکە لە پەنایەکدا دانیشـــتم و جگەرەم کێشـــا. بێزار بووم، چونکە بەهۆی ڕووداوی ئۆتۆمبێلەکەوە تۆنی دەنگم تێک چووبوو، دوای دوو دێڕ هەناســـەم لە بەر دەبڕا و نەمدەتوانی لە کۆڕ و کۆبوونەکاندا شـــیعرەکانم بخوێنمەوە. کە گەڕامەوە، لە ڕاڕەوەکەدا دووبارە بینیمەوە، بە ڕوویەکی خۆشـــەوە بەرەو ڕووم هات و پێی گوتم: 'کاک جەلال ئەوە چیت لێ هات؟ هەموو چاوەڕوانی تۆ بووین، کە ئەرک بکێشـــیت و شـــیعرمان بۆ بخوێنیتەوە.'

پاشـــان دەســـتی تەوقەی بەرەو ڕووم درێژ کرد و پێی گوتم: 'من ڕووناکم.'

زۆر لە بەهاری غالب عەربەتی دەچوو، گوتم: 'ڕووناک خان، ئەی ئەبێت من ئیشـــم چی بێت و بە کەڵکی چی بێم لە خوێندنەوەی شیعرەکانم زیاترا'

'دەی مەگەر تۆ شـــاعیر نەبیت؟!' تەنیا ئەوەندەمان پێکەوە قســـە کرد.

لەدەست تەنیاییم و بە قسەی هاوڕێیەکم بڕیاری ئەوەم دا، داخوازی ڕووناک بکەم، نازانم چۆن و لە کێوە جەمال بەختیار ئەو هەواڵەی دەماودەم بیستبوو، ڕاستەوخۆ پەیوەندیی پێوە کردم و خۆشحاڵیی خۆیی دەربڕی. منیش خۆمم حازر کردبوو بۆ ژیانی هاوســـەری، هەرچەندە لە نێوان یادەوەریی بەهاری غالب عەربەتی و ڕووناکی جەمال بەختیاردا لە شەڕێکی دەروونیدا بووم، بەڵام بڕیاری کۆتاییم دابوو. بۆ ئەو مەبەستە پەیوەندیم بە غەفوور و قادری برامەوە کرد، کاتێک تەلەفۆنم بۆ کردن بە ڕێکەوت لە بەغدا پێکەوە بوون، پێکەوە خۆشحاڵیی خۆیان دەربڕی و کردیانە گۆرانی و چەپڵەلێدان.

ئەو ڕۆژانە هێشـــتا لە ژێر چاودێری دکتۆردا بووم، بەتایبەتی ئەو دکتۆرەی نەشتەرگەریی بۆ کردبووم، مانگی جارێک دەیبینیم، ئەوەی پێ گوتم؛ کە شـــادەماری نێو بڕبڕەی پشـــت لە چەند جێگەیەکەوە لە کاتی تێکشـــکانی ئێســـقانەکانتدا، کەوتوونەتە ژێر فشـــار و هەندێک ئەندامی لەشت، بە تایبەتی خوار حەوزت وەک پێویست کار ناکەن.

ئەوەم دەزانی، وەک هەســـت و خەیاڵ بۆ جنســـی بەرامبەر هیچم لەچاو گەنجێتیدا نەگۆڕابوو، بەڵام بە کردار لە دوای ڕووداوەکەوە، هیچ پەیوەندییەکم لەگەڵ ئافرەتدا نەبووبوو، بگرە لە خۆیشـــمم

ڕانەدەبینی. دکتۆرەکە کاتێک ئەو پرسیارەی لێ کردم، لە وەڵامدا پێم گوت: 'هیچ هەست بە خۆم ناکەم.'

دکتۆرەکە گوتی: 'بۆ چاسەری ئەوە دەبێت چاوەڕێی کات بکەیت و سروشتی جەستەی خۆت چارەسەری بکات و ئەو هەستەت بۆ بگەڕێتەوە، لە جگەرە و مەشروووبخواردنەوە دوور بکەوەرەوە، هاوکاریت ناکەن!'

دوای ئەو ڕۆژە، لە داواکردنی ڕووناکی جەمال بەختیار پەشیمان بوومەوە، بەڵام نەمدەزانی چۆن و لەگەڵ کێ بە ڕاشکاوی ئەو باسە بکەمەوە، بەڵکوو کەمتەرخەمیم نواند و بێدەنگیم هەڵبژارد. تاوەکوو ساڵی بە سەردا تێپەڕی و ڕووناک شووی بە کەسێکی تر کرد.

لەو ڕۆژانەدا لە خەون و خەیاڵەکانمدا، بەردەوام بەهاری غالب عەربەتیم دەهاتەوە پێش چاو. پەستانێکی قورسی لەسەر ڕۆحم دروست کردبوو. دیمەنی ئەو... لە دوا ساتەکانی ژیانیدا، پەشیمان بووم چووم بۆ لای و بەو شێوەیە بینیم. بە جۆرێک شێوازی شێوێنرابوو، کە نەمناسییەوە.

ئەو ڕۆژەی جەمال بەختیار تەلەفۆنی بۆ کردم، وەک منداڵێک هەناسەبڕکێم پێ کەوتبوو، نەمدەزانی چۆن وەڵامی بدەمەوە، زۆر لە کورتی بڕیمەوە و خێرا پێم گوت: 'بەڵێ، بەڵێ قوربان، دێم بۆ پێشوازیی کاک شێرکۆ بێکەس.'

کاتی هاتنەکەی پێ گوتم، کە ڕۆژی هەینی دوازدەی شەو لە فڕۆکەخانەی واشنتن دی سی باڵتی مۆر دائەبەزێت. لە کۆتاییدا گوتم: 'من سەعاتێک پێش ئەو کاتە لە فڕۆکەخانە ئەبم.'

کاتێک بیتاقەم بۆ واشنتن و فڕۆکەخانەی باڵتی مۆر بڕی، دەمزانی بە فڕۆکە پێنج سەعات ڕێگەیە، سەعات یەکی دوای نیوەڕۆ بوو، لە نێو فڕۆکەخانەکە، لە کتێبفرۆشییەک و لە ڕەفەی بەشی شیعردا دیوانی ئینگرێت یۆنکەرم کڕی، ژنەشاعیرێکی ئەفریقای باشوور، کە لە بەغدا تەنیا ناوبانگیم بیستبوو، کاتێک لە تەمەنەکەیم ڕوانی، ئەوە بە خەیاڵمدا هات: 'من و ئەو هاوزەمەنی یەکین، منیش ئەبووایە وەک ئەو هەر ٣٢ ساڵ بژیامایە، ئەگەر ساڵانی ١٩٦٢ بۆ ١٩٦٣ بەخت یاوەرم بووایە.'

کتێبەکەمم خستبووە بن باڵم، جانتایەکی ئەوەندە بچووکم لە شاندا بوو، کە تەنیا تاقمی ڕیشتاشین و کراس و پانتۆڵێکی تێدا بوو، چونکە بێ گۆچانەکەم، نەمدەتوانی ڕێ بکەم و هەندێک جار لە سەرکەوتن و دابەزیندا پێویستم بە هەردوو دەستم بوو تاوەکوو بە گۆچانەکەمەوە بیانگرم، دەمزانی ناتوانم هیچ شتێک، بە تایبەتی جانتا لە خۆم بکەم بە بار.

ئەو سەعاتەی لە هۆڵی چاوەڕوانی بووم، تەنیا توانیم ژیاننامەی ئینگرێت یۆنکەر بخوێنمەوە، دوای خوێندنەوەی، کتێبەکەم بە سینگمەوە نابوو، هەناسەیەکی قووڵم هەڵکێشا و لە بەر خۆمەوە گوتم: 'لەو میللەتە نەگبەتتر نییە، کە شاعیرەکانی وەک کەسانی سیاسی و بازرگان بیر ئەکەنەوە.'

بە دەم بیرکردنەوە لە ژیانی ئینگرێت یۆنکەرەوە، بەشەلە شەل گەیشتمە بەردەم هێڵی پشکنین، دیار بوو دوایین کەس بووم، کەسێک پێشم کەوت و ڕێگەی پێ نیشان دام و سواری فڕۆکەکە بووم.

ویستم بە دوای جێگەکەمدا بگەڕێم، بینیم تەنیا یەک کورسی چۆڵە، کە ئەویش جێگەکەی من بوو، هەموو لێیان دەڕوانیم، ژمارەی سەر

کورسـییەکەم لەگەڵ کارتەکەم بەراورد کرد و لە پەرەوە دانیشـتم، لەگەڵ دانیشـتندا دەسـتم کرد بە خوێندنەوە، سـەرەتای کتێبەکە بە شیعرێک دەستی پێ کرد؛ 'ئەو منداڵەی سەربازێک لە نیانگا کوشتی.'

دوای خوێندنەوەی شـیعرەکە کتێبەکەمم داخسـت و لە بەردەممدا دامنا و خێرا لە جێگەی خۆم هەڵسـامە سـەر پێ، هەناسـەم توند بووبوو، چەند هەنگاوێک دەستم کرد بە گەڕان، وەک ورچێکی شەل... لەگەڵ هەموو هەنگاوێک بە ڕاسـت و چەپدا دەسـتم بە لێواری کورسـییەکانەوە دەگرت. گەڕابوومەوە نزیک جێگەکەی خۆم، سـەرم بە سـەر سـینگمدا داهێشـتبوو، ئاگام لێیان بوو لە ڕاسـت و چەپەوە دوو کچی سـەرپەرشـتیار ڕاوەسـتابوون. چەند جارێک بانگیان لێ کردم، یەکێکیان دەسـتی خسـتە سـەر شـانم و پێی گوتم: 'بەڕێز، تۆ باشیت؟'

سـەرم هەڵبڕی و لێم ڕوانین و خێرا لە جێگەی خۆم دانیشـتمەوە، بێ ئەوەی وەڵامی بدەمەوە. کاتێک دووبارە هەمان پرسـیاری لێ کردمەوە، لەتاو ئازاری سـینگم و تەنگەنەفەسـیم نەمتوانی وەڵامی بدەمەوە و تەنیا سـەرم بۆ ڕاوەشـاند، لە بەر خۆمەوە گوتم: 'من بەخت ئەوەی پێ ڕەوا نەبینیم، وەکوو ئینگرێت یۆنکەر شـاعیری میللەتەکەی خۆم بم!'

دیسان کتێبەکەم کردەوە و چوومەوە سەر هەمان شیعری پێشوو، لە ژێر لێوەوە و زۆر بە هێواشی:

'ئەو منداڵەی سەربازێک لە نیانگا کوشتی

ئەو منداڵە نەمردووە.'

دوای دووبارەخوێندنەوەی شـیعرەکە، لە خەیاڵی خۆمدا دوو کۆپلەی سەرەتا و کۆتایی شیعرەکەم هەڵگێڕایەوە و شوێن و کات و

دیمەنی ڕووداوەکانم بە کوردســـتان گۆڕین. بە قەڵەمێکی دار کە بە قەد ســەرە پەنجەیەکی مابووەوە و بەردەوام لە گیرفانی کراسـەکەمدا بوو، لە تەنیشت شیعرەکەی ئینگرێت یۆنکەرەوە نووسیم:

''ئەو منداڵەی لە گەرمیان سەربازەکان کوشتیان
ئەو منداڵە نەمردووە
ئەو منداڵە مستی بۆ دایکی هەڵبڕیوە
کوردستان هاوار ئەکات، بۆن هاوار ئەکات.
بۆ ئازادی و دەر و دەشت
لە دڵی گەمارۆدراوی شارەکاندا
ئەو منداڵە بووەتە سێبەری سەربازەکان
پاسەوانە بە چەک و زرێپۆش و دارەوە
لە هەموو کۆبوونەوەیەکی یاساداناندا ئامادەیە
لە پەنجەرەی ماڵەکانەوە لە دڵی دایکی ئەڕوانێت
ویستی لەژێر خۆردا یاریی بکات لە گەرمیان لە هەموو شوێنێک
ئەو منداڵە گەورە بووە و بە هەموو کوردستاندا ئەگەڕێت
ئەو منداڵە بووەتە خێوێک و تەواوی جیهان دەگەڕێت.''

دوای ئەوە کتێبەکەم داخســـتبوو، دەســـتم بە ســـەر بەرگەکەیدا دەهێنا، پاشـــان لە وێنەی ســـەر بەرگەکەیم ڕوانی، وێنەیەکی ڕەش و سپیی شـاعیر ئینگرێت یۆنکەری بوو، کە پێ دەچوو لەو وێنەیەیدا لە تەمەنی بیســـت ســـاڵیدا بووبێت: 'بێگومان ئەگەر تۆش چەند ســـاڵێک پێش ئێستا لە کوردستانەکەی من بوویتایە، وەکوو من، شیعر جێگەی ئازارەکانتی تێدا نەئەبووەوە.'

سەعاتێک بەو خەیاڵەوە بووم، بە تایبەتی بیرکردنەوە لە تاوانەکانی ئەنفال و هەڵەبجە، کە ئەو چەند ســـاڵەی دوایی تەواو بێ ئومێدیان

خوێندەوە.

فڕۆکەکە نیشتەوە و هێشتا من سەرم بە سەر کتێبەکەدا شۆڕ کردبووەوە، سەعات پێنجی دوای نیوەڕۆ بوو، لە دەرەوەی فڕۆکەخانەکە تاکسییەکم گرت و پێم گوت: 'بمبە بۆ نزیکترین هۆتێل.'

پێنج سەد مەترێک لە نزیک فڕۆکەخانەکەوە لە هۆتێلی؛ "باشترینی ڕۆژئاوا" بۆ پێنج شەو جێگەم گرت.

لە ئێوارەوە تاوەکوو سەعات یازدەی شەو نووستم، کاتێک بە ئاگا هاتمەوە و لە سەعاتەکەی دەستمم ڕوانی، کە سەعاتێکی تر دەبێت لە فڕۆکەخانە بم. وا بزانم خەونم بە میرزا کەریمی باوکمەوە بینیبوو، وەک هەموو جارێک لە خەونمدا پێی دەگوتم: 'جەلال بە نیازم لەو نزیکانە سەرت بدەم.' تەنیا ئەوەندە.

کاتێک گەیشتمە هۆڵی پێشوازیی فڕۆکەخانەکە، سەعات دوازدەی شەو بوو، لەوێ چەپکێک گوڵی سوورم کڕی، لە هۆڵی پێشوازی نزیک بوومەوە بینیم زیاتر لە دە ژن و پیاوی کورد ڕاوەستابوون، بێدەنگ دوورم گرت و لە پەناوە لەسەر کورسییەک بەرامبەر دەرگەکە دانیشتم.

سەعات بوو بە سێی شەو هێشتا میوانەکە، شێرکۆ بێکەس، نەگەیشتبوو، لەتاو ئازار چەند جارێک ویستم بڕۆم، ناچار هەستام و بەو ڕاڕەوەدا پیاسەم کرد، ئازارێک لە بڕبڕەی پشتمی دابوو، دانیشتن و گەڕان یارمەتییان نەدەدام، بێجگە لەوەی چەند جارێک دوو دوو

حەبی ئازارم دەخوارد، بەڵام دیار بوو هیچ سوودی نەبوو. دەمزانی، کە تەنیا چارەسەر پاڵکەوتنە لەسەر پشت.

کاتێک من لە هاتوچۆدا بووم و جێگەکەم گیرابوو، هەروەها ئیدی نەمدەتوانی لەســـەر ئەو کورســـییە ڕەقە دانیشـــم، گوێم لێ بوو، بە کوردی بانگ و هاوار کرا و بوو بە چەپڵەلێدان.

چەپکە گوڵەکە و گۆچانەکەم بە دەســـتەوە و دە مەترێک لە پشـــتی خەڵکەکەوە ڕاوەســـتام، کە بەردەوام چاوم لەســـەر شـــێرکۆ بوو. لە شـــوێنی خۆم نەجووڵام تـاوەکوو شـــێرکۆ خۆی وەختە بوو بە بەردەممدا تێپەڕێت. کاتێک گەیشـــتە نزیکم گوڵەکەم بەرەو ڕووی شێرکۆ هەڵبڕی، بە یەکەم نیگا ناسیمیەوە. باوەشبەیەکداکردنەی ئێمە درێژەی کێشـــا و خەڵکەکە هەموو بە ســـەرنجەوە لێیان دەڕوانیین: 'گوڵی سوور؟!'

کاتێک شـێرکۆ بێکەس ئەمەی گوت، چەپکە گوڵەکەم بەرەو ڕووی ڕاگرتبوو، پێم گوت: 'بەڵێ، سوور، بۆ ڕۆحی هاوڕێکانمان و هەزاران قوربانیی هەڵەبجە و ئەنفال.'

دوای ئەوە تا دەرەوەی فرۆکەخانەکە لەگەڵیان چووم، شـــێرکۆ دەستی گرتبووم و هاوپێی من دەڕۆیشت، کاتێک خەڵکەکە هەموو لە ئاوازێک دەیانخوێند و فەرمووی شێرکۆیان دەکرد، من باڵی شێرکۆم گرت و پێم گوت: 'تەنـدروســـتیم زۆر خراپە و خۆم بە پێوە بۆ ڕاناگیرێت، ئەوە کـارتی هۆتێلەکەمە و لێرەوە نزیکە، ســـبەی یـان دووسبەی کەی مەجالت هەبوو، چاوەڕێتم.'

دواتر بە خۆمم گوت لەوانەیە دوای چەند ڕۆژێک بێت یان تەلەفۆن بۆ هۆتێلەکە بکات، بەڵام ڕۆژی دواتر شـــێرکۆ بێکەس بۆ هۆتێلەکە

هاتبوو، به تەنیا دانیشـــتبووم و ویســـکی و لیمۆم لەســـەر مێزێک دانابوو، پێش ئەوەی شێرکۆ بگات دەستم بە خواردنەوە کردبوو.

کاتێک ئەو گەیشــت، باســـەکانمان لە ڕووداوەکانی کوردســـتانەوە دەستی پێ کرد، بە تایبەتی هەڵەبجە و ئەنفال، ئەو باسەمان درێژەی کێشا و شێرکۆ شیعرێکی لەسەر هەڵەبجە بە ناوی عومەری خاوەر بۆ خوێندمەوە.

دوای تەواو بوونی شـــیعرەکە، لە یەکمان ڕوانی و من گوتم: 'ئیتر شاعیری میللەتێکی چەوساوە ئاوای گوت!'

'ئەو ناسۆرە سەدانی وەک من و تۆ ئەکوژێت!'

بوتڵێک ویســـکیمان بە هەردووکمان خواردبووەوە، چووینە ســـەر باسی سەردەمی گەنجێتی و چۆن یەکەمین جار یەکتریمان ناسیبوو، کاتێک هاتینە سەر ئەوەی باسی جەمال شارباژێڕی بکەین، پێم گوت: 'کاتێک جەمال شـــارباژێڕی کتێبی شـــیعریی پەرینامەی بڵاو کردەوە، تۆ لەگەڵ جەمال ئەوســـــا دانووتـان پێکەوە نەئەکولا. گلەییـان لێ کردیت، کە تۆ هۆکار بوویت.'

'هۆکاری چی؟'

'دەی مەگەر سەروگوێلاکیان نەشکاندبوو.'

'ئەوە لەگەڵ کاک حوســـێن عارفیش باســـــی ئەوەمان کرد، گوایە براکانی ئەو خانمە کتێب ناخوێننەوە و پێ ئەچێت یەکێک پێی گوتبن.'

'ئیتر خۆت ئەزانیت ئەوســـا ســـلێمانی چۆن بوو، کەس نەیئەتوانی نهێنیی خۆی بپارێزێت. دڵنیا بە ئاگاداری نەبووم و زۆرم پێ ناخۆش بوو.'

زانیم شێرکۆ مەستە، باسەکەم خێرا گۆڕی و دەستم بۆ کتێبەکەی ئینگرێت یۆنکەر ڕاکێشـا و گوتم: 'خۆزگە هەوڵت ئەدا شـیعری ئەو خانمەت ئەخوێندەوە.'

شـێرکۆ کتێبەکەی بە دەسـتەوە گرت و گوتی: 'بە ئینگلیزییە، ئینجا مەگەر تۆ بۆم بخوێنیتەوە.'

دوای ئەوەی هەردووکمان دەسـتمان کرد بە پێکەنین. ژیاننامەی ئینگرێت یۆنکەرم بۆ شێرکۆ باس کرد و شیعری یەکەمیم خوێندەوە، کە لە هەمان لاپەڕەی کتێبەکەدا کردبووم بە کوردی.

پاش تاوێک بێدەنگی، نازانم چۆن بوو ئەوەم هاتەوە خەیاڵ، پێم گوت: 'شێرکۆ ئێستا خۆم و خۆتین و تەنیا بۆ دەردەدڵ بە ڕوونی و ڕاستی باس لەو ڕۆژە بکەین، بەڵام وەک شاعیرێک، کە ئێستاش ئەو گلەییەم لێت هەیە، کە تۆ و عەبدوڵڵا پەشـێو و هاوڕێیانی تر بەو بڕیارانە ڕازی بوون و سـمێڵتان بریسـکەی لێوە ئەهات، تەنانەت شانازیشتان بە خۆتانەوە ئەکرد.'

'کام بڕیار؟'

ڕۆژی بیست و دووی سێی ١٩٧٢م مەبەسـتە، یەکەم میهرەجانی شـیعری کوردی لە کەرکووک. لە هۆڵی قوتابخانەی ئیمام قاسم بوو، کە بڕیاری سانسۆرکردنی من و جەمیل ڕەنجبەر و چەند شاعیرێکی تر، نەوەک هەر سـانسـۆرکردن، بەڵکوو بڕیاری جۆرێک کوشـتنی مەعنەویمان بوو.'

'ئەگەر بتەوێت بە عەقڵی ئێسـتام باس لەو ڕۆژانە بکەم، لەوانەیە تەواو ڕایەکی جیاوازم هەبێت.'

'تۆ دەبووایە ئەو ڕۆژە هەڵوێسـتت هەبووایە، دووبەرەکییەکی ناشـیرین بوو، ئێوە لە ژوورەوە و ئێمە لە حەوشـەی مەکتەبەکە. من

ببوومایە لەجیاتی تۆ و هاوڕێکانی ترمان، ڕازی نەئەبووم و ئەهاتمە دەرەوە. ئەوە هەڵەیەکی گەورە بوو. ئەزانی، ئەوەی لە ڕوانگەدا گوتمان و کردمان، ئەوە تەواو پێچەوانەکەی بوو. دوای دوو ساڵ و لەو بە ناو یەکەم میهرەجانی شیعری کوردییە لە کەرکووک؛ یەک شەقی تێ هەڵدرا و خرایە تەنەکەی خۆڵەکەوە، بە تایبەتی تۆ، ئەوە پەشێو لە ڕیزی ڕوانگەدا نەبوو؛ ئەی تۆ؟ ئێوە باش ئەتانزانی شیعری هاوڕێکانتان لەسەر بیر و ڕای جیاواز و ڕەخنەگرتن قەدەخە کراون، هیچ هەڵوێستێکتان نەبوو. هەروەها پێشتر ئێمە ئەوەمان وەک هاوڕێ و لە کۆبوونەوەکانی ڕوانگەدا گەلێک جار باس کردبوو. هەرچەند تۆ لە ژمارەکانی ڕوانگەدا هیچت بڵاو نەکردەوە، ئەوەش ئەوەندەی تر گومانی لە لا دروست کردم، یان ئەوسا لە خۆتت ڕانەئەبینی؟!'

'ئەزانیت جەلال، ئێمە هەموومان بە جۆرێک لە ژێر کاریگەریی ئەو ڕۆژ و سەردەمەدا بووین. ئەی تۆ ئەوەت لە بیر چووەتەوە لە گوتاری ڕوانگەدا چی نووسرابوو، نموونە؛ "نووسەر و شاعیری ئەمڕۆ، شانبەشانی پیشەی نووسین و شیعر، کارگێڕیشە، شۆڕشگێڕیشە، جەنگاوەریشە، ئێمە نووسینمان مرۆڤی کورد دەینووسێت، بۆیە بۆ نەتەوەی کورد دەبێتە مەشخەڵ." زۆر لەوە زیاتریش، ئەتوانم بڵێم تەنیا من پێڕەوی کرۆکی ناوەڕۆکی گوتاری ڕوانگەم کردووە، زیاتر لە تۆ و هاوڕێکانی ترمان.'

'لەوەیاندا تەواو لەگەڵتدام، ئەگەر بە چاوی ئێستامان لە بانگەوازی ڕوانگە بڕوانیین، زیاتر بەلاغێکی نەتەوەیی و سەربازی بوو، وەی لەوەی ئەدەبی و هونەریی بێت. لە ڕاستیدا شێرکۆ؛ ئەگەر منیش ئاوا کەمئەندام نەبوومایە، ساڵانی ڕابردوو ئەگەڕامەوە، وەک تۆم نەئەکرد. بەڵام لەوێ ئەبووم، ئێمە بە بیری ڕوانگە ویستمان پێکەوە بەرگەی

ئەو کـاریگەرییـانە بگرین و ملکەچ نەبین! بـاشـــترە بڵێم؛ بەرگەی کوردبوون بگرین، کە زۆر ســـەختە. بەڵام دیارە ئێوە ئەو ڕۆژە لە ئاستی ئەوەدا نەبوون. ئەوە تەواو بڕیارێکی سیاسی بوو، لێرەدا تەنیا مەبەستم لە هەڵوێستی شەخسی ئێوە بوو، چونکە ئێمە هەفتەیەک پێش ئەو ڕۆژەی میهرەجانە، بەرنامەیەکمان نووســی بوو، کە ئێمە بە چ مەرجێک بەشداری ئەکەین، من و تۆ، ســامی شــۆڕش و پەشــێو، مەحەمەد بەدری، ســـەلاح شـــوان، جەمال شـــارباژێڕی، وابزانم عەبولســـەلام ئامادەبوو، کە پێکەوە یەک هەڵوێســـتمان هەبێت. بەڵام بەداخەوەم. تەنانەت ئەوان بەوەشـەوە نەوەسـتان ئیدیعای حیزێتی و نێربازیشیان خستە پاڵمان!'

'بە هاوڕێیەتیمان جەلال؛ من ئەوانەم هەمووی دوای میهرەجانەکە بیست! پاشـان سـانسـۆرکردنی تۆ و برادەرانی تر لەو میهرەجانەی کەرکووک، بە بڕیـاری مـارف خەزنەدار بوو، چونکە ئەوســـا ئەو لێپرسراوی میهرەجانەکە بوو.'

فایلێکی زەردم لە جانتاکەم دەرهێنا و خســتمە بەردەم شــێرکۆ و پێم گوت: 'ئەوە دەربارەی ئەو میهرەجانی شـــیعرەی کەرکووکە، بە ناونیشـانی؛ لە یەکەم میهرەجانی شـیعری کوردی لە کەرکووک چی ڕووی دا، بە نیازم بیکەم بە کتێبێک.'

شێرکۆ فایلە زەردەکەی بە دەستەوە بوو، خۆمم لێ نزیک کردەوە و پێکەوە لە لاپەڕەکانیمان دەڕوانی: 'ئەو شــیعرەی جەمیل ڕەنجبەر، شـــایانی ئەوە بوو یاســـاغ بکرێت و تەنانەت ڕێگەشـــی پێ نەدەن بخوێنرێتەوە، ئینجا توو هـاوڕێیەتیمـان ئەو پیاوە قابیلی ئەو هەموو ئیهانەپێکردنە بوو؟'

'تۆ ڕاسـت ئەکەیت جەلال، کاتی خۆی جەمیل لە شـاخ هەمان ئەو گلەییەی تۆی لێ کردم.'

'ناحەقی ناگرم!'

لکە زەیتون لە گێژاوی خوێنا.'

'ئەوە ناونیشـــانی شـــیعرەکەی جەمیلە، لەگەڵ ئەوەی عەبدوڵڵا پەشـــێو، لێرەدا من نامەوێت بەراوردیان بکەم، یان کامیان تەنیا بۆ وورووژاندنی هەست و سـۆز و ڕازیکردنی دڵی هەمووان نووسـراوە! بەڵام کە پێشـوەختە بڕیار درابوو تۆ لە سلێمانی و پەشێو لە هەولێر هەڵبژێرن، لەبەر بەرزڕاگرتنی کڵپەی شـــۆڕش. ئەمڕۆ ئەبێت تۆ و پەشێو ئەو پرسیارە لە خۆتان بکەن.'

'جەلال گیان، ئەوە من دوای نەمانی جەمیل ڕەنجبەر بە باشی بیرم لێ کردەوە، بە عەقڵی ئێســتام تەواو لەگەڵ ئەو قســانەی تۆدام، ئەو کاتە تۆ و جەمیل بێجگە لەوەی چەپ بوون، بیرکرنـەوەی ئێوە بۆ تێگەیشتنی زۆرینە گران بوون. هەروەها حیزبی شیوعییش لە بەرەی گەلدا نەبوون و هاوپەیمانی بەعس بوون، ئیتر تۆ و جەمیل و گەلێک هاوڕێی ترمان ئەو ڕۆژە باجەکەیتـان دا. ئەمە ســـاڵی ١٩٧٢وە و هەموو کورد گۆرانیی بە باڵای مســـتەفا بارزانی و حوکمی زاتیدا هەڵئەدەن.'

'شـێرکۆ، ئەگەر بمانەوێت لە مەبەســت و کرۆکی بابەت لا بدەین، ئەوا بەو جۆرە ئەڵێین، ئاخر فڵان شـــاعیر بۆیە پەراوێز خرا چونکە بیر و ڕای جیاواز بوو، لە کاتێکدا ئێمە باس لە میهرەجانی یەکەمی شـیعری کوردی ئەکەین، کە نەئەبووایە بە سـیاسـی بکرایە، ئینجا پێ ئەچوو... شاعیرانێک بەشدار بوونایە، کە بیر و باوەڕیان جیاواز بوو،

که به شیعر باسی ئازاری چەوساندنەوەی خۆیان بکردایە، نەوەک لایەنێک قۆرخی بکات.'

'ئەوسا و دواتریش هەموومان شیعرمان وەک کەرەستەی شۆڕش ئەبینی.'

'دەی، قوڕ بەسەر ئەو میللەتە!'

'جەلال، تۆش سەردەمانێک ئەو کارەت کردووە. سالّی حەفتا و چوار تۆ ڕادیۆی شۆڕشت بەڕێوە دەبرد و هەموو هەفتەیەک شیعرت بۆ ڕۆژنامەی برایەتی ئەنووسی. تۆ واز لەوە بێنە و گوێ لەم چەند دێرە شیعرەی جەمیل ڕەنجبەر بگرە:

بۆ پێکانی شەوی شۆڕش وا لەریدا
چونکە تا پار.. تا ئەمڕۆکەش..
لەپردی پەیمانی چەورا، هاتین، بەغار
هیچمان نەینا،
نە بۆ برسی، نە بۆ هەژار.'

'شێرکۆ، گوێ لە کۆپلەی دوای ئەوە:
ئەگەر شیعرم.. قایل بوایە بەژێردەستی
گوێتان دەگرت
خوێن و زامی گریەی دوێنێ..
بە بار داخی پێ دەخواردن
ئەگەر شیعرم دانسی شۆخی ئاهەنگ بوایە
گوێتان دەگرت
بلیتێکی گران بایی..
سەدان دینار، زۆر قوربانی پێ دەژماردن.'

من خوێندمەوە و شـێرکۆ بێدەنگ لە دێڕی شـیعرەکەی دەڕوانی، وەک بیەوێت لە خەیاڵی خۆیدا دووبارە بیخوێنێتەوە. پێم گوت:

'پاشان جەمیل بەوە کۆتاییی بە شیعرەکەی ئەهێنێت:

شیعرەکانم..

گۆرانییەکی بیری نوێیە

پارووی دەمی زگی برسی کوردی پێیە

شیعرەکانم خوێن و گڕن

وەک دایکێکی، کۆرپە ون بوو

بۆ پەلاماری پەیامێ.. هار و دڕن

بۆیە ئەگەر..'

هەردووکمان بە کۆرس گوتمان، بۆیە ئەگەر... بۆیە ئەگەر...

لاپەڕەکانمان هەڵدایەوە و گەیشتینە سەر شیعرەکەی پەشێو، گوتم:

'ئەوەش شیعرەکەی پەشێو.'

'ئەرێ جەلال دیارە دواییش دێیتە سـەر بەراوردکردنی خۆم و خۆت، باشـە لەبەر ئەوەی ئامادەی ئەو شـەڕە بم، پێکێکی خەستم بۆ تێ کە.'

'ئەوەندەم بەسە، کە توانیم بەرەو ڕوو وەک هاوڕێ و دوو شاعیر پێت بڵێم. میللەتانی دونیا بۆیە خاوەنی زمان و فەرهەنگ و هونەری ڕەسـەنی خۆیانن، چونکە مرۆڤی خاوەن هەڵوێستیان هەیە و تا سـەر ئێسقان لەگەڵ یەک ڕاستگۆن. ئەو ڕۆژە ئەبووایە ئەوە ڕووی نەدایە. ئەوە ئاوێک بوو ئێوە ڕشتتان، کە تا سەد ساڵی تر نەوەی دوای ئێوە پێی تێ ئەخشـێنن و شـانامەیان لێ ئەبێت بە شـیعر، ئێمە لە ڕوانگە ویستمان شیعر لە شانامەوە بگۆڕین و شوناسی هونەری خۆی پێ بدەینەوە، بەڵام ئەو ڕۆژە لە کەرکووک... تۆ پشـتت کردە ڕوانگە و

دواتر هەر لێشی پەشیمان بوویتەوە. هەروەها هاوڕێکانی تریشمان، ئیتر با لەوە زیاتر لەسەری نەڕۆم. باش بزانە هاوڕێم خەمەکەی من تەنیا ئەوە نییە، کێ لەوێ بردییەوە... کێ باشترینە، یان کێ بوون ئەو کارەیان کرد و داوای لێبووردنێکی ئێمە قەرزار بن، ئەوە هەڵەیەکی مێژوویی بوو، کە ڕاستبوونەوەی بۆ نییە.'

'ئەگەر تۆ ئەم دوو شیعرە بە باشی بخوێنیتەوە و بگەڕێیتەوە بۆ ئەو سەردەمە و ڕای گشتی، کە بە دەگمەن کەسێکت ئەدۆزییەوە لە ژێر کاریگەریی ڕاست و چەپدا نەبووبێت. هەروەها دەنگۆی بەیانی یانزەی ئازار و شۆڕشی ئەیلوول کەم نەبوو، بگرە بۆ خۆی پەتایەک بوو! کە جەنابیشت گرتت!'

'ڕاستەکەیت، ئەی قوڕبەسەر ئەو میللەتەی شاعیری تێدا هەڵناکەوێت.'

'ویسکییەکەی چاکە جەلال! من کاتی خۆی ئەو گلەییەم لە پەشێو هەبوو، لەسەر کۆپیکردنی بیرۆکەی ئەو شیعرەی تۆ "نەمر"، کە ساڵی حەفتا نووسیت و پێم وا بێت لە ژمارە شەشی هاوکاریدا بڵاو بووەوە، پاشان پەشێو هات و ساڵی حەفتا و دوو لەو میهرەجانە، لە ژێر ناوی "هەندێک وانە بۆ منداڵان"دا خوێندییەوە. ئەبووایە پەشێو وەکوو سەرچاوە ئاماژەی بە شیعرەکەی تۆ بکردایە.'

'ئەی ناونیشانی، شەونامەی دڵدارێکی تینوو، لەگەڵ شەونامەی شاعیرێکی تینوو!'

'بەڵێ، زۆربەمان لە سەرەتاوە تووشی ئەو هەڵەیە بووین!'

'دوانزە وانە بۆ منداڵان، پەشێو ئەم چەند دێڕە لە شیعرەکەیدا نەبووایە، ئەویشیان وەکوو من و جەمیل شاربەدەر ئەکرد، گوێ بگرە:

منداڵەکان
لەسەر بۆرییە نەوتەکان
لە دیواری
ئاودەستخانەی مزگەوتەکان
دە ملیۆن جار
نووسیمان بژی چەوساوە
نووسیمان بژی کرێکار
بەڵام، هەموو نووسینەکان
تەنیا جارێک
نەیانتوانی ببنە پاروو
تێر کەن زگی کرێکارێ.'

'دەربڕینی پەشیمانییە لە بیری چەپ!'

'بەڵام جەلال نابێت ئەوەت لە بیر بچێت، کە ئێمە باس لە شیعری بەرگری و سەردەمی شۆڕشی ئەیلوول و بە تایبەتی بەیانی ١١ی ئازار ئەکەین.'

'تکات لێ ئەکەم شێرکۆ، ئێمە ئێستا وەک دوو شاعیر، لە سەردەمێکی تردا و لە پاشەملە، زۆر بە ڕاشکاوی و تایبەت... باس لە هونەری شیعر ئەکەین، ئیتر لە هەرچی سەردەم و ئان و ساتێکدا بێت.'

'ئەوسا ئاوا بوو، کە لەجیاتی جەمیل ڕەنجبەر بیتاقەکە بۆ عەبدوڵڵا پەشێو دەرچوو، ئەی سلێمانی، لە نێوان من و تودا...'

کاتێک شێرکۆ ئەمەی گوت، فایلە زەردەکەم لەدەست شێرکۆ وەرگرت و قسەکەیم پێ بڕی: 'بۆ جەنابت دەرچوو. ئیتر ئەوەی خۆم و خۆت با نهێنیی نێوان خۆمان بێت. تازە تۆ بوویت بە پێغەمبەری

ئاخر زەمانی میللەتی کورد و من شەڕی تۆم پێ ناکرێت، تۆ خاوەنی شیعری "سوتماک"یت، ئەو شاکارە. لە ئێستادا تەنیا ڕەخنەم لێت ئەوەیە، کە بە داخەوەم، لایەنگر بوویت و چاوت لەو هەموو کوشتار و زوڵم و زۆرەی ئەم پازدە ساڵەی ڕابردوو پۆشی. شیعرت بۆ زۆر کەس نووسی و ناوی شۆڕشگێڕت خستە پاڵیان. دڵنیابە لە پاشەڕۆژدا نەوەیەک دێت و ئەو ڕەخنەیەت لێ ئەگرێت.'

'بۆ... کێ؟'

'ئەوانەی لە شەڕی براکوژیدا دەستیان هەبوو یان بەشدار بوون!'

'لەوەیاندا من لەگەڵتدا نیم.'

'دیارە جارێ زووە، با کەسانی تریش پێت بڵێن و کاتی بە سەردا تێپەڕێ. شێرکۆ، نەک بەتەنیا تۆ، بەڵکو نەوەیەک لە داهاتوودا دێت و لەسەر هەڵەکانمان مەحکەمەمان دەکەن، بۆ نموونە؛ لەسەر ڕەوایەتی دان بە وشەی شەهید لە شیعری کوردیدا، تۆ بزانە ئەو وشەیە چ ڕەگ و واتایەکی دژە هونەر و ئەدەبی لە پشتەوەیە!'

'جەلال تۆ، پێش ئەوەی شاعیر بیت، شۆڕشگێڕ و کەسێکی چەپی بێوێنە بوویت، بە بیرت دێت کاتێک یەکەم جارمان بوو یەک ببینین، داوات لێ کردم بخوێنمەوە، هەموو ڕۆژێک بە دوامدا ئەگەڕایت و کتێبت بۆ ئەهێنام، من ئەوسا نە شیعر و نە سیاسەت هیچیانم لە خەیاڵدا نەبوو، بگرە هەر بیریشم لێ نەئەکردنەوە، تۆ تووشی ئەم دەردیسەرییەت کردم. ڕوانگەش بیرۆکەی تۆ و عەبدوڵڵا عەباس بوو، بەیاننامەکەش خۆت نووسیت.'

'پێکەوە چووین بۆ چەقڵاوە؟!'

'بەڵێ، من ئەوسا تەمەنم چواردە ساڵ بوو. هەموومان بەخیلیمان بە تۆ ئەبرد، تۆ ئازا و چاونەترس بوویت، هەروەها، بەهاری غالب

عەربەتی، جوانترین کچی شـــاری ســـلێمانی عاشـــقی تۆ بوو. ئیتر ئەوەش قسمەت و نەسیبی تۆ، لەم دووره ولاتە خۆت ئەشاریتەوە و سەیارە ئەتکات بە ژێرەوە و گێرت ئەکات.'

'وەک مام زامن ئەیگوت، کە قسـه هاتە ســەر ئەوەی گوتمان ئیتر ئەوەش قسمەت و نەسیب، باسەکە بگۆڕین یان بێدەنگ ببین باشترە.'

'جەلال، مام زامن کێیە؟'

'بۆ تۆ مـام زامنت نەئەناســـی؟ مـام زامن لە گەڕەکی مەڵکەندی دووکانی نوقڵفرۆشی هەبوو؟!'

'ئەوە یەکەم جارمە ناوی ئەبیستم. یان بە بیرم نایەتەوە... وا بزانم کاتی خۆی ئەو ناوەم بەر گوێ کەوتووە!'

'خۆزگە بە منداڵی تامی نوقڵەکانی مام زامنت ئەکرد.'

'ئەگەر باش لە بیرم بێت، ناوی مام زامنم لە دەمی فایەق بێکەسـی باوکمەوە بیستبوو یان کامەران موکری بوو، بیرم ناکەوێتەوە.'

'ئێ، ئێ. دڵنیام هاوڕێی نزیکی باوکت بووە!'

## ١٩

'وەک ڕۆحلەبەرێک هیچ پاساوێکمان لە پێش نییە تاوەکوو لە پرۆسەی مردن بترسین!'

کاتێک مام زامن ئەمەی گوت، لەسەر کورسییەک بەرامبەری دانیشتبووم، سەرم بە لای شانی چەپمدا لار کردبووەوە، زۆر ماندوو بووم، چاوم نووقاندبوون و مام زامن زووزوو نووزەیەکی لێوە دەهات، بێ ئەوەی بیەوێت هیچ بڵێت. باڵەکانم شێوەی پارچە پەڕۆیەک بەملاولامدا شۆڕ بووبوونەوە، وەک بڵێیت لەسەر کورسییەکەم پاڵ کەوتبم.

مام زامن بە مقاشەکە پشکۆی نێو زۆپاکەی هەڵدەگێڕایەوە، دوو قۆپچەی یەخەی کراسەکەی ترازاندبوون و دەستی بە نێو تووکی سینگیدا دەگێڕا، لێی ڕوانیم و پێی گوتم: 'جەلال، تۆش لە ترسی مردن، چەشنی ئەوانی تر لەتاو زەبری هەوەسەکانت لە باوەڕ و کردەوەکانی ڕابردووی خۆت پەشیمان نەبیتەوە و داوای ژیانێکی ئەبەدیم لێ بکەیت.'

'نەخێر، بە جەستە ماندووم، وەک تر بە نیازی مردن نیم و ئیشم زۆر ماون.'

'ئیشت زۆر ماون؟! تێ گەیشتم.'

پێم وا بێت ئەو ڕۆژە بێزاری ئەوە بووم، لەگەڵ قادری برامدا گفتوگۆیەکی دووردرێژمان کردبوو، کەسمان نەمانتوانی باوەڕ بەوی ترمان بهێنین. ئەو وەک لێپرسراوێکی قوتابییانی پارتی، منیش

لێپرسراوی سلێمانی قوتابییانی شیوعی بووم. لە یەک کات و بۆنەدا هەردووکمان گوتارمان خوێندەوە، وەکوو دوو بەرەنگاری سەرسەختی یەکترین، بەڵام دوای ئەوە قۆڵمان کرد بە قۆڵی یەکا و زیاتر لە دوو سەعات پیاسەمان کرد. لەسەر ئەوە، مالیک ماوەیەک خۆی لە قادر توورە کردبوو، تاوەکوو من ڕۆژێک ئاشتم کردنەوە.

لە غەریبی، دیمەنی ئەو یادەوەرییانە بەردەوام لە خەون و خەیاڵەکانمدا دووبارە دەبووەوە، بەتایبەتی لەو سات و ڕۆژانەدا، کە ئازار و تەنیاییم زۆریان بۆ دەهێنام و لە ژیان بێهیوا دەبووم. دەمزانی ژیان کاڵوکرچ و بێڕەنگە و دەبێت خۆم ڕەنگی پێ ببەخشم و بیڕازێنمەوە، پاشان سروشتم چارەنووسم دیاری دەکات. ئەگەر شتێک هەبێت من لەپێناویدا بژیم؛ گەڕانەوە، لەزەتی نوقڵێکی ترش و شیرین، خەونی ئازادی، کە ئێستا لەپێناویاندا دەژیم.

بێجگە لە تەنیایی، جەستەی تێکشکاوم باری سەر شانمی گران کردبوو، بۆ چوونەبازاڕێک، بە چوون و هاتنەوەم زیاتر لە چوار سەعاتم پێ دەچوو، بازاڕێک، هەر هەزار مەترێک لە ماڵەکەمەوە دوورە، زیاتر لە مەترێک بەفر باریبوو، بۆ بڕینی ئەو بەفرە، پێویستیت بە دوو قاچی ساخە، کە بتوانێت لەسەر خۆی ڕات بگرێت و هەنگاویان پێ هەڵبێنیت. بڕینی ئەو ڕێگەیە بۆ کەمئەندامێکی وەک من ئەستەمە، بەڵام ناچار بووم، چونکە خواردن لە ماڵەکەمدا نەبوو. ئەگەر بڵێم نەبوونی جگەرەکە زیاتر هانی دام ئەو ڕێگەیە کوورەکووڕ بگرمە بەر، ئەمەیان ڕاستترە.

ڕێگەیەک نەبوو بۆ گەڕانەوە، هیوایەک نەبوو بۆ بینینەوەی ئەوانەی ڕۆژێک خۆشم ویستوون، چاوم نەدەچوونە خەو، ئەگەر

دوای خواردنەوەیەکی زۆر خەوم لێ بکەوتایە، لە خەونمدا هێشــتا لە ناو ســــندووقە چاییەکەی ژێرزەمینەکەی ماڵە کۆنەکەماندا بووم. خەونێک یان دەتوانم بڵێم ترســـێک، کە لە منداڵیمەوە لە ڕۆحمدا هێلانەی کردبوو. ئەو ڕووشـــاوییەی ســـەر ئەژنۆکانم بەردەوام دەخوران و توێژاڵیان هەڵدەدا، نازانم بۆچی تەمەنێک بوو ســـاڕێژ نەدەبوون.

ئەو ڕۆژەی بۆ بازاڕ چووم، کە گەڕامەوە لەتاو ئازار لەســـەر قەنەفەکەم ڕاکشـــابووم، زۆر هەوڵم دا خۆم بخەمە ســـەر لا، دوای ئەوەی نەمتوانی و لەتاو ئازار چاوم نووقاند، دیســـان ئەو پرســـیارەم لە خۆم کرد؛ ئەگەر زوڵمیان لە بەهار نەکردایە! ئەوا مام زامن بۆ هەتاهەتایە ماڵئاوایی نەدەکرد و ئەو شـــارە بەر نەفرەتی ئەو نەدەکەوت، هەروەها جڵەوی ژیان و ویژدانی مرۆڤەکان لەو شـــارەدا ڕەنگی سروشتیی خۆیانیان دەنواند. منیش بەو جۆرە لە ژیان نائومێد نەدەبووم و وڵاتم بەجێ نەدەهێشـــت. ناســـینی مام زامن و بەهار بۆ من، لەگەڵ ئەوەی لە ماڵی میرزا پەروەردە بووم، ئەمانە بە ڕێکەوت نەبوون و ڕێڕەو و چارەنووسی ژیانی منیان دیاری کرد، کە دەتوانم بڵێم بەبێ خواســـی خۆم ســـکێچی فۆرمی کەســـایەتی منیان کێشـــا. ئەوەیە بە درێژاییی سی ساڵی ڕابردوو خەیاڵی منیان داگیر کردووە. ئەوە نهێنیی بوونی مام زامن با لەو لاوە بوەســـتێت، کە دەتوانم بڵێم لای کەس باســـم نەکردووە، تەنیا ئەوانە نەبێت کە دەیانناســـی، یان باشـــترە بڵێم؛ وەکوو من باوەڕیان پێی هەبوو. هەرچەندە ئەوانیش بەردەوام دەیانپرسیی: 'مام زامن چی بوو؟'

ئەو پیاوەی هەموو شـــیعرەکانی خۆمم بۆ خوێندبووەوە، هەندێک جار کە مەســـت دەبووم، دوای خوێندنەوەی شـــیعرەکەم، پەڕەکەم لە

دەفتەرەکەم دەکردەوە و لوولم دەکرد و دەمخســـتە ناو زۆپاکەوە، ئەوســـــا هەســـتم دەکرد ئیتر ئەو شـــیعرەم بۆ هەموو دونیا خوێندووەتەوە و ئیتر دەوری تەواو بووە.

ڕەحیم موکریانی و سـوبحی فەیلی دەیانگوت؛ مام زامن خوداوەند بوو، هەروەها مالیکی ئامۆزاشـــم، کە بەس من تێی دەگەیشـــتم و زووزوو ئاماژەی بە هەمان شـــت دەدا. ئەوەی بە لامەوە جێگەی پرســـیار بوو، پەیوەندیی نێوان مالیک و مام زامن بوو، هەندێک جار مام زامن، کە قســـەی دەکرد پشـــتی لە مالیک بوو، کەچی مالیک لە شـوێنی خۆیەوە ســەری بۆ دەلەقاند و وەک گوێی لێی بووبێت و لە تەواوی قسـەکانی گەیشـتبێت، لەو نهێنییە نەگەیشـتم و هەروەها لەو بارەوە پرسیارم لە مام زامن نەکرد.

ئەمڕۆ بیســـت و حەوت ســـاڵ بە ســـەر ونبوونی مام زامندا تێدەپەڕێت. ناتوانم یادەوەرییەکانی لە بیر بکەم، باشـــترە بڵێم؛ ئەمڕۆ بیســت و حەوت ســاڵ بە ســەر ونبوونی مام زامن، بەهار و دایکمدا تێپەڕیوە و ڕۆژی چوارشـــەممەیە، لە یادی ئەواندا دوازدە ســـاڵێک پێش ئەمڕۆ، شـــیعرێکم نووســـیبوو، بە دیواری ڕاڕەوی ماڵەکەمدا هەڵمواســـیبوو، لە کۆنیدا کاڵ بووبووەوە و چەند جارێک تۆخم کردبووەوە، جاران بە خوێندنەوەی شـیعر، بە تایبەتی شـیعرەکانی خۆم ئاسوودە دەبووم، بەڵام ئێستا خوێندنەوەی شیعر سوکنایی بە دڵم نابەخشـێت، وەک بڵێیت ئیتر شـیعر جێگەی خەون و ئازارەکانی منی تێدا نابێتەوە:

"چاو لە ئاستی نەخشەیەکی درێنراوا،
چۆن فرمێسکی بکاتە ڕێی دۆزینەوە؟
گیان لە بەردەم کەشکەڵانی چوار دیواری

دڵێکی شەقارکراوا،
چۆن ببێتە باڵی حەزی
مەلی هیوای پەڕینەوە؟
دڵۆپەئاورنگی لەسەر کوڵمی زەردی
بەهارێکی سووتێنراوا،
چۆن ببێتە ڕۆژمێری بێکۆتایی."

دکتۆر پێی گوتم؛ کە فریای گەڕانەوەش ناکەوم و گوایە دڵم بەرگەی چەند مانگێک ژیانی بە بەرەوە نەماوە، بەڵام دیارە مام زامن ساڵێکی دیی ژیانی پێ ڕەوا بینیوم. کە لەم ساتەدا، نامەوێت زۆر بیری لێ بکەمەوە، هەروەها ناشمەوێت بچمە نێو قووڵاییی یادەوەرییەکانمەوە، یان بیر لە ئەنجامی ئەو گەڕانەوەیەم بکەمەوە. ئیتر ئەگەر بۆ مردنیش بێت، کە دەمێکە بە خەون و خەیاڵ، یان هەندێک جار ئەزموونی ئەو مردنەم کردووە و بێ هیچ ترس و دوودڵییەک پێشوازی لێ دەکەم. گرنگ ئەوەیە من بۆ کوردستان دەگەڕێمەوە و دەچمە هەولێر، ئەگەر توانیم تەنیا بۆ یەک جار سەرێک لە سلێمانی دەدەمەوە، لە گەڕەکی سەرشەقام چاوم بە داروپەردووی خانووە کۆنەکەمان بکەوێتەوە، کە ڕۆحم لە هەموو شوێنێک زیاتر هۆگریەتی.

لەو تەنیاییيەمدا، وەکوو هەموو جارێک لەگەڵ خۆمدا دەدوام، سوبحی فەیلی، لە ناکاو لە ناوەڕاستی ژوورەکەدا پەیدا بوو، بە دەستی چەپی گەڵوگونی دەخوراند. کاتێک بینیم لێی سڵەمیمەوە، وەک لە غەیبەوە پەیدا بووبێت.

هێشتا دەستی چەپی لە نێوان ڕانەکانیدا بوو، دەستی ڕاستی بەرەو ڕووی من بەرز کردەوە، بە تووڕەیییەوە گوتی: 'تۆ وەک

سەگی گەڕ دەبێت لەو قەسابخانەیەی خوار شاری سلێمانی بمریت، وەک جەماله گەڕ، بەڵێ وەک ئەو دڵت بوەستێت و بکەویت و بمریت، چونکە تۆ و جەمالی سەگ زۆر لە یەک ئەچوون، ئینجا ئەوانەی ئەوەندە وەفادارن زۆر ناژین، چونکە تۆ تا بچیتە تەمەنەوە زیاتر بەرەو ویرانبوون ئەچیت و بەرگەی پیری ناگریت!'

'ئەریّ تۆ ئەڵێیت گوێت لە ناوی خۆت بوو، وەک بایەقوش پەیدا بوویت، تۆ کەی ئەوەندە بێئەدەب بوویت، خۆم لە خۆمدا نیم و تۆش بەو قسانەت ئەوەندەی تر ئازارم ئەدەیت.'

'دەی لە قسوورم عافوم کە، بێزارم کاتێک بەو جۆرە دەتبینم. جەلال تۆ قەت زەلیل نەبوویت و نامەوێت بەو جۆرە بتبینم. گوێم لێت بوو، جەلال گوێم لە هەموو قسەکانت بوو!'

'هەر دێیت، دێیت، بە ملی شکاوت هەموو جارێک لە ناکاو پەیدا ئەبیت، کاکە تۆزێک بە هێمنی.'

'دەی باشە، دەڵێم جەلال تۆ جەمالت لە بیرە؟'

'جەمالی برام؟'

'نەخێر، تووتەڵەسەگەکەم مەبەستە، کە بە ناوی جەمالی براتەوە ناوت نابوو.'

'ئێ، ئێ.'

'نامیق ئاغای هاوڕێی باوکت، لەسەر ئەوە لێت تووڕە بووبوو!'

'دایکیشم زۆری پێ ناخۆش بوو.'

'ئەزانیت جەلال، ئەوە نامیق ئاغا بە دایکتی گوتبوو، لە دڵسۆزی، چونکە نامیق ئاغاش وەکوو ئێوە دڵی گەورە بوو، ئەویش ئەیویست خەمی هەموو خەڵکی شار هەڵبگرێت، نامیق ئاغا دڵی ئەوەندە گەورە بوو لە نێو سینگیدا جێگەی نەدەبووەوە، ئەو پیاوەی بۆ یەکەم جار

به تۆی گوت: "جەلە سەرزل." تۆش ماوەیەک لەسەر ئەو قسەیەی ڕقت لێ هەڵگرتبوو، بەڵام نەتدەزانی ئەو پیاوە لە خۆشەویستییەوە ئاوای پێ ئەگوتیت، چونکە لەگەڵ ئەوەشدا کە قسەی زۆر ئەکرد، بەڵام هەندێک جار لە شەرمنیدا ناو و ناتورەی لە خەڵکانی نزیکی خۆی ئەنا. ئێستا تێ گەیشتیت مەبەستم کێ بوو؟!'

'بەڵێ، بەڵێ، نامیق ئاغای گەڕەکی سەرشەقام، ئەو پیاوە بێوێنەیەی کە هیچ ڕەوشتێکی ئاغای تێدا نەبوو.'

'ئەی جەماله گەڕ؟ هەرچەند دەڵێش بوو، چونکە جەمال زیاتر لە دە ساڵ بە دوای قنگی تۆ و مالیکەوە بوو، ئاگای لە هەموو هەڵسوکەوت و کردەوەیەکی باش و خراپتان بوو.'

'ئەرێ سوبحی تۆ پێم ناڵێیت، کەی لە کۆڵم ئەبیتەوە، ماوەی ساڵێک دیار نەبوویت دڵم خۆش بوو، وام زانی تۆش خۆتواتەنی وەک سەگ لە جێگەیەک تۆپیویت و لە دەستت نەجاتم بووە! بەڵام...'

'بەڵام چی؟'

'بەڵام تۆش وەک من ناتوانیت، واز لەو شوێن و خەڵک و مێژووە بهێنیت!'

'دەی سەری مام زامن بە قوڕدا بچێت!'

'بۆ مام پیاو، مام زامنی داماو چی بکات؟!'

'ئەو تۆی پێ ناساندم و تووشی ئەم خەمەی کردم.'

'بۆ تۆ حەزت ئەکرد نەزانێکی مەرگدۆست بوویتایە؟'

'نەخێر، عەیبت نەکرد، قەت بیرم لێ نەکردووەتەوە.'

'دەی ئەو گەڕەلاوژێیەت لە چییە؟!'

'تۆ مەجبوورت کردم ئەو قسەیە بکەم!'

'باشە، بزانم بۆچی هاتوویت؟!

'دەڵێم جەلال شیعری تازەت نووسیوە؟!'

'زانیم، بە ناخێری گیانت ئەو پرسـیارەم هەر لێ ئەکەیت، لەتاو ئازار خەو نەچووەتە چاوم، ئینجا من بەم جەستە تێکشکاوەمەوە چۆن بتوانم پەی بە قووڵایی خەیاڵەکانم بەرم و سەرنجم لەسەر ساتێک ڕابگرم، بزانە ئەو چەند دێڕە:

کێ بە کۆڵانەکاندا تێپەڕێت
لە سێبەری دیوارەکاندا ون بێت
دارگڵۆپەکان شایەتحاڵن
پەنجەرەکان کێ لێوەیان هەڵهات
سنوورەکان تەلبەندن
منداڵەکان ناگەڕێنەوە
چرای ماڵەکان خامۆشن
دیواربەندکان پۆرترێتی باوکانن
ڕاخەرەکان ڕەنگی دایکانیان گرتووە.'

'تۆ دایم بۆ خۆدزینەوە لە نووسین بیانوویەکت هەبووە!'

'بۆ، سەخیف بەدڵت نەبوو؟'

'یەعنی!'

'سوبحی، ئێستا بیانووەکەم بۆ خواستی مردنە نەک بۆ نووسینی شیعر، ئەو حەبی ئازارەی بەکاری ئەهێنم، گێژ و ورم ئەکات و هەرچییەکیش ئەنووسم هەست ئەکەم جۆرێکە لە گەڕەلاوژێ.'

'جەلال، تۆ ئەوە بە یەکێک بڵێ کە نەتناسێت!'

'ئیتر خۆ من زۆریی کەسم لەسەر نییە، منەتی تۆش بە هیچ!'

'دەی، دەی، جەنابی جەلالی میرزا کەریم، نەتەوەیەک چاوەڕوانی دەستودوامانی قەڵەم و نووسینەکانی تۆیە، ئێستا باشترین

شاعیرەکانمان بوونەتە شایەر و شانامە بۆ مەرگدۆستی ئەخوێنن.
دەی چۆن قوربان!'

'لە ئەزەلەوە هەر ئاوا بووە، بەڵام ڕەنجی من...'

'بۆ بەشی ئەو میللەتە هەژارەیە؟!'

'من و تۆ زۆر باسمان لەو پرسە کردووە، درەنگ بێت یان زوو باش ئەبێت!'

'دەستمان کردەوە بە قسەی بێسوود، کاتێک شۆڕشگێڕێک بێهیوا دەبێت... دەبێت هیواکانمان بە قەدەر بسپێرین؟!'

'شاعیر، شۆڕشگێڕ، پڕم لە هیوا، بەڵام... کاتێک جەنگاوەرەکان لە جەنگەکاندا بە جەستە و ڕۆح تێک دەشکێن، ئیتر دەبێت چاوەڕوانی چییان لێ بکرێت؟!'

لەناو ئازار ئاگام لە قسەکانی سوبحی نەمابوو. هێشتا لەسەر قەنەفەکە پاڵ کەوتبووم و نەمتوانی لە جێگەی خۆم بجووڵێم، سوبحی بە دیارمەوە بوو. ویستی یارمەتیم بدات و لەسەر قەنەفەکە دابنیشم، بەڵام هەرچەند هەوڵی دەدا نەیدەتوانی، تاوەکوو گەیشتە ئەوەی ئازاری دام و لێی تووڕە بووم، ئەو بێدەنگ لێم دوور کەوتەوە، هەستم دەکرد پەشیمان بووم، پاشان پێم گوت: 'نازانم، چەند سەعات نووستم، بەڵام لە سجن بووم و هەموو ئازای گیانم بە گوللە کون کون بوو!'

'ئەمە لە خەونتدا؟'

'بەڵێ!'

'ئەوە تۆ گەلێک جار ئەو خەونەت بۆ گێڕاومەتەوە، یانی تۆ هەموو جارێک هەمان خەون دەبینیت؟!'

'بەڵێ، ســـــوبحی هەموو جــارێـک هەمــان خەون ئەبینم، ئەوە جەنابیشت بە ملی شکاوت ئەو پرسیارەت سەد جار لێ کردووم!'

'ئێ، چووزانم... دەڵێم نەوەک درۆم لەگەڵ بکەیت!'

'سجن و خوێن، سوبحی لە خەونەکانمدا خوێنم لێ نایەت.'

'لە کتێبێکدا ئەوەم خوێندووەتەوە، کە خوێن دەبێتە تۆوی ئازادی! تۆ لە خەونەکانتدا خوێنت لێ نایەت، کە واتە جەلال تۆ ئازادی بە چاوی خۆت نابینیت.'

'کامە کتێب بوو؟ ئەو کتێبە تەورات، ئینجیل یان قورئان بوو، هەر لەو کتێبانەدا پاداشتی خوێنڕشتن حازرە، بکوژیت و بتکوژن پاداشتی خۆت وەرئەگریت. ئازادی لای من مافێکی سروشتیی مرۆڤەکانە. ئەو خەونەی من تەنیا ترسە، ئەویش لە کاتێکدایە کە بێهیوا ئەبم!'

'لە یاسا و ڕێساکانی سروشتدا هەردەم یەک و یەک ناکاتە دوو!'

'بۆچی؟ چونکە مرۆڤ خۆی بە یاسا و ڕێساکانی سروشت ڕازی نەبووە، یان...'

'مردن لەو پێناوەدا، مەبەستم... نازانم مردن لەپێناوی چیدا؟!'

'تێ ناگەم سوبحی، ئازاری جەستەم خەیاڵی شێواندووم!'

'منیش، وەڵامێکی ڕوونم بۆ ئەو هاوکێشـــــەیە پێ نییە، بەڵام ئیتر خۆی ئەوەیە ڕاستییەکان... چونکە مام زامن وای گوت!'

'دەی بۆ ڕازیکردنی دڵی خۆمان با قســـــەکەی مام زامن بێت، کە واتە... ئەوەیە ڕاستییەکان.'

'دەزانیت جەلال، حەزم دەکرد، بۆ یەک ڕۆژ یان تەنیا بۆ ســـاتێکی زۆر کورتیش بووایە لە ناو پێستی تۆدا بوومایە!'

'سوبحی، من و تۆ پێویستمان بە پشووە، پێم بڵێ، ئەوە بۆ چەند ساڵ ئەچێت، من و تۆ یەکتری ئەبینین و پێکەوە قسە ئەکەین.'

'ئی، تەمەنێکە! من منداڵ بووم.'

'بێ ئەوەی من بزانم تۆ جنۆکەی یـان چ جـانەوەرێکیـت! وەک جەمالی برام، کە بە قسـەی ئەوان ئەڵێن لە تەمەنی سـێ سـاڵییەوە مردووە، بەڵام ئێسـتاش لەوە زۆر دوودڵم، تۆ جەمالیت؟ چونکە لە دوای مردنی ئەوەوە لێم پەیدا بوویت!'

'هـاوڕێین، هـاوڕێی تـەمـەن جەلال گیـان، ئێ کـاکە تۆ من لە خەیاڵەکانتدا دەر کە، ئیتر منیش نایەمەوە بەرچاوت. تازە من و تۆ تـاوەکوو بنەگوێمـان لە لیتـاوی ڕابردووی یەکتردا چەقیوین، بۆ تۆ ئەوەت نەزانیوە؛ من مـام زامنم، عەزیزی براتم، هەنـدێک جـاریش مالیکم و جەمالم، زۆر جار ویسـتوومە خۆم بگۆڕم بە بەهاری غالب عەربەتی، بەڵام نەمویسـتووە ئەو برینەت بکولێنمەوە و خـاترم گرتوویت.'

'دەی جەناب، خۆتم لێ مەکە بە خێری زینە!'

'بەڵێ من خێری زینەم!'

'دەی ئەگەر ڕاسـت ئەکەیت، بمبەرەوە، تکات لێ ئەکەم بۆ مالی میرزام بەرەوە.'

'بۆچی؟ بۆ مردن؟!'

'سـوبحی، لەوە ئەچێت باوەڕم پێ نەکەیت، بەڵام من دوو چاوم بەر پێی ئێسـتام نابینێت و بە خەون و خەیاڵ بەردەوام لەوێ ئەژیم، ئیتر پێویسـت بە خۆ هەڵخەڵەتاندن ناکات. لەو سـاتەوەی لەوێ ڕۆیشـتووم هەموو سـاتێک بە خەیاڵ لەو مێژووەی ئەوێمدام، زۆر گرانە، بەڵام بە قەدەر جەستەی تێکشکاوم ئازاربەخش نییە!'

'کە واتە قسەکەم ڕاست دەرچوو، خۆ من لە خۆمەوە قسە ناکەم، سەگ لە قەسابخانە نەمرێت، عومری بە فیڕۆ چووە؟!'

'بەڵێ، تێ گەیشتم.'

'بەبیرتە، یەکەم جار مام زامن منی بەرەو ڕووی تۆ کردەوە، لێت ترسام، وامزانی تۆش وەک ئەوانی تریت، سوپاسگوزارم کە وەکوو هاوڕێ قبووڵت کردم، لەکاتێکدا لەسەر عەیب و عارەکانم بە درێژایی تەمەنم خۆم لەوانی تر شاردۆتەوە!'

'ئەوە چەند جارم پێ گوتیت، مەڵێ عەیب و عار. ڕووی ئەوە ڕەش بێت یەکەم جار ئەوەی بەکار هێنا، ئەوە کاری سروشتە و تۆ لەم جیهانەدا یەکەم کەس نیت!'

'بەهاریش، ڕێزی ئەگرتم و خۆشی ئەویستم، من و ئەو دەستە خوشک بووین.'

'نێرەمووک، ئیتر بۆچی گلەیی لە بەختی خۆت ئەکەیت، ئەوە نییە من و بەهار خۆشمان ویستوویت؟! هەروەها تۆ تاقە منداڵی مام زامن بوویت.'

'دەی جەنابت بۆ ناحەقم ئەگریت، کە دوای مردنی مام زامن و بەهار، بەردەوام بەدوای تۆوە بووم؟!'

'لە قسوورم عافووم بکە. قەت ئەوەم لە بیر ناچێتەوە، کە منداڵ بوویت لە ترسی خەڵک، لە کونی زێرابەکەی سەرشەقام خۆت شاردبووەوە، ئەگەر لەگەڵ مالیک نەماندۆزیبیتایەتەوە بەنیاز نەبوویت چاوت بە ڕووناکی بکەویتەوە!'

'باش بە بیرم دێت، تۆ خۆت ئەو ڕۆژانە و کە هێشتا منداڵ بووین، ئەوەت پێ گوتم، کە من و تۆ دوو مرۆڤی شۆڕشگێڕین، تێ ئەکۆشین، تا مافی ئەو هەزاران گیانبازە بدەینەوە، کە لەپێناویدا مردوون. بە تایبەتی کەسوکارم، من هەردەم لەو پێناوەدا ژیاوم!'

'ئێ، زۆرینە لەپێناوی چیدا مردوون؟'

'مەبەستت چییە؟ قیامەت!'

'بەڵێ، قیامەت یان ژیان و ئازادی! کامیان؟'

'کە واتە، خۆی ئەوەیە ڕاستییەکان!'

'ئەبێت ئەو خەڵکە سەرلەنوێ لەدایک ببنەوە!'

'تۆش قســـەکانی مام زامن ئەڵێیتەوە... تا پێش مردنیان لە نیازی دڵیان ئاگاداریان بکەینەوە! '

'ئەو ڕاستییە بە زیندووەکان بگوترێت باشتر نییە؟'

'کام ڕاستی؟'

دوای ئەمە چاوم نووقاند و بێدەنگ بووم، گوێم لە خشـەی پێکانی بوو بە ژوورەکە دا دەگەڕا و لـەبـەر خۆیەوە گوتی: 'جەلال تۆ مەبەســتت لە ژیاندۆســتی و مەرگدۆســتییە؟ ئێ، ئەزانم... ئەبێت لەو دووانە یەکێکیان هەڵبژێریت، ئەگەر نا لە نێوان بەهەشت و جەهەننەمدا گیر ئەخۆیت!'

پشتم ئازاری هەبوو، سمتم سڕ بووبوو، هەناسەم لە نێو سینگمدا پەنگی خواردبوو، لە ســـوبحیم ڕوانی و لە بێزاریمدا گوتم: 'ئیتر چی بکەین ئەوەش قسمەت و نسیبی ئێمەیە!'

'چییە جەلال، ئەوە یەکەم جارە تۆ باســـی قســـمەت و نەســـیب بکەیت؟! خۆزگە مام زامن لە کونێکەوە چاوی لێت ئەبوو.'

'دەی مەگەر هەموومان مردنێک قەرزدار نەبین؟! ئەوەش قســـەی مام زامن بوو.'

'نەخێر، تۆ ئەو لاژە لاژەت لە ترسی مردنە؟!'

'بەڵێ، مەگەر منیش مرۆڤ نەبم.'

'باوەڕ ناکەم، تۆ لە مردن بترســـیت، جەلال تۆ نابێت خەیاڵت لای مردن بێت؟!'

'بۆچی، خۆ خراپ نییە ئەگەر قسەی ئەو خەیاڵپڵاوانە ڕاست بێت!'

'خۆ ئەگەر تۆ بە نیازی ئەوەیت و باوەڕت پێ هێناوە، ئەوا منیشت لە کۆڵ دەبمەوە!'

'ئینجا هەر تۆ، وا بزانم زۆربەی ئەوانەی خۆشم ئەوێن ئیتر نایانبینمەوە.'

'وەک مام زامن ئەیگوت، پشت ئەکەیتە سروشتی خۆت و بۆ هەتاهەتایە کۆتاییت پێ دێت.'

'پشت لە سروشتی خۆم ناکەم، بەڵکوو پشت لەو هەموو ئازار و مەینەتییە ئەکەم، کە بەردەوام بە کۆڵمەوەن و خەیاڵیان داگیر کردووم.'

'ئێ، ئێ!'

'بە نیازی ڕۆیشتنەوەم، دوای حەڤدە ساڵ دووری، چەند ڕۆژێکی تر لە کوردستانم.'

'بۆ مردن؟!'

'ئیتر ئەوە چارەنووسی منە!'

## ٢٠

وەکوو گیاندارێکی دڕندە پەلاماری یەکتریان دابوو.

ویستی لێیان نەڕوانێت و خێرا لەو جێگەیە دوور بکەوێتەوە. گۆچانەکەی دەستی زووزوو وەپێش خۆی دەهاویشت و قاچی چەپی بە دوای قاچی ڕاستیدا کێش دەکرد. ئێسقانەکانی جەستەی، کە لە بڕبڕەی پشتی و حەوزیدا بە پلاتین و برغوو پێکەوە بەند بوون، بەرگەی ئەو ترس و زۆرلەخۆکردنەیان نەدەگرت. ناو شانی ئازاری دەهات. پشتی تێ کردبوون، کاتێک گوێی لە دەنگی گوللەکان بوو. ئازارێک لەسەر دڵییەوە هات و ئەوەندەی تر قاچەکانی لە کار خستن. خۆی کرد بەو ئەپارتمانەدا، کە ڕۆژانە ئیشی لێ دەکرد.

جەستەی تێکشکاوی بە دوای خۆیدا کێش کرد و بە قادرمەکاندا چووە نهۆمی دووەم. هەستی دەکرد گوللەکان بەر پشتی کەوتوون و بریندارە و خوێن لە جەستەی دەڕوات.

بە ڕێکەوت ئەو شوێنەی تاکسییەکەی ئەو لێی ڕاوەستا، لەسەر ئەو شۆستەیە و لە پێش چاوی ئەودا زیاتر لە دە گەنج بە کۆڵەمست و چەقۆ و دار بەر بووبوونە گیانی یەکتری، جنێویان بە پیرۆزییەکانی یەکتری دەدا. هەندێکیان ملپێچ و ئاڵای زەرد و ئەوانی تر بە ڕەنگی سەوز خۆیان داپۆشیبوو. جنێوەکانیان چەقۆکێش و شەلاتییەکانی سەردەمی لاوێتیی لە شاری سلێمانی بیر دەهێنایەوە، کاتێک یەکێکیان بە دەنگی بەرز هاواری دەکرد: 'منداڵی نێو بێشکەتان ئەگێم!'

جنێوێک، که چل ساڵ بوو خەیاڵیان داگیر کردبوو... وەکوو وردە زیخ لە دەمارەکانی ڕۆحی چەقی بوون و خوێنی لێ دەچۆڕا. لە ژێر لێوەوە و بە دەنگێکی تێکشکاوەوە گوتی: 'چ نەخۆشییەکی کوشندەیە ئەو ڕقە!'

گەیشتبووە ژوورەکەی و لە خۆیی ڕوانی و دەستی بە پشت و ڕانیدا گێڕان. دوای چەند هەناسەیەک، هەستی کرد ئازاری نێو سینگی هەناسەی لێ دەبڕن. دیسان برینە کۆنەکانی سەر هەردوو ئەژنۆی خوراند. دەنگی گوللەکان بەردەوام لە گوێیدا دووبارە دەبوونەوە. ئازاری زۆری بۆ هێنا و دواقسەی دکتۆرەکەی بیر کەوتەوە، ساڵێک پێش ئەو ڕۆژە لە ئەمریکا پێی گوتبوو: 'دڵت بە بەرییەوە نەماوە و چەند مانگێکت لە ژیاندا ماوە.'

پاشان خێرا هەندێک دیمەنی پچڕ پچڕی چەند یادەوەری، کە هێشتا خۆی ساغ نەکردبووەوە ئاخۆ دەرگەی خەیاڵی لەسەر کامیان بکاتەوە. نەیدەزانی لە ژیانیدا چی کاریگەریی دروست یان نادروستی بەجێ هێشتووە، دیمەنێکی سەردەمی منداڵی وەک فیلمێک لە پێش چاوی نمایش دەکرا، ماڵە کۆنەکەیان و قەرەباڵخیی سەر سفرەی نانخواردن. ئەوەی لەو خەیاڵەی دایدەبڕی دەنگی گوللەکان و بینینی ڕەنگی خوێن بوو. لە ژێر لێوەوە گوتی: 'تەنیا مردن کۆتایی بە یادەوەرییەکانم ئەهێنێت!'

دوای ئەوەی لە ئەمریکا گەڕابووەوە، ئاسەواری ماڵە کۆنەکەیانی لە گەڕەکی سەرشەقام بە سەر کردەوە، بە ناویدا گەڕا، وەکوو بڵێی لە پارچە بەجێماوەکانی یادەوەریی سەردەمی منداڵی بگەڕێت. یان وەک خۆی دەیگوت؛ شتێکم لەو ماڵەدا ون کرد، تا ئەمڕۆ لە خۆمدا بە دوایدا دەگەڕێم و نازانم چییە!

ئەوانەی لە ژیاندا مابوون هەندێکیانی بینیبووەوە، لەگەڵ چەند هاوڕێیەکیدا باســـی دۆڕان و پەشـــیمانییان کردبوو، تەنانەت بەرەو ڕووی کەســـە چاک و خراپەکانیش بووبووەوە، قەرزی کۆنی لەگەڵدا پاک کردبوونەوە، لەگەڵ هەندێکدا بە شـەڕ هاتبوو، بەرامبەر ئەوانەی هاوڕای بووبوون و ئافەرینیان کردبوو خۆی بە دڵشـــکاو زانیبوو. لە یەکەم ڕۆژی گەڕانەوەیەوە خۆی بە تەنیا و غەریب دەزانی... کاتێک ئاســـەواری خۆپەرستـی بە ڕۆحی هەموو هاوڕێکانییەوە هەست پێ دەکات، هیچ وەڵامێکی پێ نەبوو، تەنیا ئەوەندە نەبێت... کە لە بەر خۆیەوە ئەوەی پێ گوتبوون: 'قوڕبەســـەر ئەم میللەتەی پاڵەوانی تێدا هەڵناکەوێت.'

لە ســـلێمانی کوڕی شـیعرخوێندنەوەیان بۆ ڕێک خسـتبوو، کە خۆی نەیتوانیبوو شـــیعرەکانی بە دەنگی خۆی بخوێنێتەوە، هەروەها لە شێوازی خوێندنەوەی شیعرەکانی ڕازی نەبووبوو.

ئەوەی سـوکنایی بە دڵی ئەو بەخشـی بوو، بینینەوەی غەفوور و قادری برای بوو، هەروەها مالیک، کە لە پێش چاویدا هەر منداڵە دڵپاک و چاونەترسـەکەی جاران بوو. لەگەڵ قادر و مالیکدا شـەوێک تاوەکوو بەیانی عارەقیان خواربووەوە و پێکەنیبوون. ڕۆژی دواتر لە دووکانەکەی مالیک بە یادی جارانەوە، کۆلا و بسـکیتی شـوکلامەیان خواردبوو. پاشـان پێکەوە بۆ گەڕەکی سـەرشـەقام چووبوون، کاتێک دەبینێت ماڵە کۆنەکەیان ڕووخاوە، دڵی تەنگ دەبێت. بێجگە لەوە، شاری سلێمانی لە پێش چاوی ئەودا بووبووە وێرانە.

هەولێر، سەعات یازدەی سەر لە بەیانی سیازدەی مانگی یەکی ساڵی ١٩٩٣ بوو، نووسینگەی ڕادیۆی حکومەتی هەرێم.

شەوی پێشوو نەچووبووە نێو جێگە، ڕەنگزەرد و پێڵووی سوور هەڵگەڕابوون. بێخەوی و گرنگینەدان بە نانخواردن بێهێزی کردبوو، بێجگە لە کاریگەریی ویسکیخواردنەوە، هەروەها بەردەوام جگەرەی دەکێشا.

لەسەر پارچە کاغەزێک نووسیبووی: 'من بۆ ئاینده و دوای مردنم شیعرم نەنووسیوە. هەردەم بۆ ئەو ڕۆژگارەی تێیدا ژیاوم نووسیومە و لەپێناوی گۆڕانکارییەکانی کاتی خۆیدا. ئەگەر من ئەو ڕۆژانە نەمتوانیبێت شتێک بە کردار یان بە شیعرەکانم بۆ خەڵکی خۆم بەدیی بهێنم، ئەوا پرۆسەی نووسین لای من کارێکی بێهوودە و بێئەنجام بووە و ئێستا لێی پەشیمانم.'

دەستی چەپی توند بە لێواری مێزەکەیەوە گرتبوو. کاغەزەکەی هەڵگێڕابووەوە، لە سەرەوە بە خەتێکی گەورە نووسیی: 'بۆ کەسوکارم...'

دوای ئەمە خۆی بە پێوە بۆ ڕاگیرنەکرا و قاچی دەلەرزی. دەستی بە سینگیەوە گرتبوو، لە خەیاڵیدا تەنیا دیمەنی خوێن و دەنگی گوللە بوو. دەمی داچڕیبوو، لە ساپیتەکەی دەڕوانی، هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و دەنگێکی لێوە هات، کە زیاتر لە قرووسکەی سەگێک دەچوو وەک لە هاوار یان نووزەی مرۆڤێک، وەک بڵێی لە بێئاگاییی خۆی بووبێت، چاوی نووقاندبوو. لەسەر کورسییەکەی دانیشتبوو. شانەکانی دەهێنانەوە یەک و ئەژنۆکانی کۆ دەکردنەوە. ترسێک دەمارەکانی دڵی سست کردبوو، هەستی دەکرد ئێستاش لە ناو

سندووقە چاپییەکەدایە و لە هەر ساتێکدا پۆلیسەکان دێنە سەری. هێشتا نوزە و گریانی مالیک لە گوێکانیدا دەزرنگانەوە.

'ئەگەر مردن کۆتاییی ئازاری ئەو یادەوەرییانەت بێت! با بێت، جەلال با بێت.'

دوای ئەوەی مام زامن ئەمەی گوت، لە تەنیشتییەوە ڕاوەستا، ئەویش سەری دانەواند و چاوی هەڵبڕی، وەکوو بڵێی چاوەڕوانی کردبێت. لێی نەڕوانی، مام زامن دەستی برد و خستییە سەر سینگی و لە ژێر لێوەوە پێی گوت: 'ئەگەر مردنت وەکوو خۆی قبووڵ بێت، هەست بە ئازاری جەستەت ناکەیت.'

'مام زامن، ئیشم زۆر ماون!'

'بۆ ئەوانی تری بەجێ بهێڵە.'

'بۆ کێ؟ ئەی کۆکردنەوەی شیعرەکانم؟'

'گرنگ تۆ لە ڕۆژ و ساتی خۆیدا ئەو شیعرانەت نووسیوە. ئەوەندە بێهیوا مەبە، خۆ سەری دونیا بە پووش نەگیراوە. هەر ئەمڕۆ دەیان منداڵ لەو هەرێمەی لەمەڕ ئێمە لە دایک بوون! بۆ ئەوانی بەجێ بهێڵە.'

'بەڵام...'

'بەڵام چی؟ کاتت هاتووە و ئیتر خۆت مەخەڵەتێنە!'

دەرگەی ژوورەکەی کرایەوە، جەلال ڕاچڵەکی. بەڵام مام زامن لە شوێنی خۆی نەجووڵا و ئاوڕی نەدایەوە، وەکوو بڵێی بزانێت کێیە و چاوەڕوانی کردبن. ڕەحیم موکریانی و سوبحی فەیلی بوون، ڕەحیم لە ناو دەرگەکەوە هەردوو دەستی هەڵبڕین و هاواری کرد: 'وات زانی هەتا دوور بڕۆیت، ئێمە و یادەوەرییەکانت لە بیر دەچێتەوە؟'

'تۆ لێرە ڕۆیشتیت، وات زانی ڕزگارت بوو، بەڵام هەرگیز نەتتوانی یادەوەرییەکانی ئێرەت لە ناو خەیاڵەکانتدا بسڕیتەوە!'

سـوبحی وای گوت و چوو کورسـییەکەی ڕاکێشـایە دواوە و لە بەردەمیدا ڕاوەسـتا و سـەری ڕاوەشـاند و گوتی: 'تۆ، بە هەموو تەمەنت لە هەموو شتێک ترساویت...'

ڕەحیم قسەکەی پێ بڕی:

"ئەتۆ لە هەموو شتێ ترساوی
تەنیایی و بوغزاندن
پەردە دادراوەکان و تەمومژ و چاڵی ڕەش
مێشکی خۆت... شیعرەکانت
خەیاڵی کاڵ و کرچ
ژنان، وەفا و ئێرەییان
قسەی خوازراو و دەنگەدەنگی مینبەرەکان
چاوچڵێس، خۆفرۆش، بەرژەوەندیخواز
پیاوی ترساو بە هەڕەشەی دۆزەخ، خەون و جنۆکە
ئەتۆ لە هەموو شتە نەزانراوەکان، دەترسای
لە هەموو شتێ دەترسای
قەرەباڵغی و جیڕەی دەرگە
پێکەنینی ناوەخت و قسەی دووبارە
نیشتمان، لە خۆت. بەڵێ، لە بیرکردنەوەکانی خۆت!"

مام زامن دەستی خستە سەر شانی ڕەحیم و قسەکانی پێ بڕی، کە ئەو زیاتر وەکوو شیعر دەیخوێند: 'بەسە، ئەوەندە بەسە. ڕەحیمە شێت، هەموومان ئەوەمان ئەزانی لە زۆر شت ئەترسا، بەڵام...'

سوبحی هەڵیدایە و گوتی:

"بەڵێ، لە هەموو شتێک ئەترسایت
سزا، درۆ، پەشیمانی. دۆڕان
لەدەستدانی عەشق
بێدەنگیی مالیک و گریانی، توورەبوونی، خەم و بێزاری
چەقۆکێش و منداڵباز، شەقاوە و شەلاتییەکانی شار
لە هەموو شتێک، واتاکان لە دەرەوەی زمان
خۆت بە دڵشکاو زانی
کامێراکەتیان شکاند
بووزیان پێوە کردیت
خۆت بە دڵشکاو زانی
کاتێک لە لات ئاشکرا بوو خودا بوونی نییە!"
'بەلام... بۆ سەندنی مافی ئەوان ترست بە هیچ نەبوو.'
هەرسێکیان ئەوەیان پێکەوە و بە کۆرس گوت.

لەو کاتەدا باڵی بە سەر مێزەکەیدا بڵاو کردبووەوە و سەری لەسەر چەند پارچە کاغەزێک دانابوو، ئاگای لە خۆی نەمابوو. وەکوو بڵێی کاریگەریی ئەو قسانە بێهۆشیان کردبێت، یان ئەو دەستەی مام زامن خستییە سەر سینگی، خەوی لێ خستبێت.

دوای ئەمە بە تەنیا بەجێیان هێشت.

ڕۆژی دواتر لە خەستەخانەی کۆماری لە ژوورێکدا کەوتبوو، هێشتا ڕەنگی خوێن و دەنگی گوللەکان خەیاڵیان بەر نەدابوو، تەنیا ئەوەندە نەبێت جارێک بیری نووسینی وەسیەتنامە تەواونەکراوەکەی کەوتەوە، دوای سەعاتێک چاوی بۆ مام زامن گێڕا، ڕۆژی پێشوو کاتێک گەیاندبوویانە ئەو نەخۆشخانەیە و دوای دوو سەعات هۆشی

هاتبووەوە سەر خۆی، پرسیاری مام زامن و ڕەحیم و سوبحیی کردبوو، پاشان ئەوانی لە بیر چووبووەوە.

کاتێک ئاسۆ، کوڕی عەزیزی برای، هات بۆ لای، پێش هەموو شتێک پێی گوت: 'برسیمە و شۆربای نیسک و شفتەم بۆ بێنە.' چونکە غەریبیی تام و بۆنی ئەو خواردنانەی حەلاوەخانی دایکی دەکرد.

ئاسۆ خێرا بەجێی دەهێڵێت، لە دواوە لێی دەڕوانێت و چاوی پڕ دەبێت لە فرمێسک، عەزیزی برای دەهێنێتەوە یاد... هەروەها هەستی دەکرد ئاسۆ زۆر لە میرزا کەریمی باوکی دەچێت.

لە ژێر لێوەوە چەند جارێک ناوی هێنان، باوک و دایکی، عەزیزی برای و شێرکۆی برازای. غەفوور و قادری برای. یەکیەک ناوی منداڵی برا و خوشکەکانی لە ژێر لێوەوە گوتەوە.

میرزا کەریم و حەلاوەخان پێکەوە، کوڕێکی قژکاڵی سێ ساڵانیان لە نێواندا بوو، جەلال لێی ڕوانی و لە ژێر لێوەوە گوتی: 'جەمال.'

جەمال وەک مالیک بە دەستی ئاماژەی بەوە کرد: 'تۆ ئەو هەموو ساڵە لە کوێ بوویت؟'

عەزیزی برای دەستی شێرکۆی حەوت ساڵانی گرتبوو، دیمەنێک، کە بۆ دواجار کاتی خۆی و پێش چوونی بۆ ئەمریکا بینیبووی، پاشان مامەکانی؛ مام مستەفا و حاجی عەبدوڵڵا، دوا بە دوای یەک هاتنە ژوورەوە. کەسیان هیچیان نەگوت، تەنیا بێدەنگ لە یەکتریان دەڕوانی. مام زامن بە دوایاندا هاتە ژوورەوە و ئەو بێدەنگییەی شکاند و گوتی: 'تۆ پێویستیت بە دۆعای خێری کەس نییە، هەستە با بگەڕێینەوە بۆ ئەوێ. تۆ ئەبێت لەوێ بمریت، تاوەکوو ڕۆحییانەتت لەوێ بێت! چونکە تۆ بۆ ئەوان پێویستیت.'

حەلاوەخان لێی ڕوانی و پێی گوت: 'با بە دەردی منت لێ بە سەر نەیەت، ساڵانێکە بە تەنیا و دوور لە ئێوە لەو غەریبییەم.'

بە دەنگێکی گڕ و تێکشکاوەوە، زۆر لەسەرخۆ، کە لەو کاتەدا لە باوک و دایکی دەڕوانی: 'ناگەڕێمەوە بۆ ئەوێ و سێ ساڵ پێش ئەمڕۆ ئەو بڕیارەم بە خۆم داوە، لەوێ دڵم شکا و خۆشەویستەکەمیان لێ ون کردم. ئەوێ شارێکە جادوو لە هەموومان ئەکات، خوێنی منداڵەکانی ئەکاتە کاسەوە، منداڵی و لاوێتیت لێ زەوت ئەکات. بەڵام هەندێک جاریش بەخشندەیە؛ چونکە فێرمان ئەکات جیاوازی لە نێوان هەژار و دەوڵەمەند یان بەخشندە و بەرژەوەندیخوازێکدا نەکەین، بە مەرجێک هەموو خەڵکی ئەو شارە بین!'

هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و لە تەنیشتیەوە و لەسەر جێگەکەی، لە دەستی دایکی گەڕا، لە باوکی و پاشان عەزیزی برای ڕوانی و سەرنجی لەسەر چاوی مام زامن ڕاگرت و چاوی داخست، لە ژێر لێوەوە دواوشەی: 'بەڵام...'

**کتێبە چاپکراوەکانی نووسەر (میران ئەبراهام)**

| | | |
|---|---|---|
| شەوگەڕەکان | ڕۆمان | ٢٠١٥ |
| نیشتمانی سارا | ڕۆمان | ٢٠١٩ |
| خەمی مەستوورە | ڕۆمان | ٢٠٢٠ |
| ڕۆژی ڕەشنووس | کۆمەڵەچیرۆک | ٢٠٢٢ |
| خانەقای میرزا | ڕۆمان | ٢٠٢٣ |

بەڵام... ئەو هەموومانی بۆ ژیاندۆستی پەروەردە کرد، لە ڕۆژانێکدا مەرگدۆستی باڵی ڕەشی بەسەر ڕۆحی هەموو خەڵکی ئەو شارەدا کێشابوو. بە جۆرێک ترس لە مردن توانای هەستی لاواز کردبووین. وەکوو گیاندارێکی زەلیل و دڵشکاو، بێ ڕۆح، ژێردەستە و کۆیلە ژیانمان بەڕێ دەکرد. فێری کردین کە خۆبەدەستەوەدان هەڵبژاردەی خۆمانە، بەڵام هیوا و ئامانج نییە.

بەو جۆرەش ئەوێ، بەردەوام غەریبەکان ڕوویان تێ دەکرد، لە فولکەی نۆبەچی ڕیزیان دەبەست، ژێر دارەکەی پیرمەسوور جێگەی حەوانەوەیان بوو. لە نیوەی شەودا لە دەرگەیان دەدا و دەیانگوت: ڕێگەی دوورمان بڕیوە و بۆ ئەم ماڵی خۆزگەیە هاتووین. وەکوو تەنیا ماڵ بێت لەو دەشتی زاموایەدا.




Miran Abraham

**Monastery of the Scholar**

Roman




٨٠٠٠ دینار